# بەرەو دونیاکەمان





کاتێک
پەیکەری ڕۆحمان
بنیات دەنێین

٢

محمد فەتحوڵڵا گولەن

بەرەو دونیاکەمان

نووسینی: محمد فەتحوڵڵا گولەن

وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

چاپی یەکەم: ئازار - ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢١٣)ی

ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە

تیراژ: ٦٠٠٠

شوێنی چاپ

Neşe

Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY

30 83 886 212 +90

www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر

+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان

## پێشەکی

سەرانسەری جیهانی موسڵمانان بەدرێژایی ئەم سێ چوار سەدەیەی ڕابردوو لە بازنەی داخراوی دیلێتی و، ژێردەستەیی و، نەزانی و، هەژاری و، دووبەرەکی و، دوژمنایەتی و، دواکەوتوویی و، کۆنەپەرستی و، چەقبەستووییدا گینگڵ دەخوات. لەبری ئەو ئامانجە باڵایانەی کە قورئان بۆ موسڵمانانی دارشتووە -وەك: ئاوەدانکردنەوەی زەوی و، ڕێنموونیکردنی خەڵکی بۆ چاکە و ورياكردنەوەيان لە خراپە و، گرنگیدان بە یاسا سروشتییەکان بەئەندازەی گوێرایەڵیکردن بۆ فەرمانە شەرعییەکان و، ڕوانینی گشتگیر بۆ بەدیهێنەر و گەردوون و ژیان و مرۆڤ و دانەبڕینیان لەیەکتری و، بڵاوکردنەوەی ئاشتی و ئاسایش لەسەر ڕووی زەویدا و، پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی و، ڕێزگرتن لە بەها مرۆیی و گەردوونییەکان و، گرنگیدان بە بیروباوەڕ و بیرکردنەوەی ئازاد و، هاندانی زانست و زانستخوازان و، خۆشویستنی نیشتمان...- ئێستا لە کەمەندی بەرژەوەندیخوازی و هەلپەرستیدا گیریخواردووە و، بووە بە داوی هەوا و ئارەزووەکانەوە و، تەڵەی چێژی پاڵدانەوە، حەزی

کارکردن و هەوڵدانی ئەویان پێوەکردووە و، زنجیری دواکەوتوویی و چاولێکەریی مەیلی تازەگەری و نوێبوونەوەیان لەودا یەخسیرکردووە و، پشتکردنیش لە ڕابردووی خۆی و پاڵنەرە مێژووییەکانی، بوون بە هۆکاری ئەوەی یەك لەسەر یەك زللەی تەمێکردن بخوات.

گرنگترین هۆکارەکانی ئەم دواکەوتنە -سەرەڕای ئەوانەی کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێدرا- بریتین لە نەمانی ئامانجێکی باڵا لەسەر ئاستی ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتیی موسڵمانان. لەحاڵێکدا موسڵمانانی پێشین خولیای مەزن و خەونی تاقانەیان بریتیبوو لە گەیاندنی حەقیقەتی ئیسلام بە دڵە تینووەکانی هەر چوار لای زەوی و، ناساندنی ناوازەترین کەسایەتیی مێژوو -کە پێغەمبەرەکەیانە- بە نەتەوە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتی و، بانگهێشت کردنیان بۆ ڕێگای ڕزگاری. هەر بۆیە ڕوویان لە هەر جێگایەك دەکرد، خەڵکی پێشوازییان لێدەکردن و بە حەسرەتەوە باوەشیان بۆ دەکردنەوە. هۆکاری دووەمیش بریتییە لە پارچەپارچەکردنی حەقیقەتێك لە لایەن موسڵمانانەوە کە شایانی پارچەپارچەبوون نییە. بەڵێ، بەپێچەوانەی موسڵمانە یەکەمینەکان، موسڵمانانی سەردەم نەیانتوانی پارێزگاری لە یەکپارچەیی حەقیقەت بکەن و، سەرکەوتوو نەبوون لە سازکردنی هاوسەنگی لەنێوان ڕووە جیاوازەکانی ئەم حەقیقەتەدا کە بریتین لە بەدیهێنەر و، گەردوون و، ژیان و، مرۆڤ. لەئەنجامدا قورئان کە گوفتاری خوایە دابڕێنرا لە گەردوون کە کرداری خوایە. موسڵمان کەوتە شیوێك و قورئانیش کەوتە دانەیەکی تر. ئەو یاسا سروشتییانەی کە بەدیهێنەر لە گەردوون و، ژیانی کۆمەڵایەتی و، مێژووی نەتەوەکاندا دایمەزراندوون و، چەندین دانایی مەزنیان لەسەر بنیاتنراوە، موسڵمانان

بە نەبوو لەقەڵەمیان دان، یاخود بە لایەنی کەمەوە بێناگا لێیان ژیانیان بەسەربرد.

بەڵێ، بێگومان هەر ئەم هۆکارانە و هاوشێوەکانیان بوون کە ئەم جیهانە پیرۆزەیان بەم ڕۆژە گەیاند. ئەم جیهانەی کە سەردەمانێك لە سایەی ئایینە دەوڵەمەندەکەی و، پێغەمبەرە میهرەبانەکەی و، کلتوورە فراوانەکەی و، زانایان و ڕۆشنبیرانی ناوی، نمونەی باڵای شارستانێتی و، پێشکەوتن و، بەها مرۆییەکان و، ژینگەیەکی ناوازە بوو بۆ پێکەوەژیانی چەندەها نەتەوە و ئایینی جیاواز.

وەك وەڵامێك لە بەرامبەر ئەم گۆڕانە نەخوازراو و ئەم دۆڕانە یەك لەسەر یەکانە، بەگشتی دوو جۆر پەرچەکردار نوێنران. دەستەیەك ڕۆژئاوایان بە سەرچاوەی هەموو خراپکارییەکان دانا و، سەرجەم تاوانەکانیان لە ئەستۆی ئەو نا و، لە ئەنجامیشدا پشتیان لە هەموو ئەو شتانە کرد کە مۆرکێکی ئەویان پێوەبێت و، کەوتنە باوەشی دەمارگیرییەکی واوە کە زانست و زانیاریی و تەکنەلۆجیایان بە خراپە وەسف کرد و، لە تۆڵەی ئەم بڕیارە هەڵەیەشیاندا شەپۆلی سروشتی ژیان لەگەڵ خۆی ڕایماڵین و ناویان لە مێژوودا سڕایەوە. دەستەی دووەمیان بەپێچەوانەوە، نکوولییان لە خۆیان و، ڕابردووی خۆیان و، ئایین و کلتوور و جیهانبینیی خۆیان کرد و، خۆیان داماڵی لە هەموو پێوەر و بەها خۆماڵییەکان و، ڕزگاربوونیان لە بەڕۆژئاواییبوون و، نامۆبوون و، لاساییکردنەوەی کوێرانەدا دیتەوە. ئەمانیش مێژوو کردنی بە پەندی زەمانە. چونکە هەم کەسایەتیی خۆیان دۆڕاند، هەم نەگەیشتن بە ئامانج و ناسنامەیەکی تریان چنگ نەکەوت. شارستانێتی و کلتوور

پۆشاکێکی سادە نییە لەبەری ئەم نەتەوە دابڕنرێت و بکرێتە بەری ئەو میللەت. شارستانێتی پێویستی بە ئازار و، ڕەنج و، کار و، شەونخونی و خەبات هەیە. لەئەنجامیشدا درەختی هەردوو تاقمەکە تەنها یەك میوەی هاوبەشی گرت: نائومێدی!

بەڵێ، نائومێدی کوشندەترین نەخۆشییە و دواین بەڵایە بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگای ئادەمیدا بێت. بەڵام خوای گەورە لە ئەزەلەوە بڕیاری داوە کە ئەم نوورە تا سەر بەردەوام دەبێت. تاریکستانی بێهیوایی هەرچەندەش دەیجوور بێت، ناتوانێت ڕووناکی درەخشان و پرشنگدار بشارێتەوە! هەربۆیە کەسانێك دەرکەوتن کە بە خۆیان و مەشخەڵی هیوا و چرای ئومێدی دەستیانەوە ڕێیان بۆ خەڵکی ڕۆشنکردەوە و، ورەیان خستەوە بەر ملی لار و ئەژنۆی ماندوویان.

خوێنەری بەڕێز! ئەم کتێبەی بەردەستت دانراوی مامۆستا "فەتحوڵڵا گولەن"ە و لە ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا لە گۆڤاری "هیوای نوێ"دا بڵاویکردوونەتەوە. شایانی باسە پێشتر و لەژێر ناوی "کاتێك پەیکەری ڕۆحمان بنیات دەنێین" بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەمان بڵاوکردەوە و ئەمەش بریتییە لە بەرگی دووهەم و کۆتایی ئەم زنجیرە وتارە. ئەم وتارانە هەرچەندە لە ماوەیەکی دووروودرێژدا نووسراون، بەڵام لەنێو خۆیاندا دارای سیستەمێکی یەکتر تەواوکەرن و، وەك زنجیرەباسێك وان کە وەسفکردنی دۆخی نالەباری ئێستای جیهانی موسڵمانان و، دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی دواکەوتنی و، بێدارکردنەوەی هیوا و ئومێدی چارەسەر و، پیشاندانی ڕێگاکانی سەربەرزی بە نەوەی نوێ، لەخۆدەگرن.

نووسەر لەم کتێبەدا چەشنی پزیشکێکی کارامە و لێهاتوو دەست دەخاتە سەر زامە کەسی و، خێزانی و کۆمەڵایەتی و، ماددی و مەعنەوییەکانمان و، جەخت لەسەر پێویستیی بەخۆداچوونەوە و ڕەخنەلەخۆگرتن دەکاتەوە و، بانگمان دەکات بۆ زیندووبوونەوەی دوای مەرگ و، زایەڵەی هیوا و ئومێد دەگەیەنێت بە ویژدانمان و، هەمان ئەو دینەمۆ و بنچینانەمان یاددەخاتەوە کە بەهۆیانەوە لەڕابردوودا توانیومانە نەك هەر سەربەرزانە بژین، بەڵکو مرۆڤایەتیش بحەسێنینەوە و زەوی بکەین بە گۆشەیەك لە گۆشەکانی بەهەشت.

دانەر بە وتاری "بەرەو سەڵتەنەتی دڵ" دەست پێدەکات و، پێمان دەڵێت کە لە مێژوودا چەندین شارستانێتیی جۆراوجۆر دەرکەوتوون و، هەنووکە دونیایەك و پێکهاتنێکی نوێ لە منداڵدانی ڕۆژگاردایە و چاوەڕێی وادەی زاین دەکات و، مژدەی سەوزبوونەوەی شارستانێتیی خۆمان پێدەدات کە "دڵ" تێیدا چەقە و هەموو شتێك لەدەوری ئەو دەخولێتەوە. پاشان لە "بەرەو شارستانێتیی خۆمان"دا ئاماژە بۆ نیشانەکانی ئەم شارستانێتییە دەکات و، باسی ئەو تایبەتمەندییانە دەکات کە لە ئیماندارانی پێشوودا هەبوون و، ئاماژە بەو دینەمۆیانە دەکات کە پێویستە میراتگرانی ئەمڕۆیش لە خۆیاندا بەدیبهێنن. ئنجا لە "ژیاندن.. وەك ئامانجی باڵا"دا وەکو وەستایەکی دەستڕەنگین سەرجەم ئەو کەلوپەل و پێداویستییانەمان بۆ ڕیزدەکات کە لە سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی پەیکەری ڕۆحماندا موحتاجیان دەبین، کە پێش هەر شتێکی دی بریتییە لە هەستی ژیاندن و ژیاندنەوە. لە وتاری "تایبەتمەندیی سەرەکیی بیری ئیسلامیدا"دا ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەم بابەتە دەکات. پاشان لە "دوو ڕووی عەقڵ و مەعقوولییەتدا"دا

پەنجە دەخاتە سەر ئەرك و فەرمانبەرییەکانی عەقڵ لەژێر ڕۆشنایی وەحیدا و لەڕوانگەی قورئانەوە لەسەر مەعقوولییەت و نامەعقوولییەت هەڵوێستە دەکات. لە "سەرچاوە سەرەکییەکانی میراتی ڕۆشنبیریمان"دا هەریەك لە قورئان و، سوننەت و، کۆدەنگی (ئیجماع) و، بەراورد (قیاس) و، بەرژەوەندی و، ئیستیحسان و، تەسەوف و، زانستی کەلام و، عادەت و نەریت وەك سەرچاوە سەرەکییەکانی میراتی ڕۆشنبیریمان تاوتوێ دەکات. لە وتاری "ڕۆحی ئیسلام" و "پوختەیەك دەربارەی سیستەمی بیرکردنەوەمان"دا نووسەر لە دیدێکی نوێ و ناوازەوە شرۆڤەی ئیسلام دەکات. لە "دواین هەواڵدەر لە غەیب"یشدا بەدوورودرێژی باس لە حەزرەتی موحەممەد دەکات و، خەسڵەتە مەزنەکانی ئەومان دەهێنێتەوە یاد و، قەرزاریی ئێمە بەرامبەر بە ئەو دەردەخات.

سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمەش بۆ زمانی شیرینی کوردی، هیواداریین توانیبێتمان -ئەگەر تا ئەندازەیەکیش بێت- مەبەست و نیەتی دانەر بۆ خوێنەرانی کوردزمان بگوازینەوە و، ئاشنایان بکەین بە جیهانێکی نوێ و، سەرکەوتووبووبین لە دەربڕینی ئەو ئازار و، خەم و، دڵسۆزی و، خۆشەویستی و، فیداکارییەی کە لە هەریەکێك لە دێڕەکان و لە خامە بەپێزەکەی ئەم مامۆستا بەڕێزەوە دەچۆڕێت.

## بەرەو سەڵتەنەتی دڵ

لە ڕابردووەوە تا ئەمڕۆ، میللەتانێکی زۆر وەکو لایەنێك لە لایەنەکانی هاوسەنگیی نێودەوڵەتیی شوێنە جیاوازەکانی دونیا و کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانیان بەڕێوەبرد. مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت چەندی تریش لەداهاتوودا هاودەم لەگەڵ ڕووکاێکی شارستانێتیی نوێ و شانەیەکی کلتووریی تازەدا دەردەکەون! هەریەك لە ڕۆما و، میسر و، یۆنان و، چین و، هیندستان و تورکستانیش لەو ڕووەوە کە دایکایەتی بۆ چەندین شارستانێتیی جۆراوجۆر کردووە، بە نەخشێکی گرنگی ئەم چنراوە دادەنرێن. ئەو نوێنەرایەتییە بەرز و مەزنەش کە ئیسلام بەدرێژایی چەندین سەدە لەسەر ئاستی چەند کیشوەرێك و لە شێوەی لایەنێکی بەهێزی هاوسەنگیی گشتیدا دەریخست، خاوەنی سیفەت و قووڵیی تایبەت بە خۆیەتی.

هەموو ئەو لوتکە مێژوویيانەی تا ئێستا بینراون، پێکەوە و لە هەمان کاتدا ڕوویان نەداوە. هەروەك لەڕووی ماددیی زەویشدا دەبینرێت، جاروبار لوتکەکان لەگەڵ دەشت و بان و کەناری دەریاکان

و، چاڵ و دۆڵە قووڵەکانیش لەگەڵ شاخ و چیاکان شوێنی یەکتریان گۆڕیوەتەوە.. ئەوانەش کە یەك یەك هاتوونەتە سەر تەختی شانۆ، یەك یەك سڕاونەتەوە و نەماون.. ڕۆیشتووان کەسانی نوێیان بەدوادا هاتووە.. وە هەمیشە مێژوو خۆی دووبارە کردووەتەوە. بەڵێ، لەکاتێکدا زەمانە وەك سێلاوێك شەپۆلی داوە، چەپکەگوڵی سەرکەوتن و ئایندەی گەشی پێشکەش بە هەندێك کردووە و، مۆری ژێرکەوتن و لەناوچوونیشی بە هەندێکی ترەوە ناوە. لەم ڕووەوە لەوانەیە هەندێك میللەت لە یەك کات و سەردەمدا ژیابن، بەڵام کاتێك هەندێکیان لەم لوتکەی سەرکەوتن بۆ ئەو لوتکە فڕیون، هەندێکی تر لە کەندەڵانەکانیشدا چاڵێکی ئەمینیان نەدۆزیوەتەوە سەری خۆیانی تێدا کزبکەن. بۆیە هەروەك چاخەکانی ناوەڕاست سەبارەت بە هەموو میللەتان بە تاریك دانانرێت، لەم سەردەمی زانست و تەکنەلۆجیایەشدا کە ئێستا تێیدا دەژین، مەرج نییە سەبارەت بە هەموو کۆمەڵگایەك ڕووناکی بێت.

بەڵێ، هەمیشە دووبارەبوونەوە مێژووییەکان تا ئەندازەی لەیەکچوون بەدوای یەکتردا هاتوون و، لوتکەی سەرکەوتنەکان جارێك لێرە و جارێك لەوێ، گاهـ لەم سەردەم و گاهـ لەو ڕۆژگار هاتوونەتە مەیدان. هەرگیز نە بەرزبوونەوە و نە نزمبوونەوەکان لە یەك کات و لە یەك کیشوەردا ڕوویاننەداوە. لەڕاستیدا ئەمڕۆش هەمان شت ڕوودەدات. ئەمێستا کاتێك پێ دەخەینە سەدەی بیست و یەکەمەوە، هەندێك لەو میللەتانەی کە پێش سەردەمی خۆیان کەوتوون، قاچێکیان لەسەر مانگ و قاچەکەی دیکەیان نازانم لەسەر چ هەسارەیەکی ترە و، جیاوازییەکی سەرسووڕهێنەر نیشان دەدەن، لە هەمان کاتدا و لەو جێگایانەی تری زەویدا کە تاریکە،

دونیایەك بەدبەخت هەن كە هێشتا لەناو دەشتەكێتی و زەبوونیی هەزار ساڵ لەمەو پێشدا دەتلێنەوە. لەمەودواش شارستانێتییەكان چەند بڵاوببنەوە و تەكنەلۆجیاش چەند پێشبكەوێت، هێشتا هەر هەندێك لە كیشوەرەكان بەهۆی كۆچی مێشكەوە[1] ئاوەدان و پێشكەوتوو دەبن و، هەندێكی تریش لە ئەنجامی ڕاكردنی مێشكەكان لە بناغەوە دەكەوێتە لەرزین، هەندێك ناوچە وەك ئەوەی چەقی بەڕێوەبردنی هاوسەنگیی نێودەوڵەتی بن، هەمیشە دەست لە هەموو كەسێك و هەموو شتێك وەردەدەن و، هەندێكی تریش هەردەم لە ئەنجامی دەست تێوەردانە دەرەكییەكان دەچەوسێنەوە.

ئەگەر ڕەشەبایەكی پێچەوانە هەڵنەكات و ئەو شتانەش كە تا ئێستا بەدەست هاتوون بە شێوەیەك لە شێوەكان نەدرێن بەدەم باوە، نابێت هەرگیز گومان لەوە بكرێت كە لە داهاتوویەكی نزیكدا، مرۆڤی ئێمەش، بەتایبەتی نەوە لاوەكانی، دەبن بە هزرە بڕیاردەرەكانی دوای هەزارەی دووهەم. بەڵێ، نەوەكانی ئەمڕۆ كە كەوتوونەتە ڕێ، لە ئێستاوە وەك ئەوەی تۆڵە لە بەشخوراوی و، ستەملێكراوی و چەوسانەوەی خۆیان بكەنەوە، هەژان و كرژیی مێتافیزیكی تێیاندا ڕاپەڕیوە و، پەیامی زۆر گرنگ پێشكەش دەكەن سەبارەت بەوەی كە لەدوای هەزارەی دووهەم و لەسەر ئاستی گشت چین و توێژەكانی كۆمەڵگا نوێبوونەوەی تەواو جددی بەڕێوەیە. ئیمان و، هەوڵ و، دامەزراوی و، عەشقی حەقیقەت و بیركردنەوەی سیستەماتیزەكراو كە هەریەكەیان هێزێكی ماتەوزەن، كاتێك وادەی خۆیان هات یەك یەك میوەی خۆیان دەبەخشن و، بە یەك

---

١. كۆچ یان ڕاكردنی مێشك (Mind immigration)، بریتییە لە دیاردەی كۆچكردنی كەسە زیرەك و، داهێنەر و، خاوەن توانا و لێهاتنەكان لە ژینگەیەكی نالەبارەوە بۆ ژینگەیەكی لەبار. لە ئەنجامدا شوێنی بەجێهێڵراو دوادەكەوێت و جێگای كۆچبۆكراویش پێشدەكەوێت.

جار تامی "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ێکمان پێدەچێژن کە هەموو بەشەکانی ژیان دەگرێتەوە.

ئەم جۆرە لە "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ" کە بە ئەندازەی مێژووی مرۆڤایەتی کۆنە و بە ڕووی سپیی چارەنووسی ئەو دادەنرێت، لەمرۆماندا چوارچێوەکەی زیاتر لە لایەن ئاستی بیرکردنەوە و کلتووری مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە و، قووڵیی مرۆڤێتییەکەی و فراوانیی دیوی مێتافیزیکەکەیەوە دیاری دەکرێت. ئەم چەرخە کاتێك بەرەو سەدەی بیست و یەکەم دەهات، بوو بە مەیدانی ماندوویەتی و، دوودڵی و، ئەندێشە و دارِمان. دۆخێکی لەم شێوەیە، هەرچەندە هەندێکی بەرەو نائومێدی و خەیاڵشکان ڕاپێچ کرد، وەلێ لەوانەدا کە بەتەواوەتی تەسلیمی تاریکی نەبوون، بە ئەندازەی سەربەستیی ویژدان و، ڕوونیی بیرکردنەوەیان، غیرەتی میللی و هەستی دڵسۆزی ورووژاند و، لە ئەنجامدا بوو بە هۆکارێك بۆ پێگەیشتنی چەندین توانا و لێهاتنی وا کە لە ئاستی بلیمەتیدان. بەتایبەتی ئەم دۆخە لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا ڕۆڵی شەیپوورێکی بینی و چەندین زیندووبوونەوەی یەك لەدوای یەکی هێنایە پێش. لەم ڕووەوە ئەم چەرخە عیفریت ئاسایە، هەم دایکایەتی بۆ کۆمەڵێك خراپکاریی وا کرد کە تا ئێستا هاوشێوەی نەبینراوە، هەم دەوری ڕەمپایەك بەمەبەستی بەرزبوونەوەیەکی ستوونی و بەندەرێك بەئامانجی کرانەوە بینی سەبارەت بە میللەتانی وەك ئێمە.

ئێستا ئەو تاقە شتەی دەکەوێتە سەر شانی ئێمە ئەوەیە هاوڕێ لەگەڵ هەستێکی جددیی بەرپرسیارێتیدا و بێ ئەوەی هیچ کاتێك

بەفیرۆبدەین، بەپەلە بۆ جێکردنەوەی خۆمان لە هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکاندا ڕابکەین. خۆی لەخۆیدا ئەگەر ئامانجێکی لەم جۆرە نەبێت، بەم حاڵەی ئێستامانەوە نەك هەر پێشکەوتن، بەڵکو تەنانەت گەیشتنیشمان بە داهاتوو مەیسەر نابێت.. بەڵێ، ئەمڕۆ ئێمە تەنها دوو بژاردەمان لە بەردەمدایە، یان خەبات و زیندووبوونەوەیەك تا ئەندازەی مردن، یان خۆمان لە باوەشی حەسانەوە و پاڵدانەوە بهاوین و، خۆمان ڕادەستی مەرگێکی هەمیشەیی بکەین!..

قورئانی پیرۆز هەمیشە ئەم هەبوون و نەبوونەمان پێش چاو دەخات و، هەردەم ئامۆژگاریمان دەکات خۆمان نوێ بکەینەوە و بە تازەیی بمێنینەوە. ﴿...إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾[1] "ئەگەر بیەوێت ئەوە ئێوە لەناودەبات و ناتانهێڵێت و کەسانی تازە دەهێنێتە کایەوە." ﴿...إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾[2] "ئەگەر بیەوێت ئێوە لەناو دەبات و کەسانی تر سەرلەنوێ دەهێنێتە کایەوە." ﴿...وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم﴾[3] "جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لەم دین و بەرنامەیە، خوا کەسانی چاکتر لە ئێوە دەهێنێتە مەیدان، کە بە هیچ شێوەیەك لە ئێوە ناچن و وەك ئێوە نابن." و ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان کە بەم ئاڕاستەیەدا نازڵ بوون، پێم وایە ئەمەندە بەس بێت بۆ ئەوەی لەم ڕووەوە بیرۆکەیەکمان پێبدات.

لەم ئایەتانەدا ئەو کەسانەی "لادەبرێن"، ئەوانەن کە نەیانتوانیوە خۆیان نوێ بکەنەوە و، سەرکەوتوو نەبوون لە مانەوەیاندا بە تازەیی و، مافی ئیمانداریێتییان بەتەواوەتی نەداوە و، کۆمەڵێك ڕۆحی مردوون کە جیهانی

١. سورەتی إبراهیم: ١٩.
٢. سورەتی فاطر: ١٦.
٣. سورەتی محمد: ٣٨.

ناوەویان ژەنگی گرتووە. ئەگەرێکی بەهێز هەیە کە ئەمانە -سەرەڕای ڕەچاوکردن و جیاکردنەوەی ئەو ئیمان بە خوایەی کە لە دڵیاندا هەیە- ببن بە خەڵکانی جیهانی سێهەم. ئەوانەش کە "دەهێنرێن"، ئەو نەوە نوێ و ئەو کۆمەڵە پیرۆزەن کە بەدرێژایی چەندین سەدەی ڕەبەق لەم دونیا پڕ لە خەم و خەمگینەی ئێمەدا هێندە دەمەزەرد بوونەتەوە کە هێزی مێتافیزیکییان پەرەی سەندووە و، کاندیدن بۆ ئەوەی مرۆڤی ئێمە کە هەتا ئەمرۆ بچوك تەماشا کراوە و سووکایەتیی پێکراوە، بەرزبکەنەوە بۆ بەهایەکی یەکجار مەزن.

هەتا ئەمڕۆ ڕۆژئاوا بەها دینییەکانی خۆی و ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی عیسای پشتگوێ خست و، جەنگ و، کۆیلایەتی و کۆلۆنیالیزمی بۆ گشت کیشوەرەکان بە دیاری برد و، لە ئەنجامیشدا ڕووی جیهانی بەجارێك تاریك کرد. لە ئێستادا ئەو، لە ناوەڕاستی داروپەردوی پاش خاپوورکردن و وێرانکردنی دونیای مەعنەویی ناو دڵی مرۆڤەکاندا، هەمیشە کابووس دەبینێت و، لەهەمبەر ئەو ژیرییە ساغ و بیرکردنەوە ئازادانەش کە لە هەموو جێگایەکدا سەرهەڵدەدەن، لە ترس و لەرز و ئەندێشەدایە.. جگەلەوەش، لەبەرئەوەی بەتەواوەتی نازانێت لەکوێدا هەڵەی کردووە، تابڵێی بێچارە و، لەرزۆکە و، لە بەرامبەر مشتەکۆڵە گریمانکراوەکانی ڕای گشتیی کۆمەڵگاکانی ناو خۆی -کە لە ئێستادا خۆیان بۆ هەڵکوتینە سەری ئامادە دەکەن- هەڵدەلەرزێت... ئەو، کاتێك لە حاڵێکی بەزەییبزوێنی لەم جۆرەدایە، لەبری ئەوەی بەخۆیدا بچێتەوە و لێپرسینەوە لە خۆی بکات، کەچی بەرەو خۆشگوزەرانی و، هەرزەیی

و چێژە جەستەییەکان پاڵ بە خەڵکانەوە دەنێت و، لەپێناو خۆدزینەوە لە گێژاوەکانی ئەمڕۆ هەوڵێکی بەرگریکارانە دەدات.

گەرچی ئەم دونیایە[1] جارێك لە ڕێگای سەرکەوتنە زانستی و تەکنەلۆجییەکانەوە هەوڵی ئاسوودەکردنی خۆی دەدات و، جارێکی تریش دڵنەوایی خۆی بە سەروەت و خۆشگوزەرانی دەداتەوە، بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە هیچ یەکێك لەمانە بەختەوەرییەکی هەمیشەیی بە ئادەمیزاد نابەخشن و ناتوانن وەڵامی داخوازییەکانی ئارەزووی ئەبەدییەتی ناخی مرۆڤ بدەنەوە. لەم ڕووەوە ئەو، هەر شتێك کە وەکو چارەسەر پێشکەش دەکات، ئەوەندەی تر ئاسۆی مرۆڤایەتی تاریك دەکات و، هەرزەیی زیاتر دەخاتە سەر هەرزەیی ڕۆحی.

با هەنووکە ئەو، لە بەرامبەر ئەو بۆشایی و تەنگژانەی کە لە ژیانی کۆمەڵگادا سەریانهەڵداوە و دەرەنجامی ئەو هەڵە گەورەیەیە کە ئەنجامیداوە، هەر بە زانست و تەکنەلۆجیاوە بنازێت و، بە زەوق و سەفا هەوڵی دڵدانەوەی خۆی بدات، یاخود چاو ببڕێتە قووڵاییەکانی بۆشایی ئاسمان و، بەدەم گەڕان بەدوای ئەو ڕۆح و مەعنایەدا -کە لەناو دڵی خۆیدا ونی کردووە- لە جێگای هەڵەدا، تەمەنی خۆی بەفیڕۆبدات. بەڵام ئێمە وا بۆ یەك دوو سەدە دەچێت کە هەست بە جۆشوخرۆشی خێراترین و ڕێکوپێکترین گەڕانەوە دەکەین بەرەو ڕۆحی خۆمان. ئەم گەڕانەوەیە خێراتر و ڕێکوپێکترە لە هەموو ئەو گەڕانەوانەی پێشتر ڕوویانداوە. بەڵێ، مرۆڤی ئێمە کە هەتا ئەمڕۆ و بەنزیکەیی لە هەموو کاتێکدا هانای بۆ "ماددە" و بۆ "ئامێر" دەبرد و، هەموو شتێکی بە پێوەرە

---

١. مەبەست لێی دونیای ڕۆژئاوایە وەك پێشتر باسکرا.

ماددییەکان هەڵدەسەنگاند، لەئەنجامی ئەو زللە یەك لەدوای یەکانەی لە لایەن ئەو تابۆیانەوە دەرخواردی درا کە ماوەی یەك دوو سەدە ئەم سەری کۆیلایەتی بۆ دانەواندبوون، ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێژەییش بێت بەئاگاهاتەوە و، دەستیکرد بە بینینی خۆی وەك قوربانیی گۆڕانێکی مێژوویی.. وە باوەڕی هێنا بەوەی کە دەبێت شیوی قووڵی نێوان حاڵی ئێستا و ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی بە خەبات و، دڵسۆزی و، لەخۆپرسینەوە و فرمێسك پڕبکاتەوە و، بەدەم وتنی "هەوڵ، تەوەککول، دامەزراوی"یەوە ڕێگای گرتەبەر. ئیدی ئەو، بەم ئاڕاستەیەدا -کە ئەگەر ڕێیەکانیش تەواو ببن هێشتا ڕێبواری و گەشتەکان لەبن نایەن- دەڵێت ''سەیاحەت یا رسول الله!'' و تا ئەبەد هەنگاو دەنێت. لەم ڕێگایەدا سەرچاوەی هێزی لەبن نەهاتووی ئەو بریتییە لە: سەرلەنوێ دۆزینەوەی حەقیقەتی ئیمان و هەستکردن پێی لە ویژداندا، گۆشکردنی ئیرادەکەی بە بەندایەتیکردن بۆ خوای گەورە و هەمیشە کراوەبوون بەڕووی مەیلە خێرەکاندا، هاودەم لەگەڵ شعووری ئیحسانێك کە هەموو ڕۆژێك پتر دەبێت، هەست بە حەقیقەتی "لی مع الله وقت-کاتێکی تایبەتم هەیە لەگەڵ خوای خۆمدا" بکات و، هەمیشە خاوەنی ئاسۆیەکی مێتافیزیکیی قووڵ و پەیوەندیدار بێت بە جیهانی ئەودیو. بەئەندازەی پڕچەکبوون و ئامادەباشییەکی لەم جۆرە، ئەو تۆوانەی ئەمڕۆ هاوڕێ لەگەڵ نەشوەی عیبادەتدا بە هەر چوار لای دونیادا دەوەشێنرێن، بێگومان ئەو دەمەی وەرزی خۆی هات، بە زایەڵەی بەهار سەوز دەبن و، بەیەکجار تامی چەندین بەهار دەرخواردی کۆمەڵگا خەمگینەکانی ئێمە دەدەن.

بەڵێ، گرنگترین لایەنی پەروەردەکردنی نەوەکانی ئەمڕۆ بریتییە لە خۆشەویستکردنی باوەڕهێنان و، زانین و، لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە، ئەویش لە ڕێگای بێدارکردنەوەی مەیلی بیرکردنەوەی سیستەماتیزەکراو لە لایان و، فێرکردنی ئەوەی چۆن لەنێوان دونیای ناو خۆیان و بوونی دەرەکیدا بێن و بچن و، چۆن ئاسۆکان و نەفسەکان وەك پەڕاو موتاڵا بکەن. هەروەها پێشکەش کردنی ئەم تێبینییە فراوانانە لە ڕێگەی هەندێك دەنگ و وشە و وێنەوە بە ئاسۆی تێگەیشتنی ئەوان و، ڕزگارکردنیان لە زیندانییە تەسکەکانی لاشە و مسۆگەرکردنی پەوەندییان لەگەڵ دونیاگەلێکی فراوانتردا.. هەروەها، بەیارمەتیی شتنەوە و فڕێدانی چڵك و ژەنگی ناو دڵیان، پێشکەش کردنی ئەفسووناویترن و بەنازترین چاوەڕوانییەکانی سروشتی مرۆیی بەو دڵانەیان کە موشتاقی ئەودیوی ئاسۆ مرۆییەکانن. ئەمەش دەبێت بە مژدەی دووبارە لەدایکبوونەوەی ئەوان. خۆی لەخۆیدا ئەو ڕۆحانەی کە بە ئیمان و، مەعریفەت و، خۆشەویستیی خاوێن نەبوونەتەوە و سووکییان بەدەست نەهێناوە، هەرگیز پەروازکردنێکی لەم شێوەیان بۆ ئەودیوی ئاسۆکان بۆ مەیسەر نابێت. نەك هەر نابێت، بەڵکو ڕۆحگەلێکی برسی لەم جۆرە، هەمیشە بە هەڵپە دونیاییەکانەوە تێوەدەگلێن.. سیستەمی ڕۆحیان دەکەوێتە ژێر فەرمانی میکانیزمی نەفس.. ئیتر لەمە بەدوا تەنها دەخۆن و دەخۆنەوە، هەڵدەستن و دادەنیشن و، هەمیشە وەك بەندەی زنجیرلەملی جەستە ڕەفتار دەکەن.

لەڕاستیدا تاقە حەقیقەت کە ئیمان و، مەعریفەت و پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورە بە ڕۆحی مرۆڤی دەبەخشن خۆشەویستییە. ئەو شتانەش کە ئەمانە ڕایدەماڵن ڕق و، قین و خاڵە لاوازەکانن.. بەڵێ، ئیمان و،

مەعریفەت و خۆشەویستی، مرۆڤ لەگەڵ سەرجەمی بووندا یەکانگیر دەکەن.. وە لە هەمان کاتدا لە ئازار و ژانی زۆری (الكثرة) ڕزگاری دەکەن و، تەنیایی و نامۆیی نێو دونیای ناوەکیی خۆی بە ئیکسیری هاودەمی لەگەڵ خوای گەورە دەتوێننەوە و، ژیان دەگۆڕن بە چێژ و لەزەت و، کاسە لەسەر کاسە پێشکەشی دەکەن.

ئەو نەوانەی ئا بەم ئامادەباشییەوە پێ دەنێنە داهاتوو، کۆچ بۆ هەموو لایەکی دونیا دەکەن و، هاوڕێ لەگەڵ ئەوینێکی قووڵا و، شەوقێکی فراوان و، بێگومان بێ ئەوەی بەرامبەری کارەکەیان یان سوود و بەرژەوەندییەکان بە خەیاڵیاندا بێت و، دەرگا لەسەر ناوبانگ و پلەوپایە بەتەواوەتی دادەخەن و، بەمەبەستی سەرخستنی هەموو مرۆڤایەتی بە پلەکانی کەماڵدا، بەرگەی سەختترین بارودۆخەکان دەگرن و، شان دەدەنە بەر گرانترین کاروبارەکان و، پاشان بێ ئەوەی ئاوڕ لە دواوەیان بدەنەوە دەڕۆن بۆ جێگایەکی تر. ئەمانە لەو شوێنانەدا کە ڕووی لێ دەکەن، ئەگەر باسی دینیش نەکەن و، دینداریش نەهێننە سەر زمان، بەو ڕێز و شکۆ و سامەی کە لە ڕەفتارەکانیان دەڕژێت، بۆیاخی ڕۆحی خۆیان دەسوون لە گشت چاو و دڵێك.. وە پەیوەندی لەگەڵ هەر کەسێکدا بگرن، لەبری ڕاستییە ڕێژەییەکانی ماددەی ڕەهەند تەسك، دەیانکەنەوە بەڕووی ئاسۆ فراوان و دەوڵەمەندەکانی مەعنادا و، لەهەمان ئەم دونیایەدا دەگەن بە فراوانییەك کە خەیاڵەکان دەبەزێنێت و، سەڵتەنەتێك کە وشە و دەربڕین لە ئاستیدا دەستەوەستانە.

## بەرەو شارستانێتیی خۆمان

ئێمە ئەمڕۆ وەك میللەت، بەبێگومانی ناچارین بزانین بە کام نەخشە و پرۆژە پێشوازی لە داهاتوو دەکەین و دەخوازین لە چ لاپەڕەیەکەوە بۆ چ لاپەڕەیەکی تر بپەڕینەوە. ئێمە وەك کۆمەڵگا لە ڕابردووی نزیکماندا تۆز و غوباری چەندین ڕووداوی تراژیدیی کۆمەڵگاکەمانی هەژاند و، لەگەڵ زرمەی کارەساتەکاندا چاومان بەم چەرخە هەڵهێنا. تا لەنێو ئەم تۆز و غوبارەدا و کاتێك لە چەقی ئەم هەژان و لەرزینانەدا بووین، بینینی ئامانجی کۆتایی بەڕوونیی بەمەبەستی زیندووبوونەوەی میللەت و، دەستنیشانکردنی ڕێگایەکی دروست و کورتبڕ بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، هەڵبەتە کارێکی تەواو سەخت بوو، تەنانەت لە ڕوانگەی ئەمری واقیعی ناوەکی و دەرەکییەوە نزیکی مەحاڵ بوو. سەخت و مەحاڵ بوو، کەچی ئەوەی مایەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە سەرلەنوێ ڕووکردنە بەهاکانی خۆی و، بینینی خەونی زیندووبوونەوە لە لایەن کۆمەڵگایەکەوە کە هەموو شتێکی لەرزیوە و ئامادەکراوە بۆ ڕووتاندنەوە، دیسان کەوتە ئەم سەردەمەوە. وە ئەمە ڕووداوێکی نائاسایی بوو، چونکە

لەو ڕۆژەدا شعووری شەخسی لە بناغەوە ڕووخابوو و، میللەت بەو سیفەتەی کە خۆی لە ناوجەرگەی ترسناکترین بوومەلەرزەکاندا دەبینیەوە سەراسیمە بووبوو و، حەشاماتەکانیش بەو تراژیدیا ترسناکانەی کە لە مێژوویاندا بەدەگمەن بینیبوویان، پشتیان چەمیبوویەوە.

لە زەمینەی تۆز و غوبارێکی لەم چەشنەدا کە هێشتا ویژدانی گشتی دروست نەبووبوو، تەنها کۆمەڵێك تاکی لەیەکدابڕاو هەبوون، ئەوانیش سەبارەت بە داهاتوویان تەنها لە خەمی پەناگەیەك و دوو پاروو ناندا بوون و، لە ڕوویەوەکەوە چینەکردنیان لە جێگای خۆیاندا بە ڕۆیشتن دەزانی. هەروەك کەس نەیدەزانی بۆچی دەژی، بێئاگاش بوون لە بوونی بەهاگەلێك ئەگەر پێویستی کرد دەبێت ئادەمیزاد لەپێناویاندا بمرێت. بیرەکان پەرتەوازە و، ئیرادەکان لەرزیو و، ئاسۆکان تاریك و، دڵەکان خاڵی و هیممەتەکانیش دووچاری ئیفلیجی بووبوون. سەرەڕای هەموو ئەم بەڵایانە، کۆمەڵگا هەموو ڕۆژێك خەونی نوێی دادەهێنا و، لە خۆزگەکاندا بەدوای دڵنەواییدا دەگەڕا و، هەموو ڕۆژێك هاودەم لەگەڵ نەخشەیەکی تازەدا لەناودەچوو.

ئەوەندە هەیە ئەم کۆمەڵگایە ئەگەر لەسەر ئاستی زەمینەیەکی تەسکیش بێت، بزرکاندنی هەندێك نەخشەڕێگا لەبەر خۆیەوە و باسکردنی هەندێك پرۆژە، دیسان لەم سەردەمە شوومەدا هەڵکەوت کە جار لەدوای جار دەست دەخرایە بینی و دووچاری هەرەسی ڕۆحی دەبوویەوە. لە سەرەتادا هەموو شتێك وەك پەرچەکرداری ئەو هزرانەی سووك تەماشاکران و، ئەو باوەڕەی سووکایەتیی پێکرا و، ئەو ویژدانانەی خرابوونە ژێر فشار دەرکەوت. بەدوای ئەمەدا جوڵەی ژیرمەندانە و

بزاوتنی بەردەوام هاتن کە سەرەتایەکی لەم جۆرە، شایانی ئەوەیە بە زاینی "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ی میللەتی ئێمە دابنرێت... هەڵبەتە لە ڕابردوو و لە ئێستاشدا کۆمەڵێك دەرکەوتن و دەردەکەون کە دەیانەوێت ئەم جوڵە ژێرمەندایە و ئەم وزەیەی کە لە زیندووبوونەوەی ناو ڕۆحەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، لەژێر کۆنترۆڵی خۆیاندا ڕابگرن و، بە ئارەزووی خۆیان سوودی لێوەربگرن، هەروەك لە ڕابردووشدا ڕوویداوە.. بەڵام چیدی ئەو حەشامات و چینانەی کە هەستیان بە خۆیان و دینامیزمی ناوەکیی خۆیان کردووە، نیەتی ئەوەیان نەبوو جارێکی تریش بکەونەوە حاڵەتێکی لەبار بۆ "داگیرکران". ئەگەر بە سنگەخشێش بوو‌بێت، هێزی پاڵنەری ئەو زیندووبوونەوەیەی لە دونیای ناوەکی و ڕۆح و دڵیاندا هەستیان پێدەکرد، بەردەوام دەبوو و، بڕیاربوو ئەگەر ئەمڕۆش نەبێت، بێگومان سبەی هەمووان "وەك خۆیان" بگەن بە بوونێکی نوێ. گەرچی هێشتا هەندێك بەربەست هەن کە بەقەدەر تۆز و غوبارە کۆنەکە ڕێگە لە بینینی دروست و هەستکردنی دروستی کۆمەڵگا دەگرن، بەڵام چیتر نە ئەو تەمە و نە ئەو غوبارە ئەستووری و چڕییەکەی جارانی نەمابوو. بەیارمەتیی هەوڵێکی کەم، دڵان دەیانتوانی دەستیان بە سەرچاوە میللییەکانی خۆیان بگات و خەون بە جیهانبینیی شارستانێتیی خۆیانەوە ببینن.

ئنجا کاتی ئەوە هات کە چوارچێوەی جیهانبینیی شارستانێتییەکەمان دەستنیشان بکەین و، لەو ڕووەوە پێیدابچینەوە کە چییە و چیی نییە و، هەڵوێستە لەسەر مانا و ناوەرۆکی دوێنێ و، نادیاریی ئەمڕۆ و، ڕاڤە گریمانکراوەکانی سبەی بکەین و، پێویست بوو گوێ لە ترپەی

دڵی ڕۆژگار بگرین بەوەی کە لە لایەك ئەسڵی خۆمان بپارێزین و لە لایەکی تریشەوە تەفسیرەکانی ئەم چەرخە[1] دەستی خۆمان بخەین. ئەمەش تابڵێی ئەرکێکی گران بوو، بەڵام مادەم ڕژاوینەتە سەر ڕێ، بەیارمەتیی خوای گەورە دەرەقەتی ئەویش دێین.

لە ڕوانگەیەکی مرۆڤناسییەوە (Anthropology) لە هەر کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو یان کەم پێشکەوتوودا، شارستانێتی -کە بریتییە لە ڕێکخستنی هەموو چالاکییەکانی ژیانی مرۆڤ، یاخود بیر و باوەڕ و جیهانبینیی هونەریی میللەتێك یان کۆی سیفەتە ماددی و مەعنەوییەکانی تایبەت بە میللەت- چەمکێکی وایە کە بەگوێرەی تێگەیشتن و، جیهانبینی و فەلسەفەکان چەندین جۆری جیاوازی هەیە. ئەگەر چەندین جۆری جیاوازیشی هەبێت، بێگومان هەرگیز ئەم جیهانبینییە بریتی نییە لەو شێوازی ژیانەی داگیرکاران کە لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمەوە بە میرات لێیان بەجێمابوو و، ئێمەش چەندین ساڵی دوورودرێژ بە هەناسەبڕکێ شوێنی کەوتین و لەپێناویدا دەستمان لە زۆرێك لە بەهاکانمان شت. چونکە ئەگەر وا بووایە، هەموو ئەو خەباتەی لە دژی ڕووتاندنەوە و داگیرکاری دراوە هیچ مانایەکی نامێنێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا ئامانجی هەوڵ و خەباتی ئەو ڕۆژگارە ڕوون بوو، ئەویش ڕزگاری و ئازادییەکی تەواوەتی بوو.

١. هەروەك چەندین کەسایەتی و زانا ڕاڤەیان بۆ قورئانی پیرۆز کردووە، بەهەمان جۆر کات و سەردەم و ڕۆژگاریش تەفسیری قورئان دەکەن، بگرە باشترین ڕاڤەکارن. هەر بۆیە تا ڕۆژگار پیربێت قورئان لاوتر دەبێتەوە. مەبەستی نووسەر لە "تەفسیرەکانی ئەم چەرخە" هەموو ئەو زانستە جۆراوجۆر و تەکنەلۆجیا و پێشکەوتنەی ئەم سەردەمەن کە دەتوانرێت لە گەیاندنی نوورەکانی قورئاندا وەك ئامراز کەلکیان لێ وەربگیرێت.

لێرەوە ئەگەر لە ئێستادا بیر لە نوێبوونەوەیەکی "خۆمانە" بکەینەوە و، سەبارەت بە جیهانبینیی شارستانێتی بەدوای ئوسلوبی خۆماندا بگەڕێین، ئەوا پێویستە کۆتایی بە داگیرکاریی هەر بیر و تێگەیشتنێکی بێگانە لەناوماندا بهێنین کە بەرنامەڕێژ کراوە بۆ ڕووخاندنی ڕەگەکانی مەعنا و ڕۆحمان و، دەبێت بەبێگومانی ڕێگایەك بگرینەبەر کە تێیدا بتوانین لەسەر قەنەواچەی خەرمانی میللیی خۆمان، شێوازی بیرکردنەوە و، سیستەمی باوەڕ و فەلسەفەی ژیانی خۆمان بنەخشێنین. ئەگەر نەیشتوانین شیکارێکی نوێی مرۆڤناسی دابهێنین، ئەوا پێویستە بەحەتمی لەپێناو گەیشتن بە فیکرێکی باڵا کە بەگوێرەی جیهانبینیمان دیاریکراوە، سوود لە هەموو ئامراز ڕێگەپێدراوەکان وەربگرین و، بە ئامانجی دەربازبوون لەو هەموو قەیرانانەی تێیکەوتووین، کۆمەڵێك ڕێگای جێگرەوە بۆ چارەسەر بدۆزینەوە. لە دۆزینەوەی ئەم ڕێگاچارە جێگرەوانەدا بەتایبەتی دەبێت هەموو پێویستی و داخوازییەکانی پێگەی جوگرافی و کۆمەڵایەتیمان ڕەچاوبکەین.

ئەگەر شارستانێتی بریتی بێت لە کۆی هەندێك هەلومەرجی ماددی و مەعنەوی، یان ناونیشان و سەرچاوەی دەستەبەرکردنی هەموو ئەو پێداویستییانە بێت کە پێکهاتەکانی کۆمەڵگا بە منداڵ و گەنج و پیرەوە لە هەموو پلیکانەیەکدا و لە سەرجەم لاپەڕەکانی گەشەسەندندا پێویستیان دەبێت، ئەوا لام وایە لەپاڵ ئەوەدا کە پێویستە مرۆڤناسییانە لە بابەتەکە بڕوانین، دەبێت هەنگاوێك زیاتر بچینە پێشتر و وەك دیاردەیەکی عەمەلی (Functional) مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. بەڵام کاتێك بیر لە هەموو ئەمانە دەکەینەوە، نابێت هەرگیز ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵگا

لەبەرچاونەگیرێت و پشتگوێ بخرێت. ئەگەر بێت و بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانج، حاڵی حازری هەندێك لەو وڵاتانە بە نمونە بۆ خۆمان وەربگرین کە لەڕووی هەلومەرجە شارستانییەکانەوە دەمێکە ئەم ئاستەی ئێستای ئێمەیان تێپەڕاندووە و، تەنانەت لەو ڕێگایانەدا کە ئێمە و میللەتەکانی تری هاوشێوەی ئێمە بە سنگەخشێ و کولەمەرگی پێیدا دەڕۆن، ئەوان وەك بڵێی لەچاو ئێمەدا دەفڕن، بەڵێ ئەگەر حاڵی ئێستای ئەم میللەتانە وەك سەرمەشق چاویان لێبکرێت، وا هەست دەکەم بەپێچەوانەی مەبەستەکەمانەوە زللە دەخۆین و، دەکەوینە ژێر باری نائومێدی و خەیاڵ شکانێکەوە کە نەتوانین پشتمان لەژێریدا ڕاست بکەینەوە.

بەڵێ، کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆ، ماوەیەك لەمەوپێش لەهەمان ئەم دۆخەی ئێستای ئێمەدا دەژیان و، بەخسیری هەمان ئەم تەنگانە و قەیرانانەی ئێمە بوون و، بەهەمان ئێشەوە دەتلانەوە. هەتا ڕۆژێك هات کە حەزی لێکۆڵینەوە و، ئەوینی زانست و، شەوقی کارکردن و، پاشانیش سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکان هەوڵەکانیان خرۆشاند و، ئارەزووەکانیان بزواند و، ئنجا خەڵاتکردنی هەموو کار و پرۆژە سەرکەوتووەکان، لەئەنجامدا دەرگاکانی نوێبوونەوەی بەڕووی ئەواندا کردەوە و، سەبارەت بە ئەوان زەمینەکان وەك بڵێی گۆڕان بە ئەمامگەی توانا و لێهاتنە بلیمەتەکان. ئنجا ئامێرە هەڵمییەکان و، دەزگاکانی ڕستن و چنین و، تاقیگەکانی توێژینەوە و، چاپخانە یەك بەدوای یەکدا دەرکەوتن... پاش ماوەیەکی دیاریکراویش چاخی زانیاری و کۆمپیوتەر هاتە پێش. لەبەرئەوەی زانستپەروەرانی ئەو ڕۆژگارە دۆزینەوە و

لێکۆڵینەوە زانستییەکانیان خەڵات کرد، لە هەموو جێگایەکدا توانا و لێهاتنە مەزنەکان دەرفەتی سەوزبوون و سەردەرهێنانیان بۆ هەڵکەوت و، هەموو شوێنێك لەئەنجامی چالاکیی گەرموگوڕی دەماغە دەراساکان، شێوەی پێشانگای شتە سەرسووڕهێنەرەکانی لەخۆگرت.

هەورەك چۆن کاتێك دونیای ئێمە لە ڕابردوودا هەمان زەمینە و کەشوهەوای سازاند، یەك لەدوای یەك ئیبن سینا و، فارابی و، خواریزمی و، ڕازی و زەهراوی و هاوچەشنەکانیان دەرکەوتن، بە هەمان جۆر ڕۆژئاواش چەند هەولومەرجەکەی دەست بدات سوودی لە میراتی خەرمانی پێش خۆی وەرگرت و، وەك بلێی مۆری خۆی دا لەم چەرخانەی دوایی.

لەم ڕووەوە، کارێکی هەڵەیە ئەگەر ڕۆژئاوای ئێستا تەنها بە بەرهەمی توانا و لێهاتنە بەرزەکانی وەك کۆپەرنیکۆس و، گالیلیۆ و، لیۆناردۆ داڤنشی و، میکایل ئەنجیلۆ و دانتێ... یان هی ئەدیسۆن و، ماکس پلانك و ئەنیشتاین... دابنرێت.. بەڵێ، ناکرێت ڕێنیسانسی دوێنێ و شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆجیای ئەمڕۆ تەنها بۆ کار و چالاکیی کۆمەڵێك مرۆڤی لەم شێوەیە بگەڕێنرێتەوە، ئەگەر وابێت، ئەوا لە ڕوانگەی دەستووری "پەیوەندیی نێوان هۆکار و ئەنجام"ەوە[1] ڕووبەڕووی هەندێك کێشە دەبینەوە کە ڕوونکردنەوە و چارەسەرکردنیان مەحاڵە. بەڵێ، سەرکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ و، پێکهاتنە مەزنەکان لەسەر ئاستی دونیا، لەپاڵ بلیمەتییە شەخسییەکاندا، پەیوەندی بە پێکهاتەی کۆمەڵگایەکەوە هەیە کە بلیمەت پێدەگەیەنێت و،

١. واتە: هەرگیز ناکرێت ئەنجامێکی هێندە مەزن و ئاڵۆز بگەڕێنرێتەوە بۆ هۆکارێکی ئەوەندە بچوك و سادە.

لە نزیکەوە وابەستەی ئەو زەمینە لەبار و ئەو کەشوهەوا گشتییەیە کە دۆزەرەوە پەروەردە دەکات و نەشونمای توانا و لێهاتنەکان مسۆگەردەکات. لەم ڕوانگەیەوە دەتوانرێت بوترێت کە هەرکاتێك باسی سەرکەوتن و پێشکەوتنەکان کرابێت، هاوڕێ لەگەڵ ناوهێنانی هەوڵ و چالاکیی سروشتە بەرزەکان، ئاماژەش بۆ زەمینە و کەشوهەوای گشتی کراوە. تەنانەت دەرکەوتنی بەهرە و بلیمەتیی کەسانی خاوەن توانا و لێهاتنە ناوازەکان، زۆرجار بەئەندازەی ئەو دەرفەتە بووە کە فەزای گشتی ڕێگەی دەدات. لەئێستاشدا چاوەڕێ کردنی شتی تر لەم زەمینەیەی ئێمەدا پێدەچێت کارێکی هەڵە بێت، چونکە پێش لە هەر شتێکی دی کەس توانای ئەوەی نییە یاساکانی شەریعەتی سروشتی[١] بگۆڕێت. ئەو کەسەی لەگەڵ ئەم هەموو یاسایەی بووندا ململانێ دەکات، زوو یان درەنگ دەدۆڕێت. هەروەك ئەگەر تۆو بە هەوا و، ئاو و هێزی سەوزکردنی خاك پەروەردە نەکرێت دەپووکێتەوە، توانا و لێهاتنێکی بلیمەتیش ئەگەر زەمینەی خۆی نەدۆزێتەوە مەحکوومە بە لەناوچوون.

کەوایە ئەو شتانەی لە داهاتوودا چاوەڕێیان دەکەین، پێویستە لە خاڵی یەکتربڕی نێوان زەمینەی لەبار و، هەوڵی کارکردن و، میتۆدۆلۆژیدا بەدوایاندا بگەڕێین. ئەگەر زەمینە عەشقی زانست بخرۆشێنێت و پاڵ بە شەوقی کارکردنەوە بنێت، دڵە هەستیارەکان هاوڕێ لەگەڵ هەڵمژینێکی دەراسادا بەهەموو بوونیان هەستی پێدەکەن و، سوودی لێوەردەگرن و بەیارمەتی چەند یاسا و ڕێسایەك لە ژیانیاندا جێبەجێی دەکەن. بەدوایدا

١. خوای گەورە دوو جۆر شەریعەتی هەیە. یەکەمیان شەریعەتی کەلام کە بریتییە لە کتێبە نێرراو و گوفتارە پیرۆزەکانی. دووهەمیان شەریعەتی تەکوینی یان سروشتی کە پێکدێنێت لە کۆی ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە لە گەردووندا داینراون.

"بازنەی چاکە"ی ئیلهامی نوێ و، پێکهاتنی نوێ و، شیکاری نوێ دێت، ئەمەش بەدوای خۆیدا سیستەمێك دەهێنێت کە تەبایە لەگەڵ هەوڵە ڕۆشنبیرییەکان و دینامیکە بنەڕەتییەکانی خۆی و، گونجاوە لەگەڵ جیهانبینیی خۆیدا...

کەچی لەناو ئێمەدا بە ناوی نوێبوونەوە و ڕێنیسانسی ئیسلام، هەردەم کۆمەڵێك کاڵای بێگانە لە دەرەوەڕا هاوردەکراون و خراونەتە پێش چاو کە خەڵکانی تر بەرهەمیان هێناون و، زۆربەشیان دژ و پێچەوانەی دینامیکە بنەڕەتییەکانی ئێمە بوون. هەرگیز نوێبوونە و ڕێنیسانس لەگەڵ دینامیکە خۆماڵییەکان یان تاوتوێ نەکراوە یان نەتوانراوە بکرێت. لێرەوە دەتوانرێت بوترێت کە نەگەیشتنی دونیای ئێمە بە ئاستی وڵاتانی هاوچەرخ و، نەهێنانەدی ئەو ڕێنیسانسەی چاوەڕوان دەکرێت، پەیوەندی بە پێگەی جوگرافی و، کەموکورتیی ئامراز و هۆکارەکان و ناشایستەیی مرۆڤی ئێمە نییە، بەڵکو سەرچاوەکەی تێنەگەیشتنە لە بیرۆکەی نوێبوونەوە و، کەمیی بیرکردنەوە و، شوێنگرتنەوەی ئەوینی زانست و حەقیقەتە لە لایەن چاولێکەرییەوە.

پێمان وایە هەریەك لە ئەڵمانیای ژوور سەرمان و زەبەلاحەکەی ئاسیای دوور (ژاپۆن)، بەمەبەستی باشتر بینینی کەموکورتییەکانمان نمونەیەکی باشن بۆ ئێمە.

ئەڵمانیا بە برینداری لە هەردوو جەنگە جیهانییەکە هاتەدەر. ئەم وڵاتە لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا[1] هەموو لایەکی وێران و خاپوور و جێگای هەڵنیشتن و خوێندنی بایەقووشەکان بوو. بەڵام ئەو سەرەڕای

١. مەبەست لێی سەدەی بیستەمە.

هەموو شتێك لە ماوەیەکی کورتدا خۆی کۆکردەوە و وەك وڵاتێکی بەهێز لە جیهاندا خۆی نمایان کرد. ئێمە هەر لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەوە و لەکاتێکدا هێشتا ناوی یەکێتیی ئەڵمان نەهێنرابوو دەستمان کرد بە خەون بینین بە نوێبوونەوەوە. ئیدی با هەر خەونی نوێبوونەوەی ئێمە ببێت بە باسی ناو باسان، کەچی ئەڵمانیا ئەمڕۆ لافی بوون بە وڵاتی خەونەکان لێدەدات... لەوانەیە بوترێت ئەڵمانیا چونکە وڵاتێکی ڕۆژئاوایی بوو دوو جار لە کفن کراسی دووری و، چەندین "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ی گرنگی ئەنجامدا کە گونجاوبوو لەگەڵ فەلسەفەی ژیانی خۆیدا. ئەگەر وڵاتە ئەوروپییەکان نزیکیی ئایینی و کلتوورییان لەگەڵ یەك نەبووایە، ئەڵمانیای ئەمڕۆش نەدەبوو. ئەگەر ئەم بۆچوون و لێکدانەوەیەش قبووڵ بکەین، خۆ ژاپۆن بەدرێژایی ماوەیەکی دیاریکراو ڕووبەڕووی ڕەفتارە دوژمنکارانەکانی جیهانی ڕۆژئاوا بوویەوە و لەژێر هەڕەشەدابوو.

بەرنامەی نوێبوونەوەی ئێمە بەنزیکەیی نیو سەدەی ڕەبەق پێش ئەوەی ژاپۆن دەست پێدەکات. ئەو ژاپۆنەی پەنجا شەست ساڵ دوای ئێمە تای نوێبوونەوەی گرت، هەموو بەربەستەکانی بڕی و، سەرەڕای دوو لەرزینی مەزن لە ڕابردووی نزیکیدا، بە هەڵمەتێك پێش ئێمە کەوت و، شوێنی خۆی لەناو خێزانی ئەو وڵاتە بەهێز و مەزنانەدا گرت کە جیهان بەڕێوەدەبەن. ئیدی با ئێمە هەر بە شیعر و شانامەی لەدایکبوون و زیندووبوونەوە دڵی خۆمان خۆشبکەین، ئەوان دەمێکە کەوتوونەتە چنینەوەی بەروبوومی ڕێنیسانسەکەیان. ئێمە دوای گەشتێکی سەد و پەنجا ساڵە، هێشتا لەبری ئەو ئامانجەی پێیدەگەین، خەریکی

شەڕەقسەی ئەوەین کە داخۆ خاڵی سەرەتا و دەرچوونمان کوێیە و، سەرقاڵی یەکتر کرمۆڵ کردنین. کەچی ئەوان لە ماوەیەکی کەمی وەك چل ساڵدا، نێوانی خۆیان و ڕۆژئاوایان پڕکردەوە و گەیشتن بە ئاستێك قسەیان بەسەر ئەم چەرخەدا بڕوات. بەڵێ، ژاپۆن بە دەستپێشخەریی چالاك و، هێزی ئابووری و، توانای وەبەرهێنان و پێگە و ڕێزی لە گشت جێگایەکی جیهاندا، ئەمڕۆ هێزێکی جیهانییە.. ئەو ژاپۆنەی کە یەك لەسەر یەك نوێبوونەوەی لەم شێوەیەی ئەنجامدا و بەڵێنی داهاتوویەکی خۆشگوزەرانتریش دەدات بە گەلەکەی، لە وەرگرتنی هەندێك شت لە دونیای دەرەوە و ڕەتکردنەوەی هەندێکی تردا، هەمیشە بەرامبەر بە ناسنامەی میللیی خۆی ڕاستگۆیانە مایەوە. بۆیە نە مێژووی خۆی بە سووك تەماشا کرد و، نە جوێنی بە ڕابردووی خۆی دا و نە ئینکاریی ڕەگ و ڕیشەکانی مەعنای خۆی کرد. ئەو سەرەتا وەکو وڵاتێکی کەم پێشکەوتوو، هەمیشە بەشێوەیەکی واقیعبینانە لەو شیوە قووڵەی ڕوانی کە لەنێوان حاڵی ئێستای و ئەو لوتکەیەشدایە کە وەك ئامانج چاوی لێبڕیوە و، پڕۆژەی مەعقوولی هێنایە بەرهەم و، باوەڕی هێنا بەوەی تا ئەندازەیەکی باش، دەتوانێت لە ڕێگەی بنیاتنانی کۆمەڵگاکەی لەسەر بنەما ئەخلاقییەکان، هەموو کێشەکانی دواکەوتوویی خۆی چارەسەر بکات و، ئەو بۆشاییەش کە کەموکورتی و پێویستییەکان دروستیان کردبوو، بە غروری میللی و، هەستی ئینتیما و، خەبات و، جوڵەی بەرنامەڕێژ و ڕێکخستنی کاتەکانی کار پڕکردەوە و، هەم توانی لە مانەوە "وەك خۆی"دا سەرکەوتووبێت، هەم بوو بە گەلێك کە لەگەڵ داهێنانە ناوازەکانی سەردەمدا ناوی دەهێنرێت.

لە ڕابردووی نزیکماندا ئێمە هەوڵماندا شارستانێتی لەسەر خودی نیعمەتەکانی خۆی و بەروبوومەکانی خۆی بنیات بنێین، کەچی لە بەرامبەردا وڵاتانی پێشکەوتووی وەك ژاپۆن بیری شارستانییانە و، جیهانبینیی شارستانییانە و، هەڵسوکەوتی شارستانییانەیان وەك بناغەگەلێك وەرگرت و سوودیان لێبینی.. وا گومان دەبەم هەر ئەم تێگەیشتنە چەوت و هەڵەیە هۆکاری سەرەکیی ئەم وەستان و سستییەی ئێمە بێت، لەکاتێکدا خەڵکی لەم سەرکەوتن بۆ ئەو سەرکەوتن دەفڕن. بەڵێ، کاتێك ئێمە شەڕ لەسەر ئەوە دەکەین داخۆ چۆن نیعمەتەکانی شارستانێتی بەدەستبهێنین و لەناو خۆماندا بەشی بکەین، نەتەوە پێشکەوتووەکان هەموو شتێك لەسەر مرۆڤ و، ڕەوشت و، پەروەردە و کلتوور بنیات دەنێن و، هەر جێگایەك ئێمە تێیدا چەقیوین، ئەوان وەك بڵێی بەسەریدا فڕیون و، گەیشتوون بەم لوتکەیەی ئێستایان.

بە واتایەکی تر، کۆی بەروبووم و داهاتەکانی شارستانێتییەك خودی شارستانێتییەکەیە. هەرگیز نابێت ئەوە لەیادبکرێت کە مرۆڤی پێگەیشتوو بنەڕەتترین بناغەی ڕووداوی شارستانێتییە و، گرنگترین کۆڵەکەکەشی نیشتمانی ئازاد و سەربەستە و، بەنرخترین سەرمایەشی کاتە. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەم دینەمۆیانەیان زۆر بەباشی بەکارهێناوە.. ئەوان لەپاڵ بەکارهێنانی ئەم دینەمۆیانەشدا، هەمیشە دابەشکردنی کاریان کردووە بە دەستووریان و، ڕێزیان لە پسپۆڕی گرتووە و، نرخی مرۆڤیان زانیوە و، سەرکەوتنەکانیان خەڵات کردووە و بەخششە خواییەکانیان زۆر بە سەرکەوتوویی بەکارهێناوە. بەپێچەوانەوە، ئەو کۆمەڵگایانەش کە کاتەکانی کاری خۆیان بەباشی

ڕێکنەخستووە و، کارەکانیان دابەش نەکردووە بەسەر تاکەکانیاندا و، پەرلەی نهێنیی دەوڵەمەندییەکانی ژێر زەوی و سەر زەوییان نەکردووەتەوە و، لە نرخی ڕاستەقینەی مرۆڤ تێنەگەیشتوون و، سەرکەوتوو نەبوون لە بەکارهێنانی کات بە باشترین شێوە، بەڵێ، لە کۆمەڵگایەکی لەم جۆرەدا ئەم دینەمۆ هەرە بەنرخانە، وەك ئەو شتە بەنرخانە وان کە کەوتوونەتە دەستی فرۆشیارێکی نەزان و چەشنی هەر شمەکێکی تر تەماشایان دەکات.

ئەو میللەتانەی ئەمرۆ وێنەکەیان لە مێژوو و لە نەخشەکاندا ڕەنگ دەداتەوە، بەیارمەتیی کرداری هەڵسەنگاندن و ڕێکخستنێکی لەم جۆرە و، توانایەکی شیکارکردن و پێکهاتنی لەم شێوەیە و، هاوڕێ لەگەڵ تێبینییە مێتافیزیکی و جۆشوخرۆشە ڕۆحانییەکان، بوون بە کۆمەڵێك دێڕی هێڵ بەژێرداهاتوو لە لاپەڕەکانی مێژوودا. هەر لە براهمانیزمەوە تا بودیزم، لە یەهودییەتەوە بۆ مەسیحییەت، لەویشەوە بۆ ئیسلام، دونیایەك میللەت بە ڕاژەنینیان لە بێشکەی میللەت و، ئیمان و، عەشق و تێبینیی مێتافیزیکیدا، وەك بلێی بەهای بەهەشت ئاسایان بۆ مرۆڤ و خاك دەستەبەرکردووە.

جگەلەوە، ئەوەش ڕاستییە کە ئیسلام چەندین لایەنی تری جیاوازی هەیە بەراورد بە هەموو جیهانبینی و سیستەمە ئایینی و نائایینییەکانی پێشین و پاشین.. بەنزیکەیی لە هەموو سیستەمەکانی تری جگە لە ئیسلامدا، هەر کاتێك باسی نوێبوونەوە هاتووەتە پێش، یەکسەر دینیان لە چەقی ئەو جوڵە و بزاوتنە دوورخستووەتەوە. کەچی لە موسڵمانێتیدا، بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەمە، هەمیشە دین لە چەقی بزاوتنەکاندا بووە

و، ئەرکێکی گرنگی خراوەتە سەر شان و، هەر خەبات و جوڵەیەك ڕوویدابێت، بێگومان بە ڕۆح و بە مەعنای ئەو گۆش بووە و، گەیشتووە بە ئاستێکی وا کە چاوەڕوانیی داهاتوویەکی گەشی لێبکرێت.

ماوەی چەندین ساڵی ڕەبەق، مرۆڤی ئێمە لەگەڵ هەر دەستدانە کارێکدا، چاوەڕێی وەها پزیسکێك بووە لە ڕۆحی دین. هەنووکە، تەنها بریقەی ئەم پزیسکە لە دوورەوە، یان بینینی خەون پێیەوە، بەسە بۆ دووبارە جوڵان و زیندووبوونەوەی ئەو گیانانەی کە چەندین سەدەیە پرتووکاون. بەتایبەت ئەگەر ئەنجامی ئەو هەوڵ و تێکۆشانانە ببینرێت کە لە خۆیاندا گرنگن -هەرچەندە لەئێستادا بێبایەخ دەردەکەون- ئەوا پێم وایە هیواکان بە "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ" دەگەشێنەوە و، ئیرادەکان باڵ دەگرن و، تا لەکۆتاییدا دەگات بە هاتنەدی یەك لەدوای یەکی خەونە دێرینەکانمان. بەمەرجێك لە بەرامبەر نارەحەتییە کاتی و دەستکردەکاندا چۆك دانەدەین و، چاوەڕێی خەڵاتی ماددی و مەعنەوی لەو خزمەتانە نەکەین کە ڕایاندەپەڕێنین و، تەنها و تەنها بیر لە ڕەزامەندیی خوا بکەینەوە...

دیموکراسی و ئازادی تەنانەت بەم حاڵەی ئێستاشیانەوە، میللەتێکی نووستوویان لە بارمتەی غەفلەت ڕزگارکرد و، ئەو هەست و، بیر و هەلومەرجانەیان بۆ ڕەخساند کە پێویستیەتی بۆ بە شارستانیبوون. ئەگەر وەکو میللەت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمری واقیعی ناوخۆیی و دەرەکیدا هاوسەنگییەکان دژی خۆمان نەشێوێنین، لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا دەتوانین ناوی هەستی خۆمان و، بیری خۆمان و، فەلسەفەی ژیانی خۆمان و، شارستانێتیی خۆمان و کلتووری خۆمان بهێنین...

# کێشە کلتوورییەکانمان یاخود "خۆبوون"

کاتێك دەڵێین "خۆبوون"، بێ هیچ گومانێك مەبەستمان لە دەرخستن و بەخولگەکردنی ئەو ناسنامە ناوەکییەمانە کە لەگەڵ میراتی شارستانێتیی خۆمان و کلتووریی خۆماندا هەڵشێلراوە. لەئێستادا لەوانەیە هەندێك لایەن وا بزانن مەبەست لە وشەی "خۆمانە" کۆمەڵێك نمایشی فۆلکلۆریی وایە کە هیچ پەیوەندییەکی بە ڕەگەکانی مەعنای میللیمانەوە نییە، یان ئەو غەریزانەن کە دەرهاویشتەی نەفسانییەتی حەشاماتەکانن کاتێك هەست بە پێویستیی خاڵیبوونەوە دەکەن، یاخود لەوانەیە وابزانن مەبەست لێی مەراسیمەکانی وەك خواردن و، خواردنەوە و ڕابواردن و ئاهەنگ و شایی و بۆنە هاوچەشنەکانیانە. بەڵام ئێمە مانایەکی فراوانتر و گشتگیرتر و قووڵتر بە دەستەواژەی "خۆبوون" دەدەین، ئەویش بریتییە لە دیاردەیەك کە لەناو سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵدا کارایە و، بەدرێژایی مێژوو لە یادەوەری و، شعوور و ویژدانی میللەت خۆراکی خۆی وەرگرتووە تا گەیشتووە بەم ڕۆژگارەمان و، لە هەست و، بیر و، زمان و جیهانبینیی هونەریی نەتەوەدا ڕەنگی داوەتەوە

و نمایان بووە و، لە داب و نەریت و عادەتەکانماندا لەگەڵی ژیاوین بەو سیفەتەی کە گرنگترین ڕەهەندی ژیانمان بووە لە سەرجەم کاتەکاندا .. ئێمە لە گشت بوارەکانی ژیاندا و، لە هەموو وێستگەکانی بوارەکاندا هەستی پێدەکەین، هەر لەو چاودێری و گرنگیپێدانەی لە باوەشی دایکماندا هەستی پێدەکەین هەتا ڕەفتاری جوامێرانەی باپیرانمان کە دەرخەری شەخسییەتی میللیمانن.. هەر لەوەی کە سیستەمی پەروەردەمان ناوەرۆکەکەی ڕۆحێکی میللی بێت هەتا ئەوەی پەروەردەکار باشترین نماینده و جێبەجێکاری ئەم ڕۆحە بێت.. هەر لە شێوازی خۆراکەکانی ناو چێشتخانەمانەوە هەتا هەڵسوکەوتمان لە کێڵگە و باخچەکانماندا.. هەر لە هەستان و دانیشتنمان لە نووسینگەکانماندا هەتا ئەخلاقی پیشەییمان.. هەر لە شێوازی گوتن و نووسینمانەوە هەتا پەیوەندیمان لەگەڵ کەسانی تردا.

لەوانەیە سەرەتا و لە یەکەم ڕوانیندا هەست بە سوودە کرداری و کۆمەڵایەتییەکانی "ژیان وەك خۆمان" نەکرێت. بەڵام لە ماوەیەکی درێژدا و بەتایبەت ئەگەر پێداگریی لەسەر بکرێت، دەردەکەوێت لە هەموو پلەکانی پێشکەوتندا تا چ ئەندازەیەك دارای گرنگی و بایەخە. ئەوەی لەم ماوەیەدا دەکەوێتە سەر ئێمە ئەوەیە کە لەسەر هێڵی دین و دییانەت، داب و نەریت و عادەت -هەڵبەت پێویستە حساب بۆ تەفسیرەکانی کاتیش بکرێت- بەردەوامی بە ژیانی میللیی خۆمان بدەین. لە سایەی ئەمەدا ئەو شتانەی تایبەتن بە ئێمە بە تێپەڕبوونی کات دەبن بە بەشێکی دانەبڕاو لە سروشتمان و، ئەو بەها بێگانانەش کە لە دەرەوەڕا هاوردەمان کردوون، ڕەنگی ئێمە دەگرن و، هەریەکەیان دەبن بە نەخشێکی

گرنگی ژیانی ڕۆشنبیری و کلتووریی ئێمە. ئەو شارستانێتییانەی لە ڕابردوودا لە ڕۆما و، ئەسینا و، میسر و، بابل دەرکەوتوون و ژیرییەکان لە ئاستیاندا سەرسام دەبن و، کلتووری دەوڵەمەندیان چاوان بەر شەوارە دەخەن، لەپڕێکدا و بێ پێشەکی پەیدانەبوون. کلتوور لە هەموو جێگایەکدا، لە دونیای هەست و بیر و لە بناری بەپیتی ویژدانی گشتیدا و، پاش چاوەڕوانییەکی دوورودرێژ لەدایك بووە و، ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە ناوخۆییەکان و، کەم کەم لە کانگا دەرەکییەکان بەخێو بووە و گەشەی سەندووە. لەئەنجامدا بەتێپەڕبوونی کات بووە بە قووڵاییەکی گرنگی سروشتی ئەو نەتەوانە و، گۆڕاوە بە دیارترین ڕەنگی ژیانی ئەوان. پاشان -ئەگەرچی هەموو کاتێك باس نەکرێت و بیری لێنەکرێتەوە- هەر لە پەرستگاوە هەتا قوتابخانە، لە کۆڵانەوە تا ناو ماڵان، لە چایخانەکانەوە تا ناو ژووری نووستنەکان هەموو کونج و سووچێکی ژیانی گرتووەتەوە. بەجۆرێك ئەگەر مرۆڤەکان بەشێوەیەکی هۆشمەندانەش گوێبیستی نەبن، ئەو بە هێزێکی جادوویی کە سنووری ئیرادەکان دەبەزێنێت، دەنگی خۆی دەدات بە گوێیاندا.

میللەتێك بتوانێت بەم ئەندازەیە لەسەر زەمینەی کلتووری خۆی بوەستێت، ئەگەر هەنووکە لەنێو چنگی نەزانی و، هەژاری و، دووبەرەکی و، بێسەروبەری و فشارە دەرەکییەکانیشدا بێت، بێگومان لەگەڵ تێپەڕبوونی کات گەیشتنی بە ئاستێك کە هەموو ئەم قەیرانانە و هاوچەشنەکانی تێبپەڕێنێت، وەك بڵێی دەبێت بە شتێکی سروشتیی و ئاسایی. سەردەمە ناوەڕاستەکانی ڕۆما و، ئەسینا و، میسر و عوسمانییەکان نمونەیەکی باشن لەسەر ئەمە. ئەڵمانیاش -ئەگەر بە سەرکەشییەکی تری هاوشێوەی

جەنگی جیهانیی دووهەم خۆی نەپرووکێنێت- دەتوانرێت بە نمونەیەکی مامناوەند ئەژمار بکرێت.

ئەم وڵاتە پاش جەنگی جیهانیی دووهەم بەتەواوەتی سەرەوژێر و، ئابوورییەکەی خاپووربووبوو و، کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی بێگانەوە و، کۆمەڵگا لە ئەنجامی ئەو بارە دەروونییەی دۆڕان و پەرێشانی سازی کردبوو دابەش بووبوو بۆ سەر چەند دەستە و تاقمێك و، وڵات لەمسەر بۆ ئەوسەر وەك بڵێی بووبوو بە کەمپێکی کراوەی دیلەکان.. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دڵی ئەوان بە دڵسۆزیی میللی لێیدەدا و، "ئەڵمانیای گەورە" خولیای سەریان بوو و، باوەڕی تەواویشیان هەبوو کە تەنها بیر و هێزی بازوویان سەروو زیادە بۆ هێنانەدی ئامانجەکەیان. لەم ڕووەوە ئەگەر بڕیاربووایە ئەڵمانیا لەو مەیدانی مەرگ و لەناوچوونە ڕزگاری ببێت، ئەوا پێویست بوو ئەمە لەسایەی وزەی ژیانی خۆی و کلتووری ڕەگداکوتاوی خۆیدا بێتەدی. لەڕاستیدا هەر وایش توانییان هەستنەوە سەر پێی خۆیان. بەڵێ، ئەو وەکو میللەت ڕووی لە کلتووری خۆی و ڕەگەکانی مەعنای خۆی کرد و، ژیرانە هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و، دەروونیی-کۆمەڵایەتی و، کۆمەڵایەتیی-کلتوورییەکانی هەڵسەنگاند و، یەکێك بوون لەوانەی کە بەباشترین شێوە ڕاڤەی نیو سەدەی پێشوویان کرد بە قازانجی خۆیان.

ئەم نمونەیە ئەم ڕاستییە پیشانی ئێمە دەدات: کورتکردنەوەی کێشە سیاسی و، ئابووری و ئیدارییەکانی وڵاتێك تەنها لە بوارەکانی سیاسەت و، ئابووری و بەڕێوەبردندا، ئەگەر لە ڕوویەکەوە ڕاست بێت، لە چەندین ڕووەوە هەڵەیە. بەڵێ، هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە هەوڵدان و، زانیاری

و پەرەپێدانی پرۆژەگەلی جێگرەوە لە هەموو بوارەکاندا شتێکی تابڵێی سوودبەخشە، بەڵام لام وایە ئەو شتەی لێرەدا پێویستە بە گرنگییەوە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت شتێکی ترە، کە ئەویش بریتییە لە ڕەگ و ڕیشەکانی مەعنا و کلتووری ئوممەت. ئەگەر میللەتێك بڕیاری زۆرانبازی کردنی دابێت لەگەڵ ڕۆژگاری خۆیدا، نابێت لە کۆی چالاکییە کۆمەڵایەتی و، ئابووری و سیاسییەکانی خۆیدا ڕەگەکانی مەعنای خۆی پشتگوێ بخات و، هەرگیز نابێت ئەرکی گرنگی کلتوور لەیادبکات.

ئەوەی ڕاستی بێت لە وڵاتی ئێمەدا و لەگەڵ هەموو "گۆڕان" و "تازەبوونەوە"یەکی نوێدا، گرنگیش بە کلتووری خۆمان دراوە، بەڵام هەرگیز ناکرێت لەم ڕووەوە باس لە پرۆژەیەکی تەمەن درێژ و نەخشەبۆداڕێژراو بکرێت. ئەو قوتابخانە و حوجرانەی دوێنێ کە ئەندازیاری هزر و کرێکاری ڕۆحیان پێدەگەیاند، نەیانتوانی پرۆژەگەلێکی وا بەرهەم بهێنن کە بمانگوازنەوە بۆ داهاتوو. هەر بۆیە لەژێر داروپەردووی وێرانەی خۆیاندا گیانیان سپارد. دەستووری "باسی خراپەی ئەوانەی پێش خۆتان مەکەن." دێت و، دەممان دەگرێت و ناهێڵێت شتی زیاتر بڵێین. ئێمەش دەڵێین "ڕووداوە مێژووییەکان ئەگەر لەیەکیش بچن، هەمان شت نین، بۆیە لەوان پەند وەردەگیرێت نەك وانە." و، ئەو پرسیارانەی بڕیاربوو ئاڕاستەی ئەوانیان بکەین، ڕوویان دەکەینە خۆمان و، دەڵێین "ئەوانەی پێش ئێمە کاتێك لە ئامانج و مەبەستی بوون لایاندا تووشی دارمان بوون. ئەمڕۆ هەمان شت بۆ ئێمەش ڕاستە. کەوایە لەبری سەرقاڵبوون بە گوناهەکانی ئەوانەوە، باشتر وایە لێپرسینەوە لە هەڵەکانی خۆمان بکەین."

با بڵێین ئەوان بێباك بوون بەرامبەر بەو سەرچاوانەی کە ئەوانیان پێدەگەیاند و، بوون بە هۆکاری وشکبوونەوەی ئوممەت، ئەی ئێمە چیمان کرد؟ تکاتان لێدەکەم، ئایا دەتوانین وەك ئوممەت بانگەشەی ئەوە بکەین کە هەموو بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانمان بەجێهێناوە؟ دەتوانین بڵێین کە هەموو دەزگاکانی دەوڵەتمان بەگوێرەی پێویستی و داخوازییەکانی ڕۆژگار خستووەتە کار؟ تکاتان لێدەکەم، کێ دەتوانێت بڵێت کە خوێندنگاکان ئەو شتانەیان بەرهەم هێناوە کە چاوەڕێمان دەکرد؟ لەڕاستیدا گەنجێکی زۆرمان لە شوێنەکانی وەك پاریس و، لەندەن و، میونخ و، نیویۆرك و هاوشێوەکانیان خوێندنی باڵای تەواوکرد، بەڵام ئایا دەکرێت لافی ئەوە لێبدرێت کە ئەمانە هەریەکەیان بوون بە ئەندامێکی سوودبەخش بۆ کۆمەڵگاکەیان؟ بەپێچەوانەوە نەك هەر نەبوون بە ئەندامێکی سوودبەخش، بەڵکو زۆربەیان هاوڕێ لەگەڵ چەندین فەنتازیای جۆراوجۆردا گەڕانەوە و، کەوتنە ژێر کاریگەریی تەوژمەکانی وەك ئەنگلۆساکسۆنیزم و، نازیزم و، سلاڤیزم، یان کاپیتالیزم و، لیبرالیزم و کۆمیونیزم و، دونیایەك کێشەیان لەگەڵ خۆیان بۆ وڵاتەکانمان هێنایەوە.. لە ئەنجامدا بەراورد بە ساڵانی پێشتر، نائارامی ئەوەندەی تر زیادیکرد و، دوورکەوتنەوە لە خود هێندەی تر خێراتر بوو. هێشتا ئومێدمان ماوە کە پشت بەخوا لەمەودوا وا بەردەوام نابێت.

لەڕاستیدا هۆکارەکانی ئومێدەواربوون بەتەواوەتی لەناو نەچوون، هیچ نەبێت لەم سەردەمەدا هەستمان بەوە کرد کە ستەممان لێدەکرێت. تەنانەت ئەم ئەلبومەی کە پڕە لە یادگاریی تاڵ، دەکرێت ببێت بە کانگای ئیلهامی چەندین وێنەی زۆر جیاواز. هەوڵی دروستکردنی پەیوەندیی

دۆستایەتی لەگەڵ فەرەنسا و، ئەڵمانیا و، ئینگلتەرا و ئەمریکا و، نائومێدییەکانمان و، بێچارەییەکانمان و، ئەو ئەزموونانەمان کە لە ئەنجامی جەنگان لەدژی سەدان حاڵەتی نەخوازراو بەدەستمان هێناون، هەموو ئەمانە لەمڕۆدا گۆڕاون بە هێزێکی جددیی مێتافیزیکیی وا کە دەتوانێت کرانەوەیەکی "لە چەقەوە بۆ کەنار" بهێنێتەدی. بەڵام دووبارە سوودوەرگرتن لەم هێزەش بەباشترین شێوە دەکەوێتەوە ئەستۆی ئێمە. خوێندنگا بەئەندازەی گرنگیی خۆی شتی پێبەخشین. ئێستا نۆرەی ئەوەیە کە دەستکەوتەکانی خوێندنگا لە کەمۆڵەی ڕۆحماندا بەباشی بکوتین و، بە بناغەکانی کلتووری خۆمان ئاوی بدەین و، کاتی ئەوەیە ئەو زانست و ئەزموونەماڵی بکەین. چونکە ئەگەر بڕیاری یەکجاریمان دابێت بۆ ڕۆیشتن بەرەو داهاتوو، ئەوا پێویستە لە شوێنی خۆیدا کەڵك لە خەرمانی زانیاری و ئەزموونی خۆمان وەربگرین و، دەبێت بەبێگومانی خاوەنی ئوسلوب و داوەریی ژیریی خۆمان بین. خوێندنگا لەوانەیە ئەزموونی زانستی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سیاسی بە مرۆڤ ببەخشێت، بەڵام ئەوەی کە ئەمانە لە لایەن هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگاوە قبووڵ بکرێن و، سیفەتی مانەوە و هەمیشەیی وەربگرن، پەیوەستە بە تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ ڕەگەکانی مەعنای کۆمەڵگا و پێکهاتەی فیکریی ئەودا. لەم ڕووەوە کێشەی ئەو وڵاتانەی کە هاوشێوەی ئێمە دواکەوتوون، بریتییە لە دۆزینەوەی ڕۆح و مەعنای حەقیقەتی خوێندنگا، تەنانەت لەمەش زیاتر بریتییە لە کێشەی کلتوور. وە پێویستە ئەم کێشەیە لە زەمینەی خۆیدا چارەسەربکرێت. زۆر شت هەن کە لەسەر ڕەحلەکانی خوێندنگاکان بەدەستدێن و دەڕژێنە ڕۆحمانەوە،

بەڵام ئەگەر شتێکی لەمە کاریگەرتر هەبێت، ئەوە دیاردەی کلتوورە و، هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ئەمەش بەرهەمی ژینگە و زەمینەیە.

دەتوانرێت بوترێت کە لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ لە هەموو شارستانێتییەکاندا ژینگە سەرچاوەی بەها "کلتوورییەکان" بووە. دەتوانین ئەمە ناوی "ژینگەی گشتی"شی لێبنێین کە لە هەستەکان و، بیرەکان و، هەڵسوکەوتەکان و، دەنگەکان و، ڕەنگەکان و، ئوسلوبەکان و، شێوازەکان و تایبەتمەندییەکانی تری سروشتی ئوممەت پێکدێن. دەکرێت چەندین بەڵگە بهێنینەوە لەسەر ڕاستێتیی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، بەڵام لێرەدا تەنها دەمانەوێت لەسەر گشتگیریی ئەو کلتوورە هەڵوێستە بکەین کە بەهێزترین دینەمۆیە و، لە لایەن هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگاوە وەك هەوا هەڵدەمژرێت و، وەك ئاو قومی لێدەدرێت و، چەشنی گوڵان بۆنی پێوەدەکرێت و مانەندی سروشت گوێی لێدەگیرێت. تەنها لە گشتگیرییەکی لەم شێوەیەدا کلتوور فراوان دەبێت و دەبێت بە خاوەنی کاریگەرییەکی هەمیشەیی. لەڕاستیدا کاتێك دەڵێین کلتوور یەکسەر پێویستە ئەم تایبەتمەندییە بێت بە خەیاڵماندا. بەڵێ ئەو، بەئەندازەی ئەو کاریگەرییەی لەسەر شوانێك هەیەتی، بەهەمان جۆر ڕۆشنبیرێك و زانایەکیشی خستووەتە ژێر هەژموونی خۆیەوە. ئاو و خاك و هەوا و تیشکی خۆر چەند گرنگ بن بۆ ژیان و بەردەوامیی ژیانی زیندەوەرێك، کلتووریش هەمان شتە بۆ ئەمڕۆ و سبەینێی کۆمەڵگا. بەڵێ ئەو، گرنگترین دینەمۆیە کە تاك و کۆمەڵگا دەگەیەنێت بە کامڵیی نەفسی و ئەخلاقی.

قوتابخانە، لەو ڕوانگەیەوە کە خاوەنی ئامانجی تایبەت بە خۆی بێت و بە ئەندازەی قووڵییەکەی، لەوانەیە ڕۆڵی بەندەرێك و، ڕەمپایەك و مینایەك بگێڕێت، بەڵام ئەمەش پەیوەستە بە هەڵشێلانی واریداتەکانی ئەو لە مەنجەڵی کلتووری ئوممەتدا. ئەگینا ئاشکرایە قوتابخانە ناتوانێت کێشە شەخسی و کۆمەڵایەتییەکان چارەسەر بکات. قوتابخانە، ئەگەر وەك فەرمانگەیەکی پلاندانان و چەشنی سەنتەرێکی نەخشەڕشتن هەندێك پرۆگرام بەناڕاستەی ئەخلاقی گشتی و میراتی میللی بدات بە گوێی ویژدانی گشتیشدا، هەرگیز نەبینراوە کە بە تەنها خۆی شتێکی ئەنجام دابێت. لەم ڕووەوە پێویستە قوتابخانە وەك خۆی قبووڵ بکرێت و شتێکی زیاتر لەوەی دەتوانێت بیبەخشێت لێی چاوەڕوان نەکرێت. هەرچەندە پێویستە دان بە گرنگیی زانستدا بنێین، بەڵام بەستنەوەی هەموو شتێك بە قوتابخانەوە زیادەڕەوییە و، وەکو هەوڵدان وایە بۆ جێکردنەوەی ڕووبارێك لە پەرداخێکدا و، تێگەیشتنێکی عەوامانەی وایە کە چەندین شتی بەڵگەنەویست دەگۆڕێت بە شتانی داخراو و مەتەڵ ئامێز.

کۆمەڵگایەکی مەحکەم و خاوەن داهاتووی گەش لە کۆمەڵێك تاکی پتەو پێکدێت کە لە حوکمی پارچەکانی ئەودان. بەڵام لە ڕوویەکی تریشەوە، تاکی پتەو و خاوەن تایبەتمەندیی بەرز، تەنها لە بنیاتی کۆمەڵگای مەحکەمی لەم شێوەیەدا سەرهەڵدەدەن و پێدەگەن، هەرچەندە ئەمە بەڕوویەکدا لە "بازنەیەکی داخراوی مەحاڵ" دەچێت. بەڵێ، ژینگەیەك کە بە دەوڵەمەندییەکانی ئێمە ئاوەدان بووەتەوە، کاریگەریی لەسەر زانا و نەزان و، گەنج و پیر و، گوندنشین و شاری

و، بیرکەرەوە و ئەوەش کە شوێن ئارەزووەکانی کەوتووە دەبێت و، هەر لەو کاتەوە کە چاویان هەڵدێنن و پەیوەندیی لەگەڵ چواردەوریاندا سازدەکەن، ژینگە و کەشوهەوای دەوروبەریان هەمیشە شتێکیان بە گوێدا دەدەن و، لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکەن و، گفتوگۆیان لەگەڵ دەبەستن و، ئەم زەمینەیە بە خۆی و واریدات و، دەوڵەمەندی و، هەژاری و، توانا ماددی و مەعنەوییەکانی یان ئەوان بەخێودەکات و ئاوەدانیان دەکاتەوە، یاخود هەست و بیریان دەڕمێنێت و هەموو شتێکیان خاپوور دەکات.

کاریگەریی کەشوهەوای ڕۆحی ئوممەت لەسەر کۆمەڵگا و ئەندامەکانی ناوی بەم ئەندازەیە، لەوانەیە هەموو کاتێك هەست بە سەرجەم ڕەهەندەکانی نەکرێت و پەی پێنەبرێت. بەڵام نابێت ئەوە لەیادبکرێت کە هەم لە جیهانی دەروونناسی و هەم لە دونیای فیزیکیدا، زۆر وردەکاریی بچوك هەن بەڕواڵەت بێنرخ دیارن، وەلێ دەرگایان لەسەر چەندین هەڵمەت و، دۆزینەوە و داهێنان خستووەتە سەر پشت. جاری وا هەبووە وەستان و چاودێریکردنی کونی مشکێك لە لایەن پشیلەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دووورودرێژ، شاباڵی بە ویژدانێك بەخشیوە.. ئەو مێشکە بیرمەندانەی سەرنجیان لە کۆمەڵگای -ئەو کۆمەڵگایەی کە ڕێکوپێکی و هەماهەنگییەکەی لە کامڵترینی کۆمارەکان کامڵترە- هەنگ و مێروولەکان داوە، چەندین ئاسۆی نوێ لە بەردەمیاندا واڵا بووە.. وە مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت چەند ڕووداوی بێبایەخ لە جیهانی ماددەدا گڕیان لە ئاتەشپارەی زیرەك و بلیمەتەکان بەرداوە..

سەبارەت بە "ئەرخەمیدس" تاسێکی حەمام و، بۆ "نیوتن" سێوێکی بەربووەوە و، بۆ "ژۆن" ڕێکوپێکیی گشتی و، بۆ "ئەسرەددینی تووسی"

قابلەمەیەك کە لە سەربانێکەوە خل بووەتەوە و، بۆ ئیبن هەیسەم ئاوازی ئەو مۆسیقایانەی شێتەکانی هێوکردووەتەوە و، بۆ "مایکڵ ئەنجیلۆ" دیمەنی سیحرئامێزی هەڵاتنی خۆر و، بۆ "دەنیس پاپین" کوپەیەك ئاو و، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت سەبارەت بە چەند کەسی تری هاوشێوەی ئەمانە، ڕووداوێکی بچوك و سادە، گۆڕاوە بە کلیلی دەرگای نهێنی و ئیلهامەکان..!

لە ڕاستیدا لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی بنیاتی کۆمەڵگا و چاکە و خراپەکانی، کاریگەرییەکی گرنگی لەسەر تاکەکان هەیە، هەرچەندە لەوانەیە هەموو کاتێك عەقڵی ڕواڵەتبین هەست بەمە نەکات. تاکەکان منداڵی ئەو کۆمەڵگایەن کە تێیدا گەورەبوون و، لە کەشوهەوای ئەودا هەموو شتێك دەبیستن و، دەبینن و تێدەگەن. ئەوەی لەم ڕووەوە دەکەوێتە سەر شانی خاوەنانی زانست و عیرفان بەگشتی و بەرپرسان بەتایبەتی، بریتییە لە تەتەڵەکردنی هەندێك لەو تێگەیشتنە بێگانە و زیانبەخشانەی کە کاریگەریی خراپیان لەسەر کۆمەڵگا هەیە و، پێچەوانەی ژیری و، سەرنجدان (مشاهدة) و، ئەزموون و بیری ئایینییە. گەورەترین تەتەڵەکارانی مێژوو پێغەمبەران بوون. دوای ئەوانیش ئەصفیا کە بە ئیلهامەکان ڕاپەڕیون و، و بیرمەندان کە ژیری و دڵیان یەکی گرتووە و، زانایان دێن کە لەپاڵ فیزیکدا گرنگی بە مێتافیزیك دەدەن و، لەگەڵ داوەریی ژیریدا هەستی ویژدانی فەرامۆش ناکەن و، لەتەنیشت ئەزموونەدا گوێ بۆ وەحیی خوایی ڕادەدێرن.

کاتێك حەزرەتی نوح نیشانەی پرسیاری خستە سەر "وەدد" و "سواع" و "یەغوس" و "نەسر" و، حەزرەتی ئیبراهیم یاخی بوو لە بت

و بیرکردنەوە بتپەرستییەکانی چواردەوری و، حەزرەتی موسا ڕاپەڕی لە دژی ستەم و چەوساندنەوە و کۆیلایەتی و، حەزرەتی مەسیح ئەو ماددەیەی ورد و خاش کرد کە چەشنی تابۆیەك تەماشا دەکرا و، مایەی شانازیی بوونەوەرانیش (صَلَّیَ اللّهُ عَلَیهِ وَسَلَّم) لەپاڵ هەموو ئەو شتانەدا کە پێغەمبەرانی پێش خۆی لەپێناویاندا خەباتیان دابوو، جەنگی لە دژی نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانی وەك نەزانی و هەژاری و پێویستی و دووبەرەکی و ناکۆکی و هاوشێوەکانیان ڕاگەیاند کە بە درێژایی مێژوو یەخەی مرۆڤیان بەرنەداوە.. کاتێکیش لە دوای ئەوەوە هەتا ئەمڕۆ نوێکار(مجدد)ەکان و مورشیدە کامڵەکان لەژێر ڕۆشنایی فەرمان و ئیرادە و ڕەزامەندیی خوای گەورەدا تەفسیریان بۆ ژیان کردووە، هەوڵیانداوە هەمان ئەم کرداری هەڵاواردەکردن و تەتەڵەکردنە ڕابپەڕێنن.

بەڵێ، پێویستە بۆ دروستبوونی کلتوور و بەردەوامبوونی، لە لایەك گشتگیربێت و ببێت بە موڵکی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا، لە لایەکی تریشەوە دەبێت بەرامبەر بیرە بێگانە و کۆنەپەرستەکان پەرچەکردارێکی هاوبەش بێداربکاتەوە، تا بتوانین بە تایبەتمەندییەکانی خۆمانەوە بمێنینەوە و، بێ ئەوەی گیرۆدەی گەرداوی خورافە و، بێگانەبوون و ناحەق ببین، بەردەوام بین لەسەر هەنگاونانمان بەرەو داهاتوو.

ئەوە ڕاستە کە کلتوورە جیاوازەکان کار لە یەکتر دەکەن، بەڵام هەرگیز ناگونجێت کلتوورێك -هاودەم لەگەڵ پاراستنی ناوەرۆکەکەیدا- لە جێگایەکەوە بۆ جێیەکی دی بگوازرێتەوە و، وەکو پۆشاکێك لە بەری ئەم دابکەنرێت و بکرێتە بەری ئەو. هەروەك چۆن زیندەوەران لەو

ژینگه‌یه‌دا ده‌توانن پارێزگاری له تایبه‌تمه‌ندییه زینده‌ییه‌کانیان بکه‌ن که تێیدا په‌روه‌رده بوون، کلتووریش ته‌نها ئه‌و کاته ده‌توانێت ئه‌سڵی خۆی بپارێزێت که له لایه‌ن ئه‌و کۆمه‌ڵگایه‌وه که له باوه‌شیدا گه‌وره‌بووه وه‌ك هه‌وا هه‌ڵبمژرێت و، وه‌ك ئاو تینوویّتی بشکێنێت، تا له‌ئه‌نجامدا ده‌بێت به ڕه‌هه‌ندێکی گرنگی ژیانی کۆمه‌ڵ و به‌پارێزراوی ده‌مێنێته‌وه. کاتێك کلتوور له شوێنێکه‌وه بۆ شوێنێکی تر ده‌گوازرێته‌وه، ئه‌گه‌ر پێشتر زه‌مینه‌یه‌کی له‌بار بۆ سه‌وزبوونی ڕێکنه‌خرابێت ده‌مرێت، یان به‌لایه‌نی که‌مه‌وه تایبه‌تمه‌ندییه‌کانی خۆی له‌ده‌ست ده‌دات و ده‌بێت به شتێکی بێکه‌ڵك و بێمانا. هه‌روه‌ك ده‌نگ و، ئاواز و، هێڵ و، وێنه و، شێواز و، ئوسلوبێکی تایبه‌ت به ئێمه هه‌رگیز وه‌کو خۆی ناکرێت له لایه‌ن که‌سانی تره‌وه نوێنه‌رایه‌تی بکرێت، به‌هه‌مان شێوه ئێمه‌ش ناتوانین نوێنه‌رایه‌تیی ئه‌و سیفه‌ته کلتوورییانه بکه‌ین که تایبه‌تمه‌ندن به خه‌ڵکانی تر.

به‌ڵێ، کلتووری ئێمه سه‌رەڕای هه‌موو ڕه‌نگاوڕه‌نگییه‌کانی، هه‌مان ئه‌و مانایانه نابه‌خشێت به که‌سانی تر که به ئێمه‌ی ده‌دات، وه ئه‌و جۆشوخرۆشه‌ی له ئێمه‌دا ده‌یهێنێته گۆڕێ که‌سانی تر به‌و شێوه‌یه ناگرێته‌وه، ئه‌گه‌ر کاریگه‌رییه‌کی دیاریکراویشی هه‌بێت له‌سه‌ریان، هێشتا ناتوانێت به‌شێوه سروشتییه‌که‌ی خۆی، خۆی نمایان بکات. هه‌مان حاڵه‌تی نه‌رێنی بۆ ئه‌و کلتووره‌ی میلله‌تانی تریش ڕاسته که بێ هه‌ڵبژاردن و ته‌ته‌ڵه‌کردن وه‌ریانده‌گرین. چونکه کلتوور شمه‌کێکی وه‌ك تابلۆ و، وێنه و، کاسێت و هاوشێوه‌کانی نییه که پاش دانی پاره‌که‌ی ببرێته‌وه بۆ ماڵه‌وه. ئه‌و، له‌و ڕووه‌وه که خاڵی هاوبه‌شی هه‌موو توخمه‌کانی کات و

شوێنی ئەو ژینگەیەیە کە تێیدا سەریهەڵداوە، گشت(کل)ێکە توانای دابەشبوونی نییە و، تایبەتە بەو زەمینەیەی تێیدا گەشەی کردووە. پێویستە موتاڵایەکی هاوبەش بکرێت بۆ هەموو ئەو توخمانەی لە پشتی کلتوورەوەن، بۆ ئەوەی بتوانرێت سەرجەم ئەو پارچانەی کە کلتوورەکەیان پێکهێناوە و گۆشیان کردووە لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا کۆبکرێنەوە. یەکەم شت کە لەم موتاڵایەدا بەرچاومان دەکەوێت ئەوەیە کە کلتوور بریتییە لە شێوازی ژیانی تایبەتی ئوممەتێك و کۆی هەڵسوکەوتە تایبەتەکانی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە. بێگومان یەکەم شتیش کە لەم ڕووەوە جێی بایەخە ئەو کاریگەرییە دوولایەنەی نێوان فەلسەفەی ژیانی ئوممەتێك و شێوازی هەڵسوکەوتەکانیەتی. فەلسەفەی ژیان چەند ڕەگی داکوتابێت و تا چەند بووبێت بە موڵکی تاك بە تاکی کۆمەڵگا، مانای وایە دووهەمیشیان بەهەمان ئەندازە خاوەنی داهاتووی گەش و سیفەتی مانەوەیە. لە بوونەوەرە زیندووەکاندا جەستە، جوڵەی ئەو خانانەی کە لێیان پێکهاتووە بەئاڕاستەیەکی دیاریکراو دەستنیشان دەکات و، ئەو خانانەش کە بەم ئاڕاستەیەدا دەجوڵێن، وەکو ئەندامانی ئەو کۆمەڵە گشتییە وان کە بەرەو داهاتوو دەیگوازنەوە. کۆی ئەم بزاوتنانە لە چوارچێوەی لێرسراوێتییەکی دوولایەنەدا بەڕێوەدەچێت. بەڵام لەو بوونەوەرانەدا کە خاوەنی ئیرادەن[١]، لە لایەك پلەبەندیی کار و فەرمانبەرییەکان جێگیر دەبێت و، لە لایەکی تریشەوە ڕەخنەکاری و، تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندن لە لایەن ژیریی ساغ و، سەرنجی تەندروست و هەستی ویژدانییەوە ڕوودەدات.

١. بەراورد بە نمونەی جەستە و خانەکان کە پێشتر باسکرا.

ئەمەش باشترین ڕێگایە بۆ یەکگرتنی کۆمەڵگا لەگەڵ فەلسەفەی ژیان و، کەسایەتیی مێژوویی و ئوسلوبی تایبەت بە خۆی و، گۆڕانی بە کۆمەڵگایەکی جێگیر بە ڕابردوو و داهاتوویەوە و، کراوەبوونی بەڕووی ژیری و بیرکردنەوە و وەحیدا. بەپێچەوانەوە ئەگەر قسە بێتە سەر ئەو ڕاهاتنە کلتوورییانەی کە ماوەی کامڵبوونیان تەواو نەبووە و، لە تێکەڵەیەکی عادەت و، دابونەریت و، ڕابواردن و، زەوق و سەفا چنراون و، تەنانەت جاری وایە شێوەی تابۆیەکیان لەخۆگرتووە، ئەمانە هەریەکەیان نمونەیەکی فریودەرن لەسەر نەبوونی کلتوور.

بەڵێ، لەو نەتەوە و شارستانێتییانەدا کە هەژانیان تێپەڕاندووە و گەیشتوون بە جێگیری، بەبەردەوامی کرداری کارتێکردن و کارلەسەرکران، وەرگرتن و بەخشین، لەنێوان چین و توێژەکانی ئەم کۆمەڵگایانەدا ڕوودەدات. بەتایبەت لەو زەمینانەدا کە تێبینییە دیموکراتییەکان بەهەند وەردەگیرێن، هەمیشە جۆرێك لە پەیوەندیبەخشین و وەرگرتنی جددی هەیە لەنێوان ئەوانەی کە لەسەر لوتکەی هەرەمی دەسەڵاتن و ئەوانەش کە توخمی چینەکانی ژێرەوەی کۆمەڵگا پێکدەهێنن. بەجۆرێك هەر لە مامۆستای قوتابخانەوە هەتا وتاربێژی سەر مینبەرەکان، لە نووسەری سەر ڕووپەڕی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە هەتا شیکەرەوەی بەردەم کامێرای تەلەفزیۆنەکان، لەو ئەدیبانەوە کە بە هۆنراوە و پەخشانەکانیان گوزارشت لە خۆیان دەکەن هەتا ئەو وێنەکێشەی کە بەگشتی هەموو بوون و بەتایبەتیش شتان و ڕووداوەکانی دەوروبەری دەگوازێتەوە بۆ ناو وێنەکانی.. بەکورتی هەموو ئەمانە و هاوشێوەکانیان لەژێر کاریگەریی ئەم کار و کارتێکراندان لەگەڵ قسەبۆکراو و لایەنگرانیان. ئەوانەی

کە لە سەرەوە وەك بەخشەر و بەهەمهێنەر ناومان هێنان، بەبەردەوامی ئاماژە و پەیام بۆ چواردەوریان دەنێرن و، بەرامبەرەکانیان بێداردەکەنەوە و، ئامادەیان دەکەن بۆ بزاوتن و، توانا و لێهاتنی ناویان بەرەو ئاسۆی تێگەیشتنی هونەری و پیشەیی خۆیان ئاراستە دەکەن و، ژمارەی بەخشەر و بەرهەمهێنەکان پتر دەکەن. بەجۆرێك ئەو وەرگرانەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان کەم دەبێتەوە دەگۆڕێن بە کەسانی خاوەن ئاسۆی فراوان.

لەکاتێکدا بەخشەر و بەرهەمهێنەکان بەرهەم دەهێنن و دەبەخشن، وەرگرانیش بە چاوی ڕەخنە و هەڵسەنگاندنەوە لە هەموو شتێك دەڕوانن کە لە لوتکەی هەڕەمەکەوە دێتەخوار و، بەرهەڵستیی هەڵەکانی ئەوان دەکەن، یاخود بەرهەڵستی ئەو شتانە دەکەن کە لە چاوی ئەواندا هەڵەیە.. بەم جۆرە هەمیشە فشار لەوانەی سەرەوە دەکەن و ناچاریان دەکەن هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی بەدیل و نوێ بدەن. لەسایەی ئەمەدا هەموو شتێکی تایبەت بە خۆمان پتەوتر دەکرێت و، هەر لادان یان تێکچوونێکی ئوسلوب لە بێژنگ دەدرێت و، هەر ڕەفتارێکی هەڵەش بەمەبەستی تەتەڵەکردن لێپێچینەوەی لەبارەوە دەکرێت. کار و کارتێکران و، وەرگرتن و بەخشینێکی لەم جۆرەش، تەنها بەوە دەبێت کە میراتێکی هاوبەشی وەك کلتوور، ببێت بە موڵکی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا.

بەڵێ، ئەگەر میللەتێك بە سەرجەم چینە جیاوازەکانیەوە وەکو پێغەمبەر دەفەرمووێت "بنیان مرصوص" بێت و، بەتوندی یەکیان گرتبێت و، هێز و وزەی خۆی تەنها لەپێناو بوون و ڕێکوپێکیی بنیاتی ناوەکیی خۆیدا بەکاربهێنێت، ئەوا سەبارەت بەو، شاخ و داخە

سەختەکان دەگۆڕێن بە دەشتاییەکان و، دەشتاییەکانیش بە تەختاییەکی بێ لەمپەڕ. ئیدی سەبارەت بە ئەم میللەتە، بوون بە لایەنێکی بەهێز لە هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکاندا وەك شتێکی ئاسایی لێ دێت. بەڵام هەبوونی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی لەم جۆرە -بەتایبەت ئەگەر خاوەنی کاریگەرییەکی بەهێزیش بێت- دیسان وابەستەی کلتوورێکی میللی وایە کە لە چوارچێوەی تایبەت بەخۆیدا جێگیربووە و، تێکەڵی ژیانی هەموو چینەکانی کۆمەڵگا بووە و گۆڕاوە بە لایەنێکی سروشتی ئوممەت. کلتوورێکی وا کە لەسەر بەها ئەخلاقییەکان دامەزراوە و، ئەوانی هەڵمژیوە و بەوان گۆش بووە و، پاڵی بە هێزی ئەدۆڕاوی دینەوە داوە و لە سایەی ئەمەشدا لە توانایدایە هەموو نامۆبوونەکان بەخود تێپەڕێنێت و، پاڵپشتی لە جیهانبینیی هونەریمان دەکات و، لە گشت جێگایەکدا دەبێت بە پەناگەیەکی ئارام بۆی. ئەگینا کلتوورێك کە چوارچێوەکەی بەباشی دیاری نەکراوە یان پشتگیریی سەرجەم لایەنەکانی کۆمەڵگای بەدەستنەهێناوە، نەك هەر دەوڵەمەند نابێت و ناتوانێت ئوممەتێك لەباوەش بگرێت، بەڵکو لەم حاڵەتانەدا ئەوەی کە هەمیشە کلتوور دەبێت بە ئامرازێك بۆ دژایەتی و یەکترلەناوبردن لەنێوان ئەندازیارەکانی و شاگردەکانیدا، وەکو دەرەنجامێکی حەتمی لێ دێت. جاری وایە دژایەتییەکی لەم جۆرە، بەتایبەت لە بابەتەکانی وەك ئەخلاق و هونەردا، لەوانەیە زامگەلێك دروستبکات کە تیماربوونیان مەحاڵە. هەروەك چۆن جاروبار زیادەڕەویکردن و هەستیاریی لەڕادەبەدەر لە بابەتێکی ئەخلاقیدا هەست و بیرکردنەوەکان دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و، تا لە ئەنجامدا تاك و کۆمەڵگا دەخاتە باوەشی پووکانەوە

و هەژارییەوە، بەهەمان جۆر جاری واش هەیە لەوانەیە لە هونەرەکاندا دەرگا لەسەر نەبوونی ڕێسا و بێڕەوشتی بخاتە سەر پشت و، هەموو شتێك بە فەوزا و بەدڕەوشتی پیس بکات.

کاتێك بیر لە ڕووداوی کلتوور دەکەینەوە، لەبریی سازکردنی زەمینەیەکی زەوق و سەفا و ڕابواردن بۆ ئەو کەسانەی کە هێشتا چالاکیی ڕۆحیان بە یاسا و ڕێساکان ڕێکنەخراوە، پێویستە یارمەتی بدرێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانەی لەمڕۆ و سبەینێدا دێنە ڕێیان و، دەبێت بەرەو بیرکردنەوەی گشتگیر ئاڕاستە بکرێن، تا بگەن بە توانای هەڵبژاردنی ڕاستی و جوانی و چاکی.. بەیارمەتیی ئاڕاستەکردنی جەبری یاخود ئیختیاریی ژینگەی گشتی و پاڵنانی شەپۆلی گشتی -هەڵبەت بە سوودوەرگرتن لە پاڵپشتیی زانستیش- زەمینەیەکی لەبار سازدەبێت بۆ هەڵبژاردنی ڕاسترین و سوودبەخشترینی شتەکان لە لایەن تاکەکانی کۆمەڵگاوە.

بەم جۆرە، کەمێك بەیارمەتیی پەیڕەوکردنی یاساکان و، کەمێکیش لەسایەی ئاڕاستەکردنی ئازادانە یان زۆرەملێی بنیاتی کۆمەڵایەتی، لە خاڵی یەکتربڕی نێوان "ئەخلاقیبوون" و "زانستیبوون" و "چێژی هونەر و جوانناسی"دا، دەبێت بە پەروەردەکاری شێوازی ژیانمان و، دینەمۆی جوڵە و بزاوتنمان و، هەمیشە لە مەیدانەکانی باشی و جوانی و ڕاستیدا تامی سەرکەوتنمان دەرخوارد دەدات. جگەلەوەش لێرەدا چۆنێتیی ڕاڤەکردن و تێگەیشتن لە هەریەك لە ئەخلاق و، ئیمان و، جیهانبینیی هونەری و هەستیی جوانناسی گەلێك گرنگە. مامەڵەکردن لەگەڵ ئەخلاق وەك

ئەوەی کۆمەڵێك یاسای وشك بێت و، باوەڕهێنانێکی کوێرانەی وابێت کە تێیدا حساب بۆ ئیمان و، ژیری و، هەست و، ویژدان و موشاهەدە نەکراوە و، ڕاڤەکردنی جوانی و جوانناسی وەك ئەوەی تەنها بریتی بێت لەو وێنە نیمچەڕووت و پەیکەرە بێگیانانەی که وێنەی چرکەساتێکی کورتیان لە شتان گرتووە و، ترنجاندن و بەندکردنی هونەر لە چوارچێوەی ڕەق و تەقی شیعر و مۆسیقا و شانۆدا.. بەڵێ، هەموو ئەمانە مانای تەسك کردنەوە و بێنرخ کردنی جوانی و کلتووری جوانناسی دەگەیەنێت و دەیکات بە فەنتازیای دەستەیەکی دیاریکراو.

زیندووبوونەوەی خۆمان و کلتوورەکەمان چاوەڕێی ئەو پاڵەوانانەی کە دڵیان بە ئیمان باڵی گرتووە و، ئەو ئەندازیارانەی فیکر کە بە ئاسۆی بیرکردنەوەیان گەشت بەرەو داهاتوو دەکەن و، ئەو بلیمەتانە دەکات کە بە تێگەیشتنی هونەرییان بوون و ڕووداوەکان لەباوەش دەگرن و، بە هەست و تێبینی و سەرنجەکانیان ئاسۆگەلێکی وامان پێدەناسێنن کە زۆر لەم ئاسۆیانەی ئێستامان دوورترن.کرانەوەی زۆرێك لە عاشقانی جوانی بەڕووی ئاسۆ نوێیەکانی جوانیدا و هێنانی تەفسیری تازە بۆی.. هیممەتی بەرزی هونەرمەندە کارامە و شاگردە خەباتکارەکانیان کە شایانی ڕێز و دەستخۆشییە.. ئەو دەنگە خۆشانەی پەلەقاژە دەکەن بۆ دۆزینەوەی ڕۆحی مۆسیقای خۆمان و، بەستە ماناداره‌کانیان کە لە ڕۆحماندا دەگۆڕێن بە ئاوازی شیرین.. ئەو شاعیرە لێهاتووانەی دەستیان کردووە بە بۆنکردنی زەوقی ئەدەبی و هەروەها هەوڵی ئەو پەخشان نووسانەی عاشقی زمانن بۆ دەربازبوون لە لاساییکردنەوە..

بەڵێ، هەوڵی هەموو ئەمانە بەم ئاڕاستەیەدا، سەبارەت بە ئێمە وەك نیشانەکانی سپێدەیەکی ڕاستگۆ وان. ئەگەر ئەو تیشکانەش کە دەیانبینین هەریەکەیان ڕووناکیی سپێدەی درۆزن بن، نابێت گومان لەوە بکرێت کە ئەمەی دوای ئەوان گزنگێکی ڕاستبێژە!

هەتا لەسەر ئەم ئاڕاستەیە بەردەوام بین، ڕۆشنبیریی ڕەگداکوتاومان و، ڕەگ و ڕیشەکانی مەعنا و ڕۆحمان و، کەسایەتی و ناوەرۆکمان، کاتێك وادەی خۆی هات دەبێت بە پارچەیەکی گرنگ و دانەبڕاو لە کلتووری جیهانی. بەپێچەوانەوە ئەگەر وەك ئەوەی تا ئەمڕۆ کردوومانە لەمەودواش بەردەوام بین لەسەر پەروەردەبوون بە سەرچاوەی کلتووریی خەڵکانی تر و، هەر کاتێك بیرمان لە بنیاتنان کردەوە دووچاری لاسایی و چاولێکەری ببینەوە، ئەوا نە لە هۆنراوە و، نە لە مۆسیقا و، نە لە وێنە و، نە لە ئیستاتیکا و لقەکانی تری هونەردا لە ژێردەستەیی ڕزگارمان نابێت. لەحاڵەتێکی لەم شێوەیەشدا هەروەك ناتوانین وەك خۆمان بەردەوامی بە بوونمان بدەین، بەهەمان جۆر ناتوانین بەرزبینەوە بۆ ئاستی بەرهەم هێنان و بەخشین.

بەڵێ، ئەگەر لە ئێستادا پەلە نەکەین لە گواستنەوەی ڕۆشنبیری و کلتووری خۆماڵی بۆ نەوە نوێیەکانمان و، هەرچی زووە ئەم کلتوورە گواستراوەیەش لە ژیانی کرداریدا جێبەجێ نەکەین، ئەوانەی دوای خۆمان مەحکووم دەکەین بە ژیان لە تۆڕی هەمان ئەو چارەنووسە ڕەشەدا کە ئێستا خۆمان گیرۆدەی دەستی ئەوین. لەبەرئەوە، هەموو ئەوانەی لەم بابەتەدا قسەیان دەڕوات و بەتایبەتی ئەندازیارانی فیکر

لە جیهانی کلتووریماندا، پێویستە بە ڕۆحێکی چالاکەوە بکەونە جوڵە و، سەرتاسەری وڵات بگۆڕن بە کارگەیەك بۆ کلتووری ئومەتمان و، هەرچی زووە بیکەن بە قوتابخانەی فەلسەفەی ژیانمان و، تاقیگەیەك بۆ شیکارکردن و پێکهێنانی لۆجیك و داوەریی ژیریی خۆمان. چونکە مانەوەمان وەك خۆمان دیسان بەندە لەسەر زیندووبوونەوەمان وەك خۆمان.

## ژیاندن.. وەك ئامانجی باڵا

هیچ ئایدۆلۆژیایەك هەتا ئەمڕۆ نەیتوانیوە مرۆڤەکان بۆ ماوەیەکی دووررودرێژ بە یەکگرتوویی بهێڵێتەوە. نەك هەر نەیتوانیوە، بەڵکو تەنانەت ئەو هەلومەرج و زەمینانەشی بەتەواوەتی ئامادە نەکردووە کە داخوازیی ئەم یەکگرتنەن. نە ئەو وڵاتانەی ڕۆژئاوا کە هەتا ڕابردوویەکی نزیکیش بەشێکی زۆری دونیایان بەڕێوەدەبرد و، نە گەلانی سۆسیالیست و کۆمیونیستی ڕۆژهەڵات و، نە ئەو بێلایەنانەش کە لە ناوەڕاستدان و، بوون و نەبوونیان وەك یەك وایە.. بەڵێ، هیچ یەکێك لەمانە سەرەڕای هەموو لاف و گەزافەکانیان نەیانتوانی ئاشتی و ئارامییەکی ماوەدرێژ بە جیهان ببەخشن. هەروەك شکستهێنان لە بەخشینی ئەو شتانەی کە پێشتر پەیمانی بەخشینیان لەبارەوە درابوو متمانەی ئەوانەی لە بناغەوە لەرزاند کە وەك وەرگرێك چاوەڕێیان دەکرد، جگەلەوەش ئەو شتانەی وەکو چارەسەر پێشکەشکران نەیانتوانی سیفەتی گەردوونی بەدەستبهێنن و، هەموو مرۆڤایەتییان لەباوەش نەگرت و، لەگەڵ سروشتی مرۆڤ گونجاو و لەبار نەبوون.. هەموو ئەمانە بێمتمانەییان لای هەموو خەڵکی

جێگیرکرد. زیاد لەمەش گومان و دوودڵییان سەبارەت بە هەموو شتێك وروژاند کە لە ئێستا بەدواوە پەیمانی لەبارەوە بدرێت. ئەمڕۆ ئیدی مرۆڤایەتی لەبەرامبەر هەر سیستەمێکەوە پێشکەشی بکرێت لەحاڵەتی کەمێك گومان و ئەندێشە و کەمێکیش گاڵتەپێکردندایە.. چونکە ئەو لەو باوەڕەدایە ئەو سیستەمانەی تا ئەمڕۆ بە زۆرەملێ بەسەریدا سەپێنراون، یان بەتەواوەتی کاریان نەکردووە یاخود کاریان پێنەکراوە. مانای وایە لەسەرجەم ئەم سیستەمانەدا کەموکورتییەکی جددی هەبووە و، ئەمەش هەرچی جوانیی ئەوان هەبووە لەگەڵ خۆی بردوویەتی و، لە بیرەوەریی مرۆڤەکاندا تەنها خەونێکی کاول و خولیایەکی خەمگینی جێهێشتووە.

هەورەك نەبوونی پارچەیەکی بچوك لە سیستەمێکی میکانیکیدا ئەو سیستەمە کامڵە دەگۆڕێت بە داروپەردوویەکی بێنرخ، ئەو ئایدۆلۆژیایانەش کە هاوڕێ لەگەڵ بانگەشەی قەبە خراونەتە مەیدان، لەبەرئەوەی تا ڕادەیەکی زۆر پێچەوانەی سروشتی ئادەمیزاد بوون و، هەموو چینەکانیان لەباوەش نەگرتووە و، نەیانتوانیوە پەیمانەکانیان جێبەجێ بکەن و، وەڵامی داخوازی و پێویستییەکانی مرۆڤیان نەداوەتەوە و، سەرەڕای ئەمانەش بەشێك لە بەها مرۆییەکانیان پشتگوێ خستووە و، تەنانەت هەندێك لەم سیستەمانە هانی ڕق و، قین و، نەفرەتیان داوە لەنێوان مرۆڤەکاندا.. بەڵێ، لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە و چەندانی تریش، لەمڕۆدا زۆربەی زۆری ئایدۆلۆژیاکان گۆڕاون بە خاشاکی فیکری، یان لە لایەن کۆمەڵگاوە بەو شێوەیە تەماشا دەکرێن. بۆیە دەتوانرێت بوترێت ئەمڕۆ بێجگە لە کەمینەیەك، هەموان نائومێد و لەرزۆکن و، لە

چاوەڕوانییەکی گوماناویدان و، بە هیوای چارەسەر چاویان لە دونیای سەروو هۆکارەکان بڕیوە.

لەسەر بنەمای ئەمە، ئوممەتی ئێمە بەتایبەتی و پاشان مرۆڤایەتی بەگشتی، پێویستی بە فیکرێکی باڵای وایە کە ببێت بە نوور بۆ چاوان و، هیوا بۆ دڵان و، دووچاری خەیاڵ شکانی نوێمان نەکات. پێویستمان بە فیکرێکی باڵا یان "غایەی خەیاڵ"ێکی وا هەیە کە لەڕووی عەقڵی و لۆجیکی و هەستەکانەوە بۆشایی تێدا نەبێت و، داخراوبێت بەڕووی ئەو لایەنە خراپانەدا کە لە سەرەوە باسمان کرد و، کاتێکیش هەلومەرجەکان گونجاوبوون توانای جێبەجێبوونی هەبێت لەسەر ئەرزی واقیع. هەنووکە شایەتحاڵی ڕۆژگارێکین کە تێیدا چەقی فیکر و هزرەکان لەسەر زەویدا دەگۆڕێن و، خەڵکان وردە وردە بەشێوەیەکی بنەڕەتی و هەمیشەیی ڕوو لە فیکرەکان دەکەن وەك لە شەخسەکان و، خەڵەتانە یەك لەدوای یەکەکان مرۆڤەکانی ناچارکردووە لە بڕیارەکانی لەمەودوایاندا زیاتر هەستیاربن. ئەگەر بەیارمەتیی هەندێك ستراتیژی ڕاست و دروست سوود لەم حاڵەتە گشتییە وەربگیرێت و، هێزی مێتافیزیکیی کۆمەڵگا و چالاکی و بزاوتنی ناوی لە دەوری ئامانجێکی باڵا بەباشی کۆبکرێنەوە، ئەمڕۆش نەبێت بێگومان لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا زۆربەی مرۆڤایەتی -ئەگەر تا ئەندازەیەکیش بێت- لە چواردەوری ئەم چەقە سەرنجڕاکێشە کۆدەبنەوە.

ئەوەندە هەیە دەبێت پێش لە هەر شتێکی تر ئەو "غایەی خەیاڵ"ە بڵندە دەستنیشان بکرێت. لە داهاتوو و لە ئێستاشدا هەرچەندە زۆر میللەت هەبوون کە خاوەنی سیاسەتێکی دیاریکراو بوون، بەڵام چونکە ئەم سیاسەتانە لەسەر فیکرێکی باڵا و پتەو بنیات نەنراون، هەمیشە

لەرزینیان بەسەر هاتووە و، لە بابەتی ڕۆیشتنە ناو دڵی مرۆڤەکاندا نەیانتوانیوە مەودایەکی جددی ببڕن. هەرچەند ئەم حاڵەتە زیاتر لەو وڵاتانەدا هەستی پێدەکرێت کە لەڕووی شارستانێتی و دیموکراسییەوە خۆیان نەگرتووە، وەلێ ئەو وڵاتانەش کە خۆیان بە مامۆستای شارستانێتی و وەستای دیموکراسی دەزانن حاڵیان لەوان باشتر نییە. زۆر دەوڵەت هەن کە بە ڕواڵەتی ئاڵ و واڵا و باق و بریقیاندا مەزن دیارن، بەڵام دیوی دەرەوەیان چەند بریقەدار بێت و، پڕوپاگەندەکانیش هەرچی بڵێن، لەناوەڕۆکدا لەبری ئەوەی بەڵێنی داهاتوویەکی گەش و ئیرەییبزوێن و، ژیانێکی ئاستبەرز بدەن، دەچێت لە بازنەی تەسکی هەلپەرستی و بەرژەوەندییەکاندا ڕەفتار دەکات و، حەشاماتە غافڵەکان بە فێڵ و تەڵەکەی کاتی دەخافڵێنێت و، ناتوانێت شتێك لەسەر ئاینده بڵێت. لە هەموو ئەمانەش خراپتر دڵ و ڕۆح و ویژدانەکان بە برسێتی دەهێڵنەوە.

ئەمێستا بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەم لایەنە خراپانە، پێویستە لەسەرمان وەك بناغە مامەڵە لەگەڵ بەهاکانی خۆماندا بکەین و، لەو پڕۆژە و بەرنامانەدا کە ڕوویان لە داهاتووە و لەسەر ئەم بناغانە بەرزیان دەکەینەوە، دەبێت هەمیشە شوێنکەوتەی ئەم ئامانجە باڵایە بین، تا پڕۆژەکانمان خاوەنی جێگیری و دامەزراوی بن و، ئەم دوو هێزە بە هەمان ئاراستە و بێ ئەوەی دژایەتیی یەکتر بکەن بەکاربهێنین. چونکە هەر چالاکی و بزاوتنێك چەند دڵسۆزانەش نوێنەرایەتی بکرێت، هێشتا مەرج نییە بنیاتنەر بێت. "نیەت" وەکو ڕەهەندێکی مەعنەویی کارە چاکەکان چەند شایانی ستایش و ڕێزیش بێت، ئەگەر ببێت بە سیفەتی

کارە هەڵە و چەوتەکان، هەرگیز هەمان مانا ناگەیەنێت. جموجوڵەکان لە ڕوانگەی پاڵنەرەکانیانەوە دەکرێت هەم بنیاتنەر بن هەم ڕووخێنەر. لە کار و پڕۆژەکاندا ژیری و لۆجیك و هەستەکان چەند گرنگن، بەهەمان ئەندازە نەبوونی بۆشاییە عاتفییەکان تێیدا و، جێبەجێکردن و نوێنەرایەتیکردنی بەشێوەیەکی تەندروستیش گرنگە. لەوانەیە هەندێك کار دژی یەکتر بوەستەوە و یەکتر لەناوبەرن، ئەگەرچی بە تاکە تاکە هەریەکەیان کرداری باش بێت. کاتێك مێرووڵەکانی شارێك هەوڵی گواستنەوەی هەندێك ماددە دەدەن بۆ ناو کونەکانیان، جاری وا هەیە بەهۆی شەپۆلە عاتفییە کاتییەکان یان جیاوازیی ئامانجەکانیان هەماهەنگیی نێوانیان دەشێوێت و، دەبینین هەندێك بەرەو ئەملا و هەندێکی تریان بەرەو ئەولا ماددەکان دەگوازنەوە. هەرچەندە هەموو هێز و توانای خۆیان دەخەنەگەڕ، کەچی هەرگیز لە ئامانجەکەیان نزیك نابنەوە. بەهەمان جۆر، ئەو کۆمەڵگایانەش کە هیچ ئامانجێکی باڵا و خولیایەکی مەزنیان نییە و، هەیشیان بێت ئامادەباشییەکی زیهنییان لەو ئاستەدا نییە، هەمیشە لە جوڵەدان، بەڵام هەرگیز هەنگاو نانێن. چونکە ڕۆیشتن و هەنگاونان سەرەتا سێ شتی پێویستە: دەستنیشانکردنی ئامانجێکی باڵا کە ویژدان ڕێزی لێبگرێت و، مەیلە ناوەکییەکان بەئەندازەی ئەشوەی عیبادەت ئارەزووی بکەن.. پاشان ڕێکخستنێك کە لە ڕوانگەی ژینگە و هەلومەرجە هەنووکەییەکانەوە کامڵ بێت.. ئنجا ئاڕاستەکردنی هەموو وزە جۆراوجۆرەکان بەرەو خاڵێکی دیاریکراو، ئەمەش بە مانای ئەوە دێت کە خەرمانی زانست و، ئەزموون و وزە شاراوەکانی چین و توێژە جیاوازەکان بخرێنە ژێر فەرمانی ئەو ئامانجە باڵایەوە.

بۆ نمونە لە سەردەمی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیدا هەموو چالاکییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا بەئامانجی بەدیهێنانی "وڵاتێکی ئازاد و سەربەخۆ" چڕبووبوویەوە. هەرچەندە ئەم ئامانجە تابڵێی سادەیە، بەڵام چونکە لە لایەن هەمووانەوە ڕێزی لێگیرا، لە توانایدابوو سەرجەم بۆشاییە عەقڵی و، لۆجیکی و عاتفییەکان پڕ بکاتەوە و، بەس بوو بۆ ئەوەی هەموو بزاوتنەکان لە خاڵێکدا کۆبکاتەوە و، ئەم هێزەش -لە چوارچێوەی هۆکارەکاندا- بەس بوو بۆ هێنانەدی ئامانجەکان. بەڵام لەبەرئەوەی هەموو سەرکەوتنێك سستی و پاڵدانەوە لەگەڵ خۆی دەهێنێت، مانەوەی ئامانجی باڵا وەك یەکەم جار و بێ ئەوەی ڕەنگی بپەڕێت زۆر گرانە. ئەوەی کە ئێمە لەم کارە گرانەدا تا چەند سەرکەوتوو بووین جێیدەهێڵین بۆ مێژوو. ئەگەر کۆمەڵگایەك کە تامی سەرکەوتنی چەشتووە بە کۆمەڵێك هۆکاری نوێ بەخێونەکرێت کە هەمیشە ئامانجە باڵاکانی یادبخەنەوە، بێگومان خاوبوونەوەی هێزی مێتافیزیکی دەبێت بە ئەنجامێکی حەتمی. گەرچی گەڕاندنەوەی ئەم خاوبوونەوەی هێزی مێتافیزیکییە تەنها بۆ ئەو سستی و مەستییەی کە لەگەڵ سەرکەوتن دێت، یان بۆ ئەو تەنگی (قبظ) و، بێپەروایی و بێباکییەی کە جاروبار لە سروشتی مرۆڤدا خۆیان دەردەخەن، لەوانەیە هەموو کاتێك ڕاستی نەپێکێت. چونکە چەند حاڵەتێکی تریش هەن کە دەگونجێت هەمان ئەنجام بخولقێنن، وەك هەڵسوکەوتی گومان بزوێنی پێشەوا و ڕابەران کاتێك ناتوانن متمانە ببەخشن.. سنووردارێی توانا و بەهرەکانیان.. نەبوونی ئاسۆی فراوان لای ڕۆشنبیران، بەجۆرێك نەك هەر ئەودیوی ئەو ئاسۆیە نابینن کە دەیانەوێت میللەتی بۆ سەربخەن،

بەڵکو ئەمدیویشی نابینن.. تێنەگەیشتن لەم دۆخەی ئێستا وەکو ئوممەت تێیدا دەژین و کەموکورتی لە بواری هۆکارەکانی هاندان و پاڵناندا.. پێشخستنی هەلپەرستی و، بەرژەوەندیخوازی و ماکیاڤیلیزم بەسەر بەها دینی و میللییەکاندا.. ئەمانە و چەندەها هۆکاری تریش دەتوانن هەم لە دونیای بیرکردنەوەماندا و هەم لە بزاوتن و جوڵەکانماندا درز و کون بەرهەم بهێنن. ئەمڕۆ ئێمە خۆمان لەبەرامبەر زنجیرەیەك قەیرانی جیاوازدا دەبینینەوە کە لەم ژینگە پڕ لە کێشەیەوە سەرچاوەی گرتووە. هەمیشە لەحاڵێکی هێندە پەرێشانداین وەك بڵێی ئێستا نا ئێستا دەپووکێینەوە و لەناودەچین. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ئەم دۆخە ئیشتیهای دوژمنان دەبزوێنێت و دۆستانیش تووشی نائومێدی دەکات، جگە لەمە ئەگەر بەردەوام بین لەسەر ڕێگەدان بە دروستبوونی درز و کەلەبەری عەقڵی و، لۆجیکی و عاتفی لە ژیانی ئوممەتماندا، لەوانەیە خوانەخواستە هەر بەڕاستی بکەوین. بۆ ئەوەی ئوممەتەکەمان بپارێزین لەو ئابڕووچوون و کارەساتانەی کە بە هاوبەشی لەگەڵ ئەم ڕووخانە دێن، پێویستە هەرچۆنێکمان کردووە ڕزگارمان ببێت لەو حاڵەتانەی کە تایبەتمەندیی وڵاتانی پلە سێیە، وەك بێئامانجی و، لەباری بۆ ڕووتانەوە و، باری دەروونیی ژیان لەژێردەستەییدا. ئنجا ناچارین پشت بە خوا ببەستین و، باوەش بە کارکردندا بکەین و، لە یەکریزی و یەکگرتندا بەدوای سەرکەوتنی خواییدا بگەڕێین و، خۆمان بین و، شوێن ئامانجە باڵاکانی خۆمان بکەوین.

لەم کاتە زریانا ویـیەی ئێستاماندا کە ڕووبەڕووی کەندەڵانی یەك لەدوای یەك بووینەتەوە و، پەردەکان ڕووخاون و، ڕێگاکان کەڵکی ڕۆیشتنیان پێوە

نەماوە و، ئوممەتەکەمان دووچاری کۆمەڵێك تاقیکردنەوەی لەرزپێخەری وا بووە کە بەدەگمەن لە مێژووی خۆیدا بینیویەتی.. بەڵێ، ڕوون و ئاشکرایە کە ئا لەم کاتەدا بە پڕۆژە کۆنەکان ناتوانین سەربکەوین بەسەر ئەم هەموو بارە نەخوازراوەدا. ئەم حاڵەتە نائاساییانە کاتێکی وان کە پێویستیان بە وزەی نائاسایی و هەوڵی دەراسا و سەروو مرۆیی هەیە. وە ئەم حاڵەتانە هەندێك جار بە نەخشەکانی و، پڕۆژەکانی و، ستراتیژەکانی و، بەو ژیرییە بلیمەتانەی کە ئەمانە بەرهەم دێنن و، بەو قارەمانانەیەوە کە لەبری ژیان خۆیان بۆ ژیاندن تەرخان کردووە.. بەڵێ، ئەم حاڵەتانە هەندێك جار بوون بە سەرەتای لەدایکبوونێکی نوێ.

لەبەرئەوە باوەڕمان بە پێویستیی هەبوونی بەرنامە و نەخشەی پسپۆڕانە هەیە و، تەنانەت لەمەش زیاتر هەست بە پێویستیی پێگەیاندنی نەوەگەلێکی نمونەیی دەکەین کە وابەستەی ئامانجی بالای "بوون بە ئوممەتێکی سەربەرز"ن. هاتنەدی ئەم فیکرە ئەگەرچی لە بازنەیەکی تەسکیشدا بێت و، دەرکەوتنی نمونەکانی لەو هەزاران پاڵەوانانەدا کە خانە و لانەی خۆیان بەجێهێشتووە و، هیجرەتیان کردووە بۆ هەر چوار لای دونیا و، هەوڵدانیان بۆ ناشتنی نەمامی "ڕۆحی ئوممەت" لە هەموو جێگایەکدا و، دانانی بەردی بناغەی خەونی داهاتوویەکی گەش لە هەموو گۆشەیەکدا و، نمایشکردنی دونیای ڕۆح و مەعنای خۆیان و، سەرلەنوێ دەرهێنانی شان و شکۆی ئوممەتەکەمان لە قووڵاییەکانی مێژووەوە و، هەوڵدانیان بۆ گرتنەوەی ئەو پێگە لەدەستدراوەی کە پێشتر لەسەر ئاستی هاوسەنگیی جیهانی هەیبوو.. بەڵێ هەموو ئەم هەوڵە دەراسایانە و تا ئەندازەیەکیش سەرکەوتنیان لەم کارانەدا، نمونەگەلێکی

گرنگن لەسەر توانا و وزەی ئەو نەوە نمونەییانەی کە دڵیان وابەستەی ئامانجێکی باڵا کردووە.

ئەم کۆمەڵە فیدایی و خۆنەویستەی کە تاوێك تینوو و تاوێك برسی، بەڵام هەمیشە خاوەنی ئیمان و ئومێد و ورە بوون و، بەگوتەی موحەممەد عاکیف "پشتیان بە خوا بەستووە و، باوەشیان کردووە بە کارکردندا و خۆیان ڕادەستی حیکمەتی ئیلاهی کردووە"، ئەمانە بە یەك هەڵمەت و بە تاقە یەك گورژم زۆرێك لەو کێشانە چارەسەردەکەن کە ئەمڕۆ بەهێزترین وڵاتانی دونیا بەیارمەتیی چالاکیی جۆراوجۆری لۆبییەکانیان و بە سەرفکردنی پارەیەکی خەیاڵی، هێشتا لەئاستیاندا دەستەوەستانن. پێکهاتنێکی نایابی لەم جۆرە پێویستە نە بە بچوك تەماشا بکرێت و، نە بدرێتە پاڵ ڕێکەوت و نە بگەڕێنرێتەوە بۆ پێگەی ئەو دەوڵەتانەی کە هیجرەتیان بۆ کراوە. نهێنیی ئەم بزووتنەوە ناوازەیە بریتییە لە ڕووکردنە خوای گەورە لە لایەن ڕۆحە دڵسۆزەکانەوە و، ئیحسانی زیادەی خوای گەورە بەرامبەر بە میللەتێك کە عیززەتی لە مێژووەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە. بەڵێ، لەم سەرکەوتنە و لە هەر سەرکەوتنێکی تریشدا هەوڵ و تێکۆشان لەو دڵانەوەیە کە بە دڵسۆزی لێ دەدەن و، وەفا لە میللەتەوە و، سەرکەوتنیش لە خواوەیە. هەروەك هەندێك هەڵمەتی دەراسا لەپڕێکدا و لە سەختترین کاتەکانی مێژوودا دەرکەوتوون وەك بڵێی سنگ لە ناچاری و نائومێدییەکان دەرپەڕێنن و، سەرەڕای نەبوونییەکان هەمیشە لەگەڵ جیلوەکانی بووندا نەشونما و باڵایان کردووە، لەمڕۆشماندا ڕۆڵە وەفادارەکانی ئەم ئوممەتە سەرەڕای هەموو دەستدرێژی و، دوژمنایەتی و، بوختان و، تۆمەتبارکردنە ناڕەوا

و دوور لە ویژدانەکان و، وەکو ڕۆیشتنی سوپایەکی بەجەرگ بەدەم پێکەنینەوە بەرەو مەرگ، مەشخەڵی زانست و عیرفانیان هەڵگرتووە. ئەم مرۆڤانە ساڵانێکی دووروودرێژە کە بێ ماندووبوون و وچاندان، پەیامێکی گرنگ لە میللەتی ئێمەوە بە گشت لایەکدا بڵاودەکەنەوە و، ئیمانەکەیان سەرچاوەی هێزێکی نەبڕاوەیە و، کانگای عەشق و شەوقەکەشیان کە ئاوانابێت فیکر و ئامانجی باڵایانە.

ئەوانەی کە گرنگیی بێئەندازەی ئەم دوو دینەمۆیە نازانن، لەبەرئەوەی هەرچەند دەکەن ژیرییان پەی بەوە نابات داخۆ باوەڕ و ئامانجی باڵا مرۆڤ بۆ چ شتانێکی سەرسووڕهێنەر دەداتەبەر، تاوێك هاوڕێ لەگەڵ گومانێکی ئاوێتەی ڕق و قین و، تاوێکیش هاودەم لەگەڵ نەفرەتێکی وڕێنەئاسادا دەڵێن "داخۆ هەموو ئەم شتانە چۆن ڕوودەدەن؟ ئەمانە چ بەرژەوەندییەکیان لەم کارەدا هەیە؟" و، بەم جۆرەش بێبەشیی خۆیان لە بیر و ئامانجە مەزنەکان ئاشکرا دەکەن.

پێش لە هەر شت فیکر و ئامانجێکی مەزن مارشێکە نەوە نمونەییەکان دەخاتە جوڵە و، دینەمۆیەکە وزەی لەبننەهاتووی ئەوان گۆش دەکات و، کانییەکی ڕوون و سازگارە سەبارەت بە عەشق و هەیەجانیان و، زایەڵەیەکە قەدەری ئەوان دەگەیەنێت بە گوێی ئاسمانەکان. لەسایەی فیکرێکی باڵای لەم جۆرەدا، ئەو هەوڵە تاکە کەسییانەی کە گۆڕاون بە بزاوتنی هاوبەش، دەگەن بە قووڵییەکی جیاواز و، ڕیتمێکی جیاواز و، ئەگەر ناچاربووبێت چیا سەختەکانیش ببڕێت، هێشتا ڕێڕەوێك بۆ خۆی دەکاتەوە و لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبێت.

سەروەختێك کە مرۆڤایەتی لەنێو تاریکاییەکاندا پەلەقاژەی دەکرد، یەکەمین موجاهیدەکانی ئیسلام کە هێندەی چنگێك دەبوون، لە ناوجەرگەی بیابانەوە هەڵقوڵان و، بە تاقە یەك هەڵمەت چارەنووسی ڕەشی دونیایان گۆڕی و، لە چاوترووکانێکدا بوون بە دەنگ و سەدای ئومێد و هیوا لە سێ کیشوەردا.. گرنگترین سەرچاوەی هێزی ئەم مرۆڤە مەزنانە ئیمانەکەیان بوو، هەروەها ئامانجی هەرە باڵایشیان گواستنەوەی کەف و کوڵی ئەو ئیلهامانەی سینەیان بوو کە لەم ئیمانەوە سەرچاوەی گرتبوو. لە پشتی ئەو عوسمانییانەیشەوە کە لە دەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە بەرەو ئەنادۆڵ کۆچیان کرد و لە هۆزێکی ئاساییی دەوڵەتێکی جیهانییان دروستکرد، هەمان پاڵنەر و دینەمۆ بوونی هەیە. بێگومان هەمان ئەم شتانەش لە مێشکی ئەو قارەمانانەدا بوون کە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازییان بەرپاکرد. ئەو هەیەجانە مەزنەی کە هیندییەکانی -ئەوانەی کە هەتا ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەم هیچ نیشانەیەکی ژیانیان پێوە نەدەبینرا- بەرەو ئازادی و سەربەستی ڕاپێچ کرد، هیچی تر نەبوو جگە لە ئیمان و ئومێدی ئەو میللەتە و، مانەوە و ژیانیان لە چوارچێوەی فیکری باڵایاندا.

ئەوەندە هەیە ئەو ئامانجە مەزنەی کە لە سینەی مرۆڤەکاندا ئاگرێکی لەم جۆرە خۆش دەکات و دەیانخاتە گەڕ، پێویستە بە کۆمەڵێك یاسای ورد ڕێکبخرێت و ڕێسا تێیدا بەرقەرار بێت. چونکە ئەگەر تۆ ئەندازیارێك بیت و بتەوێت پەیکەرێك دروستبکەیت، دەبێت سەرەتا پارچەکانی ئامادە بکەیت و، لە پتەویی پارچەکانی و، گونجانی هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تردا و، بەشداریکردنی هاوبەشیان لە جوانیی

کۆتاییدا بکوڵێتەوە. ئەگەر بیر لە شایستەیی و گونجاویی ئەو پارچە جیاوازانە لەگەڵ یەکتردا نەکرێتەوە کە "گشت" پێکدەهێنن، گەیشتن بە کاملیی بەرهەم مەحاڵ دەبێت.. بەڵێ، ئەگەر هەوڵ و کۆششی تاکەکەسەکان بەئاراستەی بزاوتنی هاوبەش ڕێکنەخرێن و، پاڵنەرێکی باش ئامادەنەکرێت، بەحەتمی پێکدادان لەنێوان تاکەکاندا ڕوودەدات. بۆیە ڕێسا دەشێوێت و، هەموو جوڵەیەك دەبێت بە دوژمنی دانەیەکی تر و، هەموو شیکارێك وەك لێکدانی ژمارە کەرتییەکان تا بێت بەها و چۆنێتییەکەی کەم دەکات. لەم ڕووەوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، نابێت وزە تاکەکەسییەکان لە ترسی ئەوەی گوایە زیان دەدەن خامۆش بکرێنەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەگەر توانرا یەك مسقاڵیشی لێ بەزایە نەدرێت و، بەرەو ئەو غایەی خەیاڵە ئاڕاستەبکرێت کە پێشتر دەستنیشان کراوە و، نەخلاقی پێکدادان لە ڕۆحەکاندا هەڵبگیرێت و، لە جێگایدا جیهانبینیی پێکەوەژیان و ڕێکەوتن دابمەزرێنرێت. تەنانەت ئەگەر پێویستی کرد هەموو ئەمانە بکرێت بە پارچەیەك لە سروشتی تاکەکانمان.

هەڵە نابێت ئەگەر بوترێت هەموو ئایینەکان -لە چوارچێوەی کار و فەرمانبەرییە گشتییەکەیاندا- بەتایبەتی بۆ چەسپاندنی ئەم جۆرە تێگەیشتنە هاتوون. بۆیە سەرجەم دینەکان کۆمەڵێك ڕێسایان داناوە بۆ ڕێکخستنی توانا و وزە تاکەکەسییەکان و، گۆڕیویانن بە پاڵنەری گرنگ بۆ ئاڕاستەکردنی وزەی گشتی بەرەو ئاوەدانبوونەوەیەکی نوێ و شارستانێتییەکی تازە. ڕابەرایەتیی دین هاوسەنگی دادەمەزرێنێت لەنێوان ئازادی و چالاکیی تاکەکەس لە لایەك و بزاوتن و چالاکییەکانی

کۆمەڵ لە لایەکی تر. بۆیە لەکاتێکدا تاك مافی ئیرادەی خۆی دەدات و ئازادانە ڕەفتار دەکات، هەماهەنگیی جوڵە لەگەڵ کەسانی تردا دەپارێزێت و، لە یەك کاتدا دوو کاری گرنگ ڕادەپەڕێنێت، وەك ئەو هەسارەیەی کاتێك بەدەوری تەنێکی ڕاکێشەردا و بەگوێرەی ئەو دەجوڵێتەوە، لە هەمان کاتدا بەدەوری خولگەکەی خۆیشیدا دەسووڕێتەوە. جوڵە پارچە پارچەکان چەند زیندوو و سەرنجڕاکێش بن، هێشتا ئەگەر بەیارمەتیی ڕێکخستنێکی بەهێزتر و پتەوتر پەیوەندییەکی کامڵ و هاوسەنگیان لەنێواندا سازنەکرێت، نەك هەر بەناڕاستەی مەبەستە گشتییەکە هاوکاریی یەکتر ناکەن، بەڵکو هەندێك جار ئەنجامی خراپتر لە سستی و مەنگی و نەجوڵان بەرهەم دێنن. بەکورتی چ نەجوڵان و چ جوڵەی ناڕێکوپێك هەریەکەیان دوو مەرگی جیاوازن. ئەو میللەتانەش کە تاکەکانی بەم جۆرە مردنانە لەرزیبن بێگومان دەدۆڕێن و دەکەونە دەرەوەی مێژوو.

هەستی براوتنی تەنها لە مرۆڤەکاندا هۆکارەکەی کەمێك خۆپەرستی و، نەزانینی سنووردایی تواناکانی و، ئەو متمانەیەیە کە هەموو کەسێك بە خۆی هەیەتی و، کەمێکیش تێنەگەیشتنە لەو زایەڵەیەی کە یەکێتی و، یەکگرتن و، چالاکیی بەکۆمەڵ و، پێکەوەبوون دەیهێننە مەیدان و، وەك هێزێك وایە بۆ ڕاکێشانی عینایەتی خوایی. سەرەڕای هەموو ئەمانە جاری وایش هەیە ناوبانگ و، پلەوپایە و، بەرژەوەندییە کەسییەکان و هاوشێوەکانیان، جوڵە تاکەکەسییەکان دەوروژێنن.. تەنانەت لەوانەیە کەسانێکی بەدبەختی وا دەربکەون کە بەتەواوەتی ئامانج و ژینگەی

خۆیان لەبیربچێتەوە و، خۆیان بهاونە باوەشی خواردن و خواردنەوە و نووستن و حەوانەوەوە و، لەو ڕێگەی خزمەتە دووربکەونەوە کە سەردەمانێك لەبەر خاتری ڕەزامەندیی خوای گەورە بە هەناسەبڕکێ خەریکی خزمەتکردن بوون تێیدا و، وەك عاشقێك باوەشیان پێیدا کردبوو. کەسێك -هەرکەسێك بێت- ئامانجی لەبیربچێتەوە و مەبەستێکی باڵای نەمێنێت، بێگومان دەکەوێتە داوی خۆپەرستییەوە و، ئارەزووە جەستەییەکان شوێنی عەشق و شەوقی خزمەت دەگرنەوە و، هەستی ژیان لەپێناو کەسانی تردا لەودا دەکوژێتەوە.

لەم ڕووەوە دەتوانرێت بوترێت کە گرنگترین بابەتی ئەمڕۆی ئێمە بریتییە لە سەرلەنوێ گەشاندنەوەی پشکۆی هەستی ژیان لەپێناو کەسانی تردا لەناو ڕۆحی تاکەکانی ئوممەتەکەماندا و، تەتەڵەکردنی ئەو تێبینییە نامۆیانەی کەوتوونەتە نێوان ئەو و ئامانجە باڵاکانی.. پاشان بزواندنی ئەو وزەیەی وادەردەکەوێت سست بوویێت و، ئاڕاستەکردنی بەرەو فیکرە باڵا مێژوویییەکەی بەیارمەتیی پاڵنەری باش و بزاوتنێکی ڕێکخراو و ڕێکوپێك. پێویستە ئەو خاڵە هاوبەشانە دەستنیشان بکرێن کە دەبن بە خولگەی ئەم بزاوتنە بەکۆمەڵەی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا هەر لە گوندنشینەوە تا شارنشین، لە ڕۆشنبیرەوە تا پیشەکار، لە خوێندکارەوە تا مامۆستا، لە گوێگرانەوە تا وتارخوێن.. نمونەی خاڵە هاوبەشەکان بریتین لە: هەوڵدان بۆ کردنی ئوممەتەکەمان بە لایەنێکی بەهێزی هاوسەنگییە جیهانییەکان.. سووربوون و پێداگریی هەموو تاکێك لەسەر بەجێهێنانی ئەم ئەرك و فەرمانە بەبێ ماندووبوون.. ڕەچاوکردنی ئەولەوییەتی فیکر

و، هاوسەنگکردنی لەگەڵ هەستەکانی ڕۆحی ئوممەتدا و، ڕێگەنەدان بە دروستبوونی بۆشایی عەقڵی و لۆجیکی و عاتفی لەم بزاوتنە بەکۆمەڵەدا.. ئەژمارکردنی هەریەك لە عەشقی حەقیقەت و، شەوقی زانست و لێکۆڵینەوە بە هۆکارێك بۆ بەرزبوونەوەی ستوونی بەرەو خوای گەورە و، بەخێوکردنی کۆمەڵگا بە بەردەوامی بەم جیهانبینییە...

لەسایەی لۆجیکێکی لەم جۆرەدا، باوەڕمان وایە ئەو تاکانەی کە خاوەنی هەمان ئامانجی باڵان هەمیشە بە زیندوویی دەمێننەوە و، چالاکییە بەکۆمەڵەکان بە ڕێکوپێکی و هەماهەنگی بەڕێوەدەچن و، بەیارمەتیی پاڵنەرە خێراکان کات و هەلومەرجەکان بە باشتری شێوە بەکاردەهێنرێن و، هەمیشە کراوەش دەبێت بەڕووی نوێبوونەوەدا، چونکە دەرفەتی فراوانبوون بە بیرکردنەوە دەدرێت.

هێنانەدی هەموو ئەمانە نە پێویست بە تەڵقین کردنی تێگەیشتنێکی دینیی نوێ دەکات بۆ موسڵمانان و نە ئەوەی هەموو کەسێك لە سەرەتاوە فێری موسڵمانێتی بکرێتەوە. تاقانە شتێك پێویستە بکرێت ئەوەیە کە گرنگی و، کاریگەری و نەمریی ئەو شتانەی تێبگەیەنرێت کە تا ئێستا فێریان بووە. ئەوەی جێگای داخیشە ئەوەیە کە ڕیوایەتەکان لەم ڕووەوە بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر جیاوازن.. هەوا و هەوەس لەپێش عەقڵەوەن و لە خێوەتی هودادا نیشتەجێن، هەستیش لەسەر تەختی لۆجیك فەرمانڕەوایە.. هەروەك دەکرێت ئەم لادانە لەو بێدینانەدا ببینین کە ئینکار و ئیلحادیان کردووە بە پیشە بۆ خۆیان و، لە هەستان و دانیشتنیاندا هێرش دەکەنە سەر ئایین، بەهەمان جۆر دەگونجێت لەو دەمارگیرانەشدا ببینرێت کە تەنها خۆیان بە دیندار دەزانن و بێبەشن لە ژیانی دڵ و ڕۆح. ئەم دوو جۆرە لە

ئادەمیزاد هەرچەند بەڕواڵەت لەیەکتر جیاوازن، بەڵام لە زیان گەیاندن بە وڵات و گەل و ئاییندا هاوشانی یەکن.

هەردوو جۆرەکە تابلێی بێرێزن بەرامبەر بە ڕۆحی دین و، تا خوا حەزبکات بەرامبەر بە بیرکردنەوەی ئازاد توندن و، هەمیشە داخراون بەڕووی هاوبەشی و بەشکردندا. تاقە سەرمایەی ئەمانە بوختان و، تەزویر و تۆمەتبارکردنە و، باشترین هونەر و بەهرەشیان دەستخستنە بینەقاقای ئەو کەسانەیە کە لە خۆیانی نازانن. گرنگ ئەوە نییە پەنا بۆ کێ دەبەن و پشت بە چی دەبەستن، گرنگ ئەوەیە چۆن ئەوانە وردوخاش بکەن کە حەزیان پێناکەن. لەڕاستیدا ئەو هەوڵ و کۆشش و خەباتەی ئەم دوو کۆمەڵە دەیدەن هێندە گەورە و چڕوپڕە، وا هەست دەکەم ئەگەر لە شوێنی خۆیدا بەکاربهاتایە سەروو زیادبوو بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەموو دونیا.

لە کەشوهەوایەکی تاریکی لەم شێوەیەدا و لە هەرێمێکدا کە بەم ئەندازەیە پڕە لە نەزان و نابینا و دوژمنی بیرکردنەوە، هەڵبەتە ژیانی فیکری و، عەشقی حەقیقەت و، ئارەزووی زانست و لێکۆڵینەوە بوونی نابێت.. بوونیشی هەبێت گەشە ناکات.. گەشەش بکات لە فەنتازیایەك بەولاوە هیچی تر نابێت. ئایا خۆی لەخۆیدا حاڵی پەرێشانمان بە هەزاران زمان ئەمە دەرنابڕێت؟

ئەمە لەحاڵێکدا پێویستە بیری ئێمە وەك ئوممەت بیرێکی ئاوەدانکارانە و بنیاتنەرانە بێت و، دەبێت بەحەتمی ڕزگارمان ببێت لەو هەژاریی بیرکردنەوە و نەبوونی فیکری باڵایەی کە چەند

سەدەیەکە لەناویدا پەلەقاژە دەکەین. ئێمە ئەمڕۆ لە هەر شتێکی تر زیاتر پێویستمان بە ئامانجێکی باڵای وەك زیندووبوونەوە بەیارمەتیی جیهانبینیی شارستانێتیی خۆمان و کلتووری خۆمان هەیە. بەڵێ، بەئامانجی بەرزکردنەوەی پەیکەری ئوممەتەکەمان لەسەر بناغەی بەها مێژوویەکان لە ئایندەیەکی نزیکدا، ناچارین ئارام بگرین لەسەر ڕەنج و ژان و زەمانەیەکی هێندە سەرسووڕهێنەر کە وەختە ئادەمیزاد شێت بکات. ڕێزگرتن لە بەرەوپێشچوونی ڕووداوەکان لە چوارچێوەی سروشتیی خۆیاندا بەندە لەسەر باش ناسینی ئەو سروشتە. قورئان بە پێغەمبەرمان دەفەرمووێت ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ﴾[1] "ئەگەر ئەو جێ و ئامانجەی بۆی دەڕۆشتن نزیك بووایە شوێنت دەکەوتن، بەڵام دووری ڕێ لەسەر جەستەیان سەختبوو" و، بەم جۆرەش دڵی ئەو دەداتەوە و، لە ڕێگا جێماوانیش تەمێ دەکات.

لە ڕوانگەی جیهانبینیی موسڵمانەوە سروشتیترین ئامانجی هەموو بزاوتن و هەڵمەتەکان ڕەزامەندیی خوای گەورەیە، ئیتر پاش بەدەستهێنانی ئەمە، داخۆ سەرکەوتنی ئوممەتەکەمان بۆ ئاستێکی ڕێزلێگیراو لە هاوسەنگییە جیهانییەکاندا و ئەو خزمەتانەش کە بەناوی ئەوەوە پێشکەش دەکرێن بێنەدی یاخود نا، مەبەستی سەرەکی هاتووەتەدی. خۆی لەخۆیدا ئیماندار لە هەموو چالاکی و خزمەتەکانیدا تەنها ئامانجی گەیشتنە بە ڕەزامەندیی ئەو، بەم جۆرەش هەموو ئامانجە گۆڕەییەکانی تری جگە لە ئەو، هەریەکەیان دەبن بە چەند ئامراز و هۆکارێك سەبارەت بە ئامانجە ڕاستەقینەکە.

---

١. سورەتی التوبة: ٤٢.

# تایبەتمەندیی سەرەکیی بیری ئیسلامی

ئیسلام، ڕەگ و ڕیشەکانی ئەبەدییەتێکە کە لە سەروو کات و شوێنەوەیە و، قسەبۆکراوەکەی دڵی ئادەمیزادە کە بەقەدەر پانتایی ئاسمانەکان و زەوی فروانی ڕۆحی هەیە و، ئامانجەکەیشی بەختەوەریی دونیا و ئاخیرەتە.

ئیسلام، ناوی ئەو ڕاستەشەقامەیە کە لە ئەزەلەوە بەرەو ئەبەد درێژبووەتەوە و، ناونیشانی ئەو ڕێسا ئاسمانییەیە کە بۆ هێنانەدیی ئارەزووی "هەتاهەتایی" ڕەگداکوتاوی ناو ناخی مرۆڤ و، بۆ فەتح کردنی هەموو دڵەکان -سەرەتا دڵی بەڕێزترین مرۆڤی سەرزەوی- هاتووە.

ئیسلام، لەو ڕۆژەوەی خێوەتی خۆی لەسەر زەوی هەڵداوە بە هەموو هێزی خۆی ڕووی لە دڵان کردووە و، هەوڵی فەتح کردنی سینەکانی داوە و، وێنەی خۆی لە هەموو ویژدانێکدا کێشاوە و، پاشان داچۆڕاوەتە ناو هەموو بوارەکانی ژیانەوە. بەجۆرێك هەمیشە پەیوەندییەکی ڕاستەوانە هەیە لەنێوان قووڵیی ئەو دڵەکاندا و کاریگەرییەکەی لەسەر هەموو جومگەکانی ژیان. قبووڵکرانی ئەو لە لایەن دڵەکانەوە چەند قووڵ و

ڕەگداکوتاوبێت، ئەوەندەش ڕەنگدانەوەی لە ژیان و لە چواردەورماندا بەهێز و خۆڕاگر دەبێت. تەنانەت دەتوانین بڵێین ئەو ئارەزوو و، شەوق و، قبووڵەی لە چواردەورماندا بەرامبەر بە ئیسلام دروست دەبێت، ڕاستەوخۆ بەندە لەسەر قووڵیی ئەم وێنە ناوەکییە و مەودای بڵاوبوونەوەکەی. واتە ئەم یەکەم قبووڵەی ناو دەروونی ئادەمیزاد چەند قووڵ بێت، کاریگەری لەسەر دەوروبەریشی بەهەمان ئەندازە بەهێز دەبێت و، ژیانی ئەخلاقی و، ئابووری و، سیاسی و، ئیداری و کلتووریی کۆمەڵگاش هەمیشە بەگوێرەی ئەم تێگەیشتنە ناوەکییە هەریەکەیان ئاراستەیەك وەردەگرێت. بەڵێ، کۆمەڵگا و سەرجەم جومگەکانی لە ڕوخساریاندا خەتی تایبەت بەم تێگەیشتنە ناوەکییەیان هەڵگرتووە و، هونەر و ئەدەبیاتیش چەشنی نەخش و ڕەنگە دەرپەڕیوەکانی ئەم ناوەڕۆکە وان و، لە هەموو جێگایەکدا و لە نێوان دێڕەکانی شتان و ڕووداوەکاندا دەنگ و هەناسە و ئاوازی ئەم ناوەڕۆکە دەبیسترێت و، هەموو شتێکی بینراو و نەبینراو بە زمانی ئەو ناوەڕۆکە بێدەنگ و خاڵی لە وشەیە بەستەی نەبیستراومان پێشکەش دەکەن.

لەم ڕووە هەرکاتێك دەمی ئەو دڵانە بکرێنەوە کە بە ئیمان فەتح کراون، ئاوازی جاویدانی بەگوێی بیسەراندا دەدەن و، هەرکاتێکیش چاویان بکەنەوە و لە دەوروبەریان بڕوانن، واهەست دەکەن لەو ڕێڕەوە زومرووتییانەدان کە ئەوسەریان دەگات بە بنارەکانی بەهەشت و، ناڕەحەتیی ڕێگاکەیان تێکەڵ بە بەختەوەریی کۆتایی ڕێگەکە دەکەن و، لە هەر جێگایەکدا خەڵکی بڵێن "ئاخ و ئۆف!"، ئەوان بەدەم وتنی "ئۆخەی.. ئۆخەی!"ەوە ملی ڕێگا دەگرنەبەر.

وشەی نهێنیی فەتحکردنی دڵەکان ڕستەی (لا اله الا اللّه محمد رسول اللّه)یە. بەجۆرێك هەموو تایبەتمەندییەکانی باوەڕ لە ئیسلامدا، لە شێوەی دوو ڕووی یەك حەقیقەت و، چەشنی پەیوەندیی نێوان هۆکار و ئامانج، لەسەر بناغەی ئەم دوو ڕستە کورتە دامەزراون. درەختی توبای بەهەشت لەم تۆوەوە سەوز دەبێت و، بە میوەکانی مەعریفەت، ئاسمانی هەست و شعوور و تێگەیشتنی ئادەمیزاد دادەپۆشێت و، لەئەنجامدا هەموو زانین و مەعریفەتەکان بەیارمەتیی هەستێك و هەڵمەتێکی ناوەکی دەگۆڕێن بە عەشق و، شەوق و، ئارەزوو و، لە هەموو لایەکەوە دەوراندەوری مرۆڤ دەدەن و، لە ئەودا پێکهاتنێکی نوێ دەهێننە مەیدان کە خولگەکەی ویژدانە و، ئەمەش لە هەموو هەڵسوکەوتێکی ئەو کەسە عاشق و موشتاقەدا خۆی نمایان دەکات. عیبادەت و گوێڕایەڵیی کەسێکی لەم جۆرە درەوشانەوەی ئەم پەیوەندییە و ئەم عەشق و شەوقەن و، پەوەندییە مرۆییەکانی ڕەنگدانەوەی ئەم لەدونییەتەن و، تێکرای چالاکییە کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سیاسی و ئیدارییەکانی لە دەوری ئەم چەقەهێزە دەخولێنەوە.. کارە هونەری و کلتوورییەکانی بەهۆی ئەم دینەمۆ ناوەکییەوە شکڵ و شێوە وەردەگرن و، دەکرێنەوە و هاوڕێ لەگەڵ شێوە و ئەدای دڵدا دێنە مەیدان. ئەگەر ئەم بەرهەمە هونەرییەی کە دێتە گۆڕێ کتێبێك، وێنەیەك، شیعرێك یان بەستەیەك بێت، هەموو ئەمانە خۆراکیان لەو نمونە ناوەکییە وەرگرتووە و، هەست و ئیدراکی دڵ دێننە سەر زمان و، دەربڕین لەو هەیەجان یاخود لەو کسپەکسپە دەکات کە لە واریداتی دڵی خاوەنی بەرهەمەوە سەرچاوەی گرتووە، هەروەها عەشق و ویساڵ یاخود هیجرانی ئەو دەردەخات. هەروەك ئەمە وایە، ڕۆحێکیش کە لێوانلێوە لە ئیمان و، مەعریفەت و، خۆشەویستی

و چێژی ڕۆحانی، لە هونەر و کلتوور یان لە هەر چالاکییەکی تردابێت، وێنەی ناوەکیی خۆی نمایش دەکات و، پەیوەندیی نێوان "مرۆڤ-گەردوون-خوا" کە لە قووڵایی دەروونیدا وەکو کاکڵەیەك و پوختەیەکی لێهاتووە دەهێنێتە سەر زار و، هەمیشە لە هەوڵی ئەو مانایانەدایە کە لە قووڵایی دەروونیدان.

لەوانەیە مرۆڤ لە هەموو حاڵ و کاروبارەکانیدا بەدوای ئەم مەبەستەدا نەگەڕێت، بەڵام سیستەماتیزەبوونی باوەڕ لە دڵیدا هەمیشە سەرجەم هەڵسوکەتەکانی -ئیرادەی خۆی لەگۆڕێدا بێت یان نا- بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو دەداتەبەر. هەربۆیە شتێکی سروشتییە کاتێك نەخش و شێوەی ئەم دینەمۆ ناوەکییە لە شێوازی ژیان و، ئوسلوب و، کەسایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کەسێکی لەم جۆرەدا ڕەنگ دەداتەوە. هەروەها هەمان شێوە و هەمان ئوسلوب لە چالاکییە هونەری و کاروبارە کلتوورییەکانیدا بەرچاو دەکەوێت. چونکە پێش لە هەر شتێکی دی پێگەی ئادەمیزاد لەناو بووندا و، ئامانج لە بەدیهاتنی و، مەبەست لە چالاکییەکانی و، هەموو ئەو داخوازییانەش کە لەسەر ئەم ئامانج و مەبەست و بەرپرسیارێتییە کەڵەکە دەبن، بەتێپەڕبوونی کات هەموو بوونی ئەو دەگرنەوە و، هەموو کاتێك لەبەرامبەر ئەو بوونە هەرە بەرز و مەزنەوە، هاوڕێ لەگەڵ تازەترین و زیندووترین و کاریگەرترین هەستەکاندا بەرەو جیاوازی ئاڕاستەی دەکات.

ئەم سیستەماتیزەبوونی باوەڕە کاتێك لە دڵی ئیمانداردا بەتەواوەتی چەکەرە دەکات، ئیدی کاریگەری لەسەر چالاکییە زیهنی و، فیکری و زانستییەکانی دەبێت و، لەودا دروستبوونی سروشتێکی دووهەم دەستەبەر

دەکات و، ئەمەش خۆی لە هەموو کاروبارەکانیدا هەر لە باوەڕەوە تا عیبادەتەکان و، لە ئەخلاقەوە تا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لە پەیوەندی لەگەڵ خوای خۆیدا هەتا هەڵسوکەوتەکانی، خۆی نمایان دەکات. بەکورتی مرۆڤی ئیماندار بەئەندازەی بڵاوبوونەوەی ئەم یەکەم بەهرەیە لە ناخیدا چوارچێوەی دونیای ڕاستەقینەی خۆی دەکێشێت.

بەڵێ، کەسێکی لەم جۆرەی کە ڕووی لە لوتکەکانی ژیانی دڵ و ڕۆح کردووە، ڕوون و ئاشکرایە چۆن بیردەکاتەوە و، چۆن ڕەفتار دەکات و، چۆن هەڵدەسووڕێت و، لە عیبادەتەکانیدا چەند جددی دەبێت و، لە بابەتە ئەخلاقییەکاندا چەند هەستیار دەبێت و، چەند کراوە دەبێت بەڕووی چاودێریکردن و لێپرسینەوەی نەفسی خۆی و، چەند هەست بە لەرز و بێز دەکات بەرامبەر بە گوناه و تاوانەکان. کەسێك کە بەم ئەندازەیە هەست و بیرکردنەوەکانی ڕەگیان داکوتیوە، ئیدی سەبارەت بە ئەو ژیان و سەرجەم بوارەکانی وەك ڕووبارێك کە ڕێڕەوی خۆی دیوەتەوە، هەمیشە بە ئامانجی گەیشتن بە زەریا لە شەپۆلدان بەردەوام دەبێت و، ئەویش لەناو ئەم ڕووبارەدا هەردەم هەست بە چێژی عەشق و بەیەکشادبوون دەکات. ئیمان بەئەندازەی قووڵی و کرانەوەکەی، دینەمۆی سەرەکیی ئەم مرۆڤە پڕ لە بزاوتنەیە و، عیبادەت هێزی یارمەتیدەر و پارێزەریەتی و، ئەخلاق و سەرجەم پەیوەندییە مرۆییەکان نیشانەی جوداکەرەوەی ئەون و، کلتوور گرنگترین ڕەهەندی سروشتیی ئەوە و، هونەریش ڕەنگدانەوەی لێکۆڵینەوە و، چاودێری و، هەستی ناوەکی و موشاهەدەی ناوەکییەتی.

هەرچەندە شوێنی سەرەکیی ئێرە نییە بەڵام حەزدەکەم بڵێم کە هونەری ئیسلامی بەوەدا کە پەتی (تجرید)ی کردووە بە تەوەرەی خۆی و بەدوای

فرەڕەنگی (تلون)دا دەگەڕێت، ئەوا فراوانییەکی جیاواز لەخۆدەگرێت. لەکاتێکدا جەخت لەسەر تەوحید دەکاتەوە، بەئاشکرا دژایەتیی خۆی بۆ شوبهاندن (تشبیه) و (تجسیم) دووپات دەکاتەوە و، لەو ڕووەیشەوە کە هەمیشە دەرگای ڕاڤەکردن بەکراوەیی جێدەهێڵێت، هەوڵدەدات لە دڵۆپدا دەریامان پیشان بدات و، لە گەردیلەدا وێنەی خۆر بکێشێت و لە وشەیەکیشدا کتێبێك دەرببڕێت. هەرچی کلتووری ئیسلامییشە کە لەژێر کاریگەریی ئەم دینەمۆ بنەڕەتی و ئەم بناغە سەرەکییەدا گەشەی کردووە -با لێرەدا و لەئێستادا بابەتی ئەو ڕاستییە نەوروژێنین کە کلتوور میراتی هەموو مرۆڤایەتییە بەگشتی- ئەوا کراوەیە بەڕووی هەموو چالاکییە فیکری و زیهنییەکانی پەوەندیدار بە واقیعی ئادەمیزاد و، پوختە و پێڕستێکە بۆ تێکەڵەی هاوبەشی ئەو چالاکییانە. ئێمە لەودا بەوپەڕی زیندوویی هەست بە هەموو ئەو شتانە دەکەین کە لەدوێنێ و ئەمڕۆدا تایبەتن بە خۆمانەوە و، گەشەی پێدەدەین و دەیسپێرن بە ویژدانی گشتی کە نرخشناسە و قەدری دەزانێت.

لەم ڕووەوە ئەو شتەی ئەمڕۆ دەکەوێتە سەر شانی ئێمە تەنها و تەنها بریتییە لە پارێزگاریکردن لە کەسایەتیی خۆمان و، ڕووکردنە کلتووری خۆمان و بەرهەمە کلتوورییەکانمان، هاوڕێ لەگەڵ وابەستەبوون بە سیستەمی باوەڕ و بیرکردنەوەی خۆمانەوە.. هەروەها ئەگەر پێویستی کرد داتاشراوەی نوێی بیرکردنەوە و عیرفان لەسەر هەمان نەخشەی فیکریی خۆمان دابمەزرێنین. بەڵێ، پێویستە چەند لە توانامان‌دا بێت پەیوەست بین بە سەرچاوەکانی خۆمانەوە و، بیر لەوە بکەینەوە کە تەنها لە ڕێڕەوی میللیی خۆمانەوە بگەین بە زەریا و، لەژێر ئاسمانی خۆماندا

تەماشای بوون بکەین و، چەشنی کتێبێك بیخوێنینەوە و، ڕاڤەی بکەین و، زانیاریی نوێ و تێبینیی تازە بهێنینە مەیدان.

ئەوەش ڕاستییە کە ئیسلام دەرگای هەتا سەر پشت کراوەیە بەڕووی بەهای میللەتانی تردا. ئیسلام، بەدوای شتە سوودبەخشەکاندا دەگەڕێت ئەگەر لەوپەڕی دونیاش بێت و، دەیدۆزێتەوە و دەبێت بە کڕیاری. بەڵێ، هەروەك چۆن سەردەمانێك بەبێ ئەوەی گوێ بدات بە سەرچاوەکەیان سوودی لە فیزیا و کیمیا و ماتماتیك و فەلەکناسی و ئەندازیاری و پزیشکی و کشتوکاڵ و پیشەسازی و تەکنەلۆجیاکانی تر وەرگرت و، بەرەو پێشەوەی بردن و سپاردنی بە نەوەکانی داهاتوو، بەهەمان جۆر ئەمڕۆش هەموو شتێك -بەمەرجێك شیاوی وەرگرتن بێت- لە هەموو کەسێك وەردەگرێت و، ئەگەر بتوانێت گەشەی پێدەدات و، ڕادەستی میراتگرانی نوێی دەکات.

لەڕاستیدا بوون بە جێنشینی خوا لەسەر زەوی داخوازی ئەوەیە کە موسڵمان هاوڕێ لەگەڵ عەشقی حەقیقەت و، ئارەزووی زانست و شەوقی لێکۆڵینەوە کاربکات و، فێرببێت و، لە هەموو بوارێکدا ببێت بە خاوەنی پسپۆڕی و کارامەیی. بەڵام ئەوەندە هەیە لە بابەتەکانی پەیوەندیدار بە سیستەمی باوەڕ و بیرکردنەوە و، قورئان و سوننەت و پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی موحەممەد و ژیاننامەی پیرۆزی ئەو و، میتۆدی مێژووی ئیسلامی و، هونەر و، ئەدەبیات و بابەتەکانی تری هاوشێوەیاندا، ئیماندار ناتوانێت سەرچاوەگەلی دەرەکی بە بناغە قبووڵ بکات، چونکە ئەو کەسانەی کە بیرکردنەوەیان لەسەر بنەمای دوژمنایەتیی ئیسلام دامەزراندووە، یان بەلایەنی کەمەوە، ئیسلامیان

وەك ڕووداوێکی زەمینی بینیوە و بەو شێوەیەش پیشانی خەڵکی تریان داوە.. ئەم جۆرە کەسانە هیچ گریمانێك نییە کە گومان و نیەتی باشیان بەرامبەر بە ئیسلام هەبێت و، دوعاگۆی خێرین بۆ موسڵمانان و، ئارەزووی پێشکەوتنیان بکەن. هەرچی ئەو زانست و تەکنەلۆجیایەشە کە دەکەوێتە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیەوە، ئەمانە هەروەك لە سەرەتای مێژووەوە تا ئەمڕۆ لەنێوان میللەتاندا دەستاودەستیان پێکراوە، لەمڕۆ بەدواوەش ئەم بەخشین و وەرگرتنە بەردەوام دەبێت و، ڕادەستی میراتگرانی نوێ دەکرێت. چونکە زانست و تەکنەلۆجیا پەیوەندییان بە دین و میللەتەوە نییە. لێرەوە ئەو کۆمەڵگایانەی کە توانیویانە لەسەر ئاستی هەست و بیر و باوەڕ مەحکەم بن و قنج بەپێوە بوەستن، ئەگەر لەدەستیان بێت هەموو ئەو زانستە سوودبەخشانەی پێشتر باسکران لە ڕۆحیاندا وەك پەمووی بەردەستی هەلاج شیدەکەنەوە و، دەیانگۆڕن بە دەنگ و هەناسەی دڵیان و، کۆمەڵێك ئامراز بۆ گەیاندنی مرۆڤەکان بە خوا.

لەبەرامبەر ئەم نەرمی و توانای کشانەی کە لە دونیای بیرکردنەوەی ئێمەدا هەیە، ئەو شتەی کە جێگەی داخە ئەوەیە کە فەلسەفەی زانست و میتۆدۆلۆجیی زانست لە ئەوروپا، لەبەر هەندێك حاڵەتی تایبەت، بووە بە هۆکاری ڕکەبەرایەتییەکی هەمیشەیی لەنێوان زانست و دین و، جیابوونەوەی عەقڵ و دڵ لە یەکتری لە سەرتاسەری ڕۆژئاوادا. ئەمەش هۆکاری سەرەکیی هەموو ئەو قەیرانە بەردەوامانەیە کە چەندین سەدەی ڕەبەقە سەرجەم سیستەمە ڕۆژئاواییەکانی گیرۆدە کردووە. لەمەش زیاتر، ئەم سەنگەرە زانستی و فەلسەفییەی کە سەرەتا تەنها دوژمنایەتیی دۆگماکانی ئەو دامەزراوانەیان دەکرد کە بەڕواڵەت ئایینی

بوون، بەتێپەڕبوونی کات گۆڕا بە هەڵمەتێك لە دژی هەموو جیهانبینییە ئاینییەکان و، بوو بە پارێزەری بێباوەڕی و ئیلحاد. بەداخەوە لەم شێوازە دوژمنکارانەیەی کە هەموو ئایینەکانی گرتەوە، بیروباوەڕی ئیسلامیش -هەرچەندە بەتەواوەتی بێتاوانە- بەشی خۆی بەرکەوت و، ئەویش هاوڕێ لەگەڵ ئەوانەدا کە شایانی ئەم هێرشە بوون لەسەر کورسی گومانلێکراو ناچار بە دانیشتن کرا و، دووچاری دڕندانەترین و بێویژدانترینی ستەم و مافخوران کرایەوە.

ئەم بزووتنەوەیەی کە لە سەرەتادا بەناوی بیرکردنەوەی ئازاد و زانستەوە لە دۆگماکانی ئەو دامەزراوە بەناو ئاینییانە ڕاپەڕی، گۆڕا بە دوژمنایەتیی بەرامبەر بە خوا و دین و دینداری و، بوو بە هەڵمەتی بێدەنگ کردن و، تۆقاندن و، فشار و تەنانەت لەناوبردنی سەرجەم دینداران لە هەموو گۆشەیەکی سەرزەویدا. هەرچەندە جیهانی ئیسلامی لە ڕوانگەی بنەما و بناغەکانی خۆیەوە هیچ کاتێك کێشەی پێکدادانی نەبووە لەگەڵ زانست و بیرکردنەوەی ئازاددا، کەچی هەندێك لە دوژمنانی دین چاویان لەئاستی ئەم جیاوازییەدا نوقاند و، بەراوردیان کرد بە مەسیحییەت و، هێرشی ناحەق و بێشەرمانەیان کردە سەری...

لەحاڵێکدا ئیسلام هەر لە یەکەم ڕۆژەوە ڕێسایەکی نوێ و بێوێنەی ژیانی پێشکەشی سەرجەمی مرۆڤایەتی دەکرد. هەروەك ئەم ڕێسایە لە ڕابردوودا وێنەی نەبووە، بەهەمان شێوە هێما و ئاماژەیەکیش بوو بۆ بێهاوتایی و ناوازەیی ئەو لە داهاتوودا. چونکە ئەو لەڕێگەی ئەو بناغانەوە کە هێنابوونیە مەیدان، سەرلەنوێ ژیانی ئادەمیزادی ڕێکدەخستەوە و، تەفسیری نوێی دەربارەی دونیا و جیهانەکانی پاش

دونیا و، فیزیك و میتافیزیك دەهێنا و، لە ڕوانگەی تایبەتمەندیی دیاردە (Phenomen)ەکانەوە و بەشێوەیەکی تەواو جیاواز پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و گەردوون و بەدیهێنەری ڕێکدەخستەوە و، کۆتایی بە دژیەکی و ناکۆکیی ناوەکیی ئیلاهییات دەهێنا. ئەو بەهایانەی ئەو هێنانی، وەڵامی هەرە دڵنیاییبەخشی سەبارەت بە ژیان و مەرگ پێشکەش بە هەموو چاوەڕوانی و ئاواتەکانی مرۆڤایەتی کرد و، هیچ بۆشاییەکی عەقڵی و، لۆجیکی و، فیکری و عاتفی لە دڵ و ژیریی قسەبۆکراوەکانیدا نەهێشتەوە. ئەو، هەموو لا و ڕووەکانی زیندوو بوو، کاتێك دەهێنرایە نێو ژیانەوە دەکرایەوە و بڵاودەبوویەوە و فراوانی بەدەست دەهێنا و، هەرگیز بەو گرفتانەی دەهاتنە بەردەمی، نەیدەوت "بەیانی وەرەوە!". هەتا ناو داڵانە هەرە تەسکەکانی ژیانی شەخسی و، خێزانی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سیاسی و کلتووری دەڕۆیشت و، هاوڕێ لەگەڵ دەنگ و ڕەنگ و هەناسەی ڕۆژگار و سەردەمدا بە هەموو بوارەکانی ژیاندا دەهات و دەچوو و، لە سەرجەم جومگەکانیدا بەهێزتر لە پتەوترین و واقیعیترینی شتەکان خۆی نمایان دەکرد.

ئیسلام، "ئایدیالیزم"ێکیش نەبوو بە مانا ڕۆژئاواییەکەی، چونکە ئایدیالیزم ئەو خۆرە خەیاڵییە بوو کە بەسەر پێدەشتەکانی ئەودیوی چیای قافدا هەڵدەهات. خۆرێکی وا کە هەرگیز تیشکەکانی ناگەن بەم جیهانە واقیعییەی تێیدا دەژین و ناتوانێت لە بچوکترین جومگەی ژیاندا گوزارشت لە خۆی بکات. ئەو بە تیشکە درۆیینەکانی وەکو یوتۆپیاکان بەر خەیاڵەکان دەکەوت و، دەشکا و، لە شێوەی چەند خەونێکی شیریندا و تەنها لە دوورەوە دەیتوانی تەماشای ژیان و واقیعەکانی ناو ژیان بکات.

ئەمە لەحاڵێکدا ئیسلام ڕێسایەکی وای پێشکەش بە ئادەمیزاد دەکرد کە ڕەگەزەکەی تەنها لە خۆیدا قەتیس مابوو[1] و، دەکرا لە هەموو زەمینە و هەلومەرجێکدا جێبەجێ بکرێت و، لە جێبەجێکردنەکانیشدا چەندین ڕێگای جێگرەوەی دەخستە پێش چاو. ئەوانەی گوێبیستی بانگەوازەکەی ئەو دەبوون، لەبەرامبەریاندا ڕەنگ و شێوەی ڕێسایەکیان دەبینییەوە کە لەگەڵ سروشتی خۆیاندا لە یەك مندالْداندا گەشەی کردبوو. ئەو، هەر لە یەکەم قبووڵکردنی ویژدانەوە هەتا بابەتە ئەخلاقییەکانی ئەوپەڕی ژیان، بە فراوانییەك کە هیچ بابەتێك فەرامۆش ناکات، لە کێشە هەرە بچوکە شەخسی و خێزانییەکانەوە هەتا بابەتە هەرە داخراوە کۆمەڵایەتییەکان و، لە هەموو باس و خواسەکاندا چارەسەری جیاوازی پێشکەش دەکرد و، تەنانەت لایەنگرە هەرە هەناسەکورتەکانی لە نیوەی ڕێدا بەجێنەدەهێشت. ئیسلام لە ویژدانەکانەوە دەست بەکار دەکات و، پاش ئەوەی لەوێدا بەباشی ڕەگی داکوتی، هاوڕێ لەگەڵ جوانی و سەرنجڕاکێشییەکی تایبەت بەخۆیدا لە چوارچێوەی خۆی دەردەچێت و، سنوورەکانی چواردەوریشی دەبڕێت و، هەموو جێگایەك دەکات بە زەمینەی چرۆکردن و، بۆیاخی ڕۆحی خۆی دەسوێت بە هەر چوار لادا و، شێوە و ڕەنگی ژیان لەهەموو ئەو جێگایانەدا دەگۆڕێت کە سەوزیکردوون و، پەیامی جاویدانی دەگەیەنێت بە دڵانی تینوو. هەموو پەیامێکی ئەو نەغمەیەکی ئاشتیی گەردوونی و، بەستەیەکی ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی و، "هەناسە"یەکی لێبوردەیی و پێکەوەژیانە. هەرچی ڕەقی و توندی و جەربەزەی و ڕق و قینیشە، یان لە ڕەنگدانەوەی پێکهاتەی ڕۆحی دوژمنەکانی، یان لە

---

١. واتە: هاوشێوە و وێنەی نییە.

کێشەی هەرسکردنی شوێنکەوتە نەزانەکانیەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو لە هەموو حاڵ و بارێکدا نوور و ڕوناکییە، بەڵام جاری وایە بەهۆی بەربەستێکی دوژمنەکانییەوە دووچاری خۆرگیران و، جاری وایش هەیە بەهۆی ئەو تاریکییە کە ئەم دووانە هەڵیدەڕێژن گیرۆدەی مانگ گیران دەبێت.

ئەگەر دوژمن کەمێك وازی لە جەفا بهێنایە و دۆستیش تۆزێك بەوەفا بووایە، بە پرژە ئاگرینەکانی کە لە چەقەوە بەرەو دەرەوە دە دەپەڕین، یان بە چەپکی تیشکەکانی، هەموو تاریکییەکانی وەك ڕق و قین و نەفرەتی ڕادەماڵی و دەیشتنەوە و، هەموو لایەکی دەکرد بە زەمینەیەکی پڕ لە ئاشتی و ئاسایشی وا کە ئەوسەری دەگەیشت بە بەهەشتی هەمیشەیی. لەسایەی ئەودا جەنگ و، کوشتن و، تیرۆر و ئاژاوەکانی سەرزەوی لەبیردەچنەوە و، لەجێگای هەموو ئەمانەدا شەماڵی خۆشەویستی و، ڕێز و، هەماهەنگی و ئاشتی هەڵیدەکرد. خۆی لەخۆیدا لە دڵێکەوە کە ئیسلامی تێچووبێت و تێیدا نیشتەجێ بووبێت -لەبەر خاتری خوا- بەرامبەر بە هەموو بوونەوەران تەنها و تەنها خۆشەویستی و، لێبووردەیی و میهرەبانی دەبارێت.

بەڵێ، لە دڵێکدا هەم باوەڕ و پەیوەندی لەگەڵ خوادا و هەم ڕق و قین و نەفرەت جێیان نابێتەوە. بەتایبەت دڵێك کە هەموو ڕۆژێك و هەفتەیەك و ساڵێك بەیارمەتیی کۆمەڵێك پەرستشی جۆراوجۆر ئیمان و پەیمان و پەیوەندی لەگەڵ بەدیهێنەری خۆیدا نوێبکاتەوە و، بەهێزی بکات و، هەمیشە بە ڕوونی و درەخشانی بمێنێتەوە، هەرگیز گریمانی ئەوە ناکرێت دڵێکی لەم شێوەیە کراوەبێت بەڕووی دوژمنایەتییەکاندا.

چونکە جیهانبینیی ئیسلامیی ئەو هەستە لە ناخماندا دەورژێنێت کە پێویستە هەموو ڕەفتارەکانمان موسڵمانانە بن و، بەرەو ژیانی ئیماندارانە ئاڕاستەمان دەکات. خەرمانی ویژدان و واریداتی دڵمان ئەوەندە لە هەڵسوکەوتەکانماندا ڕەنگدەدەنەوە، تا نەخشەکانی ئەخلاقمان پێکدەهێنن و، هێندە لە ڕەفتارەکانمان دەچۆڕێن، تا دەبن بە سەرچاوەی بنەڕەتیی کلتوورمان و، مانەوەمان وەك خۆمان دەستەبەر دەکات. بەم شێوەیە، کامڵی و، خۆشەویستی و، پەیوەندی و، دڵسۆزی و میهرەبانییەك لە دڵەوە بەرەو دەرەوە دەڕژێت کە پشتی بە ئیمان بە خوا و، هەبوونی متمانە پێی و تەوەککول بەستووە. ئیدی تاکی موسڵمان لە سایەی ئەم هێزی ڕاکێشانە پیرۆزەدا لە تاکێتی دەردەچێت و وەك میللەتێکی لێدێت.

هەروەك چۆن پڕۆژە و هەوڵە هونەرییەکان سەرەتا لەناو مرۆڤ خۆیدا لەدایك دەبن و، شکڵ و شێوە وەردەگرن و، پاشان کاتێك زەمینەیان بۆ بڕەخسێت دەکرێنەوە و بڵاودەبنەوە، بەهەمان جۆر عیبادەت و، ئەخلاق و، ژیانی ڕۆحی و، کلتوور و هەموو پەیوەندییە مرۆییەکانی تریش سەرەتا لە دەروونی ئادەمیزاددا و لەشێوەی ئیماندا دەردەکەون و، ئنجا گەشەدەکەن و سەرتاپای ژیان دەگرنەوە و، ڕەنگی خۆیان دەدەن لەگشت ڕەفتارە مرۆییەکان و، دەبن بە یەکەم پێوەر بۆ هەموو هەڵمەت و جوڵە و چالاکییەکان و، لە هەموو بابەتێکدا کاریگەریی خۆیان دەردەخەن.

ئیسلام جیاواز لە سەرجەم دین و سیستەمە فەلسەفییەکانی تر، وێنەی بیرکردنەوە و ژیانێکی وای پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە کە تەنها تایبەتە بەخۆی، بەڵام لەهەمان کاتدا گەردوونی و گشتگیریشە و، بەرپرسیارێتیی ژیان و جێبەجێکردنیشی خستووەتە سەر شانی

شوێنکەوتووەکانی. موسڵمانێك کە خاوەنی شعوورێکی لەم جۆرە بێت، هەوڵ دەدات لە هەموو پەیوەندییە کەسی و، خێزانی و، کۆمەڵایەتییەکانیدا ڕەچاوی ئەم چوارچێوەیە بکات.. لەسایەی ئەم تێگەیشتنەدا نەخشەی داهاتووی خۆی دەکێشێت.. چەند بتوانێت و هەلومەرجەکان چەند ڕێی بدەن، هەردەم تێدەکۆشێت ئەم بەرپرسیارێتییە بهێنێتەدی. خۆی لەخۆیدا هەر بیرکردنەوە و ئامانجێکی باڵا، هەلومەرجەکان چەند لەباریش بن، ئەگەر بەیارمەتیی کۆمەڵێك خەبات و بزاوتن نەخرێتە سەر ئەرزی واقیع، ئەو بیرکردنەوە و ئەو ئامانجە مەزنانە، تەنها لە دونیای ئاڵ و واڵای خەونەکاندا دەبریقێنەوە و، ئێمەش بەردەوام دەبین لە ئەنجن ئەنجن بوون لەنێو جەڕ و پێچەکانی دونیای واقیعدا.

لەڕاستیدا ئەو ڕاستیی ئیمانەی کە لە دونیای ناخماندا ڕەگی داکوتیوە، تەنها بەئەندازەی ڕۆچوونی بەنێو ژیانی کرداریماندا بڵاودەبێتەوە و بەردەوامی بە بوونی خۆی دەدات... بەڵێ، دوای ئەوەی کە لە دڵماندا چرۆی کرد، ئەگەر لە هەڵسوکەوتەکانماندا بگۆڕێت بە ڕاسترەوی و متمانە و، لە نوێژەکانماندا ببێت بە ڕێز و خشوع و، ببێت بە سەرچاوەی حەقانییەت و دامەزراوی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانماندا، مانای وایە هەتا ئەوسەری ئەبەدییەت دەرگای کراوەیە بەڕووی فراوانبوون و بڵاوبوونەوەدا. ئیمانێکی لەم جۆرە لە مرۆڤدا هەروەك سەرچاوەیەکی نەبڕاوەی هێز و وزەیە، بەهەمان شێوە تاقە بەندەریشە بۆ دەستوەردان لە کاروباری بوونەوەران لەژێر ناوی جێنشینیدا و، بەخشین و شکڵ و شێوە بە چواردەورەکەی لەژێر ڕووناکیی هەست و بیرکردنەوەکانیدا و، هاوڕێ لەگەڵ تێبینییە سروشتییەکانی ڕۆحی هونەر و جوانناسیدا

کرانەوە بەڕووی ئەبەدییەتدا لە خولگەی تەوحید و تەجریددا.. بەڵێ، ئیمان ڕۆحێکی هونەریی هێندە قووڵ لەو دڵانەدا فەراهەم دەهێنێت کە کراوەن بەڕووی جوانناسیدا، هونەرمەندێکی ئیماندار، بەیارمەتیی هەندێك خەت و نەخش و بە یەك هێنانی فڵچەکەی بە تابلۆکەیدا، دەگات بە ماهییەتی پەتی و ئەبەدیی گەردوون. مرۆڤ هەرکاتێك تەماشای بەرهەمێکی هونەریی لەم جۆرە بکات، خۆی لەبەرامبەر نمونەیەکی بچوککراوەی هەموو بووندا دەبینێتەوە و، لەسایەی گوزارشت کردن لە هونەر بە زمانی تەوحید و تەجرید و، لە دونیای ئەفسووناویی خەت و ڕەنگەکاندا، دەگات بە چێژی تەماشاکردنی بێسنووری لە شتە سنووردارەکاندا و، زەریا لە دڵۆپدا و گەردوون لە گەردیلەدا.

ئێمە نامانەوێت هونەری ئیسلامی وەك یاخیبوون لەم بابەت (Object) و ئەو خود (Subject) ببینین و، وەك دەرخستنی توانا و بەهرە شەخسییەکان لێی بڕوانین.. بەڵکو ئێمە لە چوارچێوەیەکی وادا ئەو دەبینین کە تێیدا ئەو مەعنا و ناوەڕۆکەی لەنێو شتان و ڕووداوەکاندا دەبینرێت و، هەستی پێدەکرێت و، تێیدەگەین یاخود پێویستە لێی تێبگەین، تێکەڵ بەو زمانی دڵ و هەست و شعوورە دەبن کە هەمیشە ئاماژە بەو مەوجودە مەجهولە[1] دەکەن کە ڕاستییەکی وایە پێویستە هەمیشە تێیبگەین و، هێندەش نەرم و ناسکە لە هەر ڕوانینێکی نوێدا ڕەهەندێکی نوێی دەبینرێت و، بەیارمەتیی ئەو تیشکانەش کە لەم چوارچێوەیەوە دەڕژێن، لە زۆریدا تاکی و لە تاکیدا زۆریمان پیشان دەدات.

---

١. مەبەست لێی خوای گەورەیە.

بەکورتی ئیسلام، هەم دەنگ و ڕەنگ و هەناسە و تەفسیری کتێبی مەزنی گەردوونە، هەم وێنە و تابلۆ و نەخشەی دوێنێ و ئەمڕۆ و داهاتووی ئەوە و هەم کلیلی ئەفسوونارییی ئەو دەرگایانەیەتی کە بەڕواڵەت داخراو دیارن. ئەو گشت(کل)ێکە گوزارشت لە هەموو ئەم بابەتانە دەکات. ئەو گشتێکی وایە کە نە دەکرێت پارچە پارچە بکرێت، نە دەشگونجێت ئەو بەهایانەی تایبەتن بە هەموو گشت، بخرێتە سەر پشتی یەك بەیەکی پارچەکانی. پارچەپارچەکردنی و پاشان هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی شتێکی تەواو لەم پارچانە هەڵەیە و خیانەتە لە ڕۆحی ئەو. ئەوانەی دەیانەوێت بەشێوازی ئامۆژگاری و لە ناوەندی تەفسیری یەك دوو ئایەت و فەرموودەدا ئەو ڕوونبکەنەوە، هەرچەندە بەدرێژایی تەمەن هەوڵی بیستنی کۆبەندی ئەم ئاوازە سەرسووڕهێنەرانەی ئەو بدەن، هێشتا ویژدانیان بە هەستکردن بە کەموکورتییەکی جددی دەهەژێت و هەمیشەیش ڕۆحیان لە بۆشاییدا دەژی.

ئیسلام ئیمانە، عیبادەتە، ئەخلاقە، سیستەمی بەرزکردنەوەی بەها مرۆییەکانە، بیرکردنەوەیە، زانستە و هونەرە. ئەو وەکو گشتێك مامەڵە لەگەڵ ژیاندا دەکات و، لەژێر ڕۆشنایی بەهاکانی خۆیدا هەڵیدەسەنگێنێت و سفرەیەکی ئاسمانیی بێوێنە پێشکەشی شوێنکەوتووانی دەکات. ئەو هەمیشە تەفسیری ژیان لەسەر ئەرزی واقیع دەکات و، هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە لەو کون و کەلەبەرانەدا کە داخراون بەڕووی ژیاندا هاوار بۆ بڕیارەکانی خۆی بکات. فەرمان و ئاڕاستەکردنەکانی وابەستەی واقیعی حاڵ دەکات و هەرگیز بڕیارەکانی لەسەر جیهانی خەیاڵ بنیات

نانێت. ئیسلام هەر لە بابەتە ئیمانییەکانەوە هەتا چالاکییە هونەری و ڕۆشنبیرییەکان، لە ناوجەرگەی ژیاندایە و، هەردەم بزۆك و زیندووە. ئەمەش بناغە و نیشانەی هەمیشە زیندوو مانەوە و جیهانیبوونی ئەوە.

## دوو ڕووی عەقڵ و مەعقولییەت

عەقڵ جەوهەرێکی دابڕاوە لە ماددە، بەڵام پەیوەندیداریشە پێیەوە.. درێژبووەوەی ڕووناکیی مێتافیزیکە لە جیهانی فیزیکدا.. یەکێکە لە گرنگترین لایەنەکانی ڕۆح.. خێراترین نووری ماهییەتی مرۆڤە بۆ جیاکردنەوەی حەق و ناحەق لەیەکتر.. ئەو "نەفسی گۆیا"یەیە کە جاران پێیان دەوت "من".. لە ڕوانگەی تەسەوفیشەوە یەکێکە لە ناوەکانی جیبریل و پێی دەوترێت "نوری هەرە مەزن" و "عەرشی موحەممەد".. لای هەندێك لە سۆفییەکانیش گەوهەرێکی مرۆییە و ناویان ناوە "عەقڵی جوزئی" یان "عەقڵی مەجازی"، لەو ڕووەوەیشەوە کە پەیوەندیی بە کاروباری دوارۆژەوە هەیە، بە "عەقڵی مەعادی" ناوی دەرکردووە.

عەقڵ -کە بە واتایەك لە واتاکان- بریتییە لە هێزێکی پارێزەر بۆ ڕۆح لەو ڕووەوە کە بیردەکاتەوە و، تێدەگات و، لە خراپەکان دەیپارێزێت و، بەرەو چاکە ئاڕاستەی دەکات، فەلسەفە زۆر لەسەری هەڵوێستەی کردووە و، زانستی کەلامیش لەو بابەتانەدا کە پەیوەندیی بە "ئوسوڵی دین"ەوە هەیە تا ڕادەیەکی زۆر لەسەر ئەو بنیاتی ناوە و، هەندێك لە

سۆفییەکان لەسەر بنەمای چاك و خراپ جیایان کردووەتەوە بۆ "عەقڵی ئاسمانی" و "عەقڵی زەمینی".. لەبەرئەوەی تاوتوێکردنی بابەتی عەقڵ بە هەموو خەسڵەتە ئەسڵی و پاشکۆکانیەوە باسێکی وایە کە لە وتارێکی لەم جۆرەدا جێی نابێتەوە، ئەوا لێرەدا تەنها بە ئاماژەکردن بە هەندێك لە لایەنەکانی وازدەهێنین. هەروەها عەقڵ -بەگوێرەی جیهانبینیی ئیسلامی- بە یەکێك لە هۆکارەکانی زانست دادەنرێت، بەڵام لێرەدا و لە ئێستادا ناتوانین لەسەر ئەم خاڵەش بوەستین. لەم وتارە کورتەدا تەنها ئاماژەیەك دەکەین بۆ عەقڵ لەو ڕووەوە کە بناغەی تەکلیفە و، بنەمای بیرکردنەوەیە و، یەکەم گەوهەری داوەریی ژیرییە و، مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە و، دەیگەیەنێت بە پلەی مرۆڤی ڕاستەقینە و، ناوازەترین دیاریی بەدیهێنەرە بۆ ئادەمیزاد...

ئەو بابەتەی لێرەدا دەمانەوێت لەسەری بوەستین عەقڵە لە چوارچێوەی ئەرك و فەرمانەکانیدا -ئەمە لە ڕوانگەی پەیامەکانی نوورەوە- ئەمەش یان ئەو عەقڵەیە کە تەبایە لەگەڵ وەحی و ئیلهام و ویژداندا و شان بەشانیان دەڕوات، یان ڕێك بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەو عەقڵەیە کە سەرجەم تێبینییە مێتافیزیکییەکانی پشتگوێ خستووە و، خۆی لە پەیوەندییە ئاسمانییەکان داڕنیوە و، لەئەنجامیشدا زەمینەی مانۆڕی خۆی تەسك و سنووردار کردووە. لەم نێوەندەشدا نامانەوێت بچینە ناو باسوخواسی بیردۆزەکانی "عەقڵی نەزەری" و "عەقڵی کرداری"ی کانت (Kant) و تێبینییەکانی "عەقڵی پێکهێنەر" و "عەقڵی پێکهێنراو"ی لالەند (Lalende). لەڕاستیدا چونکە هەر یەکێك لەم بابەتانە هێندە فراوانن کتێبێکی سەربەخۆیان دەوێت و، مانا و سوودێکی وایشیان بۆ

ژیانی کرداری نییە ، لێرەدا تەنها وەك یادخستنەوەیەك هێنامانن و بەسەریاندا ڕادەبووڕین.

عەقڵ لە ڕوانگەی بیرمەندانی موسڵمانەوە -لەپێش هەموویانەوە بەدیعوززەمان- لەو ڕووەوە کە چەندین بەهرە و توانای قووڵی لەخۆ گرتووە، چاوێکە پەڕاوی گەردوون دەخوێنێتەوە و، گوێچکەیەکی ناوەکیی وایە کە هەستیارە بەرامبەر بە چەندین لەرینەوە و سەرجەم دەنگ و ئاوازە بیستراوەکان هەڵدەسەنگێنێت و چەندەها مانایان لێهەڵدەگۆزێت و، ئیدراکێکی گشتگیری وایە بەجۆرێك تەماشادەکات کە سەرنجەکانی شتان و ڕووداوەکان تێدەپەڕێنن و، چاوێکی ناوەکیی وایە کە کراوەیە بەڕووی کەشفکردنی بوون و جیهانەکانی ئەودیوی بووندا. ئادەمیزاد بەیارمەتیی ئەو، لە شتانی بینراو و بیستراوەوە بڕیارێك هەڵدەهێنجێنێت و، بە ڕابەرایەتیی ئەو گەشت بەرەو ئەودیو پەردەی بوون سازدەکات و، تەنانەت بەرزدەبێتەوە و دەبێت بە قسەبۆکراوی خوای گەورە.. مرۆڤ بەهۆی عەقڵەوە دەبێت بە شایانی هەڵگرتنی کۆمەڵێك بەرپرسیارێتیی جەبری و ئیختیاری.. وە لەگەڵ ئەودا سەرتاسەری گەردوون دەپێوێت و، دەپشکنێت و، دەیگەڕێنێتەوە بۆ چەند بناغەیەك و، پاشان ڕووەو خوای خۆی دەڕوات. عەقڵ لە چاکە و جوانییەکاندا لۆجیك و داوەریی ژیریمان لەگەڵ دەوڵەمەندیی وەحی و ئیلهام کۆدەکاتەوە و، دەبێت بە سەرچاوەیەك بۆ ئەو پەیامانەی لەودیوەوە دێن.. لە کاروبارە خراپ و ناشرینەکانیشدا تەفسیری لۆجیکی بۆ ئەو سنوورانە دەهێنێتەوە کە خوای گەورە کێشاونی و، ئارەزووە سەرشێتەکانی نەفس هێوردەکاتەوە و، هەمیشە سەرقاڵی دانانی ستراتیژی نوێ دەبێت بۆ بەرگریکردن لە

دەستدرێژییەکانی. جگەلەوەش هەردەم کۆمەڵێك تەکتیکمان پێشکەش دەکات تا بەهۆیانەوە سەربکەوین بەسەر نەخشە جۆراوجۆرەکانی شەیتاندا.. ئارەزووە جەستەیی و ماددیەکانیشمان بە کەمەند و زنجیری فیکرێك دەبەستێتەوە کە لە دەستی وەستایانی ئاسنگەری موراقەبە و موحاسەبە دەرچووە. عەقڵ، تا ئەو کاتەی پارێزگاری لە ئاسمانیبوونی خۆی دەکات، هێرش دەکاتە سەر نەفسانییەتی خۆی و، لە هەموو ئەو سووکێتی و نزمییانە دەیپارێزێت کە لە سروشتی ئەم نەفسەوە سەرچاوەیان گرتووە و، سەبارەت بە بەها مرۆییەکانیش وەك پۆلیسێکی پارێزگاری لێدێت. وە بێگومان ئەم شتانەی کە تایبەتمەندیی "عەقڵی ئاسمانی" و "عەقڵی مەعادی"ن، لە هیچ یەکێك لە "عەقڵی مەعاشی" و "عەقڵی زەمینی"دا بوونیان نییە.

دەکرا لێرەدا باسی پێگەی عەقڵ و، بەهاکەی و، ڕۆڵی لە بەرپرسیارێتیدا بکرایە لە ڕوانگەی قورئان و ئیسلامەوە. بەڵام ئێمە لەئێستادا دەمانەوێت -وەکو ڕوانگەکەی بەدیعوززەمان- تەنها لەسەر ئەو لایەنانە هەڵوێستە بکەین کە بەلای قورئانی پیرۆزەوە عەقڵی (مەعقوول) یاخود ناعەقڵی (نامەعقوول)ن.

لە سیستەمی بیری ئیسلامی و لە ڕوانگەی جیهانبینیی قورئانییەوە شتانی ناعەقڵانی و عەقڵانی لەسەر بنەماکانی وەك سروشتی-بەدیهاتن، هۆکارەکان-هێزێکی بەدیهێنەری سەروو هۆکارەکان، لەخۆوە دروستبوون-بەخشینی بوون لە لایەن ئیرادەیەکی گشتگیرەوە، بە واتایەکی تر لەسەر ئاسۆی تەوحید و کەندەڵانی شیرك دادەمەزرێنێت. لەو ڕۆژەوەی مرۆڤ بەدیهاتووە -هەڵبەتە ئەمە لە دیدی مرۆڤ

خۆیەوە کاتێك وەك شرۆڤەکارێکی دەرەکیی لەم بابەتە دەڕوانێت، ئەگینا لە گۆشەی تەفسیری پەتی بۆ گەردوون و بوونەوەرانەوە هەمان شت ڕاستە بۆ سەردەمی پێش دەرکەوتنی ئادەمیزادیش- یاری نێوان مێفیستۆ و فاوست[١] بەردەوام بووە. لەمەولاش کێبەرکێی نێوان چاك و خراپ و، پاڵفتەبوون و جیابوونەوەی شەیتانەکان و ئەو ڕۆحانەی سیفەتی شەیتانیان وەرگرتووە لەو ڕۆحانەی کراوەن بەڕووی حەق و حەقیقەتدا، هەر بەردەوام دەبێت.

ئەوانەی کە هەتا ئەمڕۆ بوونەوەران و ڕووداوەکانیان داوەتە پاڵ سروشت و، هۆکارەکان و، ڕێکەوت و لەخۆوەدروستبوون، هەمیشە وەك نوێنەرانی ناعەقڵانییەت سەنگەرێکیان گرتووە و، جارێك لە دەوری خوایەکی دەستکردی سروشت و، جارێکی دی لە چواردەوری دەسەڵاتدارێتیی وەهمیی هۆکارەکاندا کۆبوونەتەوە و، هەردەم لە جەنگدابوون لەبەرامبەر ئەو پێغەمبەران و ئەصفیا و بیرمەندە ئیماندارانەی کە بە نوێنەرانی عەقڵانییەت ئەژماردەکرێن. هەرچەندە ئەم سەنگەر و تاقمە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ستراتیژی جۆراوجۆریان بەکارهێناوە، بەڵام شێوازی جەنگ و بەربەرەکانێیان هەمیشە یەکێك بووە و نەگۆڕاوە. ئیدی یان کردارەکانی وەك بەدیهێنان و، ڕێکخستن و، مراندن و، زیندووکردنەوە و هاوشێوەکانیان

١. مێفیستۆ و فاوست: کەسایەتیی ئەفسانەیی مێفیستۆ لە کۆتایی سەدەی شازدەیەمدا لە تراژیدیا ئەوروپییەکاندا دەرکەوت و ڕۆڵی شەیتان دەگێڕێت. بەناوبانگترینیان تراژیدیا بەناوبانگەکەی "گۆتە"یە بەناوی "فاوست". لەم شانۆگەرییەدا فاوست زانایەکی بەتەمەنە و هەموو ژیانی بە سەرقاڵبوون بە زانست و زانیارییەوە بەسەربردووە، بەڵام هێشتا ڕۆحی بەختەوەر نییە. مێفیستۆ ئەم هەلە دەقۆزێتەوە و پەیمانی بەخشینی هەموو چێژە دونیاییەکانی پێدەدات لە بەرامبەر کڕینی ئیمانەکەیدا. فاوست هەڵدەخەڵەتێت. بەڵام تراژیدیاکە بە سەرکەوتنی مرۆڤێتیی فاوست کۆتایی پێدێت، چونکە هەمیشە دەرگای تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا کراوەیە و شەیتانیش دان بەوەدا دەنێت کە ناتوانێت ئارەزووی مانەوەی هەتاهەتایی ناخی مرۆڤ تێربکات.

کە لەڕاستیدا پێویستی و داخوازی خوایەتین، گەڕاندووەتەوە بۆ شتانی وەك هۆکارەکان و، ڕێکەوتەکان و، سروشت کە لەبنەڕەتدا جگە لە بوونێکی وەهمی هیچی دیکەیان نییە. یان ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێژەییش بێت کاروبارە خواییەکانیان داوەتە پاڵ ئەمانە. هیچ گومانێك لە ئیلحادی دەستەی یەکەم ناکرێت، هەرچی دەستەی دووهەمیشە، هەندێك لەو شتانەی کە خوا خۆی بەدیهێناون کردوویانن بە هاوەڵی ئەو لە کاروبارەکانیدا و بەم پێیەش قاچیان بۆ ناو شیرك هەڵخزاوە. چونکە تەوحید، دانانی هاوەڵ و هاوبەش -بە هەر شێوەیەك بێت لە شێوەکان- بۆ ئەو توانستە بێسنوورە ڕەتدەکاتەوە کە بەدیدەهێنێت و، دروستدەکات و، دەمرێنێت و، زیندوودەکاتەوە و، ڕزق دەدات و، هەموو کەسێك و هەموو شتێك دەبینێت و پارێزەرە بەسەریەوە. هەروەها تەوحید ئەمە بە نامەعقووڵ دەزانێت.

ئا لەم ڕوانگەیەوەیە کە ئەو تەوحیدەی بریتییە لە یەکێك لە کۆڵەکە هەرە گرنگەکانی قورئانی پیرۆز، تەبایە لەگەڵ عەقڵ و مەعقوولە و، بەستنەوەی بوونیش بە هۆکارەکان و، سروشت و شتە جیاوازەکانی ترەوە پێچەوانەی عەقڵە و نامەعقوولە. جێی خۆیەتی ئاماژە بکەین بەوەی کە بەگوێرەی دەستووری "شتان بە دژەکانیاندا دەناسرێن"، لێرەدا باسکردنی نامەعقوول ئەوەندەی تر مەعقوول ڕووندەکاتەوە.

بەڵێ، ئەگەر هەموو شتێك نەگەڕێنرێتەوە بۆ تەوحیدی ڕاستەقینە، بەناچاری پێویست بە بوونی چەندەها بەدیهێنەر و، پێکهێنەر و، ژیانبەخش و، مرێنەر و، بینەر و پارێزەی بێسنوور دەکات. قبووڵکردنی گریمانێکی لەم جۆرە، بە مانای قبووڵکردنی زنجیرەیەك مەحاڵ دێت

و، پێچەوانەبوونی ئەمەش لەگەڵ عەقڵدا ڕوون و ئاشکرایە. ئەم عەقڵانییەت و ناعەقڵانییەتەی کە زانایانی "زانستی کەلام" لەژێر چەندین ناوی جۆراوجۆردا و بەزۆری هەڵوێستەیان لەسەر کردووە، لای بەدیعوززەمان دەگۆڕێت بە دەنگ و ڕەنگێکی قورئانی، بەجۆرێك کاتێك مرۆڤ لە بابەتە ئیمانییەکاندا موتالای ئەو دەکات، بەڕوونی ئەو مانایانە دەبینێت کە لە "عەقڵانیبوون" و "ناعەقڵانیبوون"ی ناون. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾

(الأنبياء: ٢٢)

"ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا."

لەم ئایەتە و لە چەندین ئایەتی هاوچەشنی تریشدا هەمیشە بانگمان دەکات بۆ داوەریی ژیری لەم بابەتەدا و ئاسۆی تازە و نوێ لەسەر لۆجیکمان دەکاتەوە.

لەڕاستیدا قورئان جگە لە فەرمانەکانی لەمەڕ پەرستشەکان (أوامر التعبدية)، زۆربەی زۆری بابەتەکانی تر حەواڵەی عەقڵ و، لۆجیك و داوەریی ژیری دەکات و، هەرگیز ڕێگەی دروستبوونی بۆشایی عەقڵی و، ڕۆحی و عاتفیی نادات لە پەیامەکانیدا. بەپێچەوانەوە ئەو لەبەرامبەر چەندین دوژمنی جیاوازدا کە بڕیار و بانگەشە جۆراوجۆرەکانیان لەسەر شتانی نامەعقوول بنیاتناوە، هەمیشە دەنگ و، هەناسە و نوێنەری بیرکردنەوەی تەندروست و، داوەریی ژیریی سیستەماتیزەکراو و، لۆجیکیی

ڕێکوپێك بووە و، هەموو بەهەڵەداچوون و، بەڵگە فشەڵ و بانگەشە بێ بنەماکانی ئەوانی بێدەنگ کردووە و، بە سەرکەوتن کۆتایی بە هەموو کێبەرکێکانی هێناوە.

خۆی لەخۆیدا مێژوویش هیچی دیکە نییە جگە لە جێگۆڕکێ و بەدوای یەکدا هاتنی ئەو سەردەمانەی کە تیایاندا وەحی فەرامۆشکراوە و عەقڵانییەت پشتگوێ خراوە لە لایەك و، لە لایەکی تریشەوە ئەو ڕۆژگارانەی کە زەوی بە نووری ئاسمان ڕووناك بووەتەوە و، چالاکیی عەقڵیش هەموو هێز و توانای خستووەتە مەیدان. هەرکاتێك بەهۆی نووری پێغەمبەرانەوە دڵەکان ڕۆشن بوو‌بێتنەوە و، مێشکەکان ڕووناکییان بەدەستهێنابێت و، جیسمانییەت و ماددە ڕۆیشتبێتنەوە ناو چوارچێوەی تایبەتی خۆیان و، فیزیك و مێتافیزیکیش هەریەکەیان لە پێگەی خۆیدا لەنگەری گرتبێت و، بە گوتەی "مەولانای ڕۆمی" "عەقڵی ئاسمانی"، بە دەستەواژەی "ئیمامی غەزالی" "عەقڵی مەعادی" پێش "عەقڵیی مەعاشیی" و "عەقڵیی زەمینیی" کەوتبێت.. بەڵێ، لەم حاڵەتەدا هاوسەرگیرییەکی نوێ لەنێوان ژیریی و دڵدا ڕوویداوە و لەدایکبوونێکی تەواو تازە هاتووەتە گۆڕێ. ئەم لەدایکبوونە بریتییە لە سەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی بوون و، گرێدانی پەیوەندیی لەگەڵ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆیدا لەژێر ڕۆشنایی تێگەیشتن و جیهانبینیی ڕۆژگاردا و، ڕزگاربوونی مرۆڤ لە دژیەکییە ناوەکییەکان.. هەرکاتێکیش ڕووناکی ئاسمانەکان دیارنەمابێت و، عەقڵ فەرامۆش کرابێت و، بیرکردنەوەش -بە مانا تایبەتییەکەی- خرابێتە دەرەوەی بازنە و، شتانی مەعقوول بەجارێك لەبیرکرابن و، ئاڵای نامەعقوولییەت لە هەموو گۆشەیەکدا

شەکابێتەوە و، حەشاماتەکان بەرەو دژیەکییەکان درابنەبەر.. بەڵێ، لەم جۆرە کاتانەشدا و لە نێوەندی تەشویشێکی ڕۆحی و فیکریدا جارێك "زەردەشت" و جارێکیش "حەزرەتی عوزەیر" و "حەزرەتی عیسا" -حاشا!- بە کوڕی خوا لەقەڵەم دراون و، هەموو ئەو سیستەم و هاوسەنگییەی کە پەیوەستی وەحی و عەقڵە سەرەوژێر بووە.

دەرکەوتنی ناعەقڵانییەت گاهـ لە شێوەی "وەدد" و "یەغوس" و "یەعوق" و "نەسر"دا دەردەکەوێت و، گاهـ لای مەجوسییەکان لە "تاریکی و ڕووناکی"دا بەرجەستە دەبێت و، جارێك وەك ڕۆحێکی هەمەکی دەردەکەوێت و، جارێکیش پۆشاکی بتە جیاوازەکانی وەك "لات" و "مەنات" و "عوززا" و "نائیلە" و "ئیساف" دەپۆشێت، جاری وایش هەبووە لە ڕووداوە ترسێنەرەکانی کتێبی گەردوونەوە -وەك: ئاگر، هەورەبروسکە، با، ڕوبار...- سەرچاوەی گرتووە. هەمیشە ئەو ڕۆحانەی کە کراوەن بەڕووی خواری و لاداندا، جار هەبووە هۆکاری کەوتنیان بۆ ناو شیوی گومڕایی گومانێکی باش بووە -وەك لە حاڵەتی"وەدد" و "یەغوس" و "یەعوق" و "نەسر"دا دەبینرێت- و، جاری وایش هەبووە بە پشتکردنیان لە شتانی مەعقوول و ئاسمانی، ڕێیان هەڵەکردووە و لە ڕاستی دوورکەوتوونەتەوە. لەبەرئەوەی گۆشەی لادان لە چەقدا هێندە بچوکە وەختە هەستی پێنەکرێت، هەستیان بە گرنگیی بابەتەکە نەکردووە، کاتێکیش پێیان زانیوە، خۆیان لە بەردەم فراوانیی گۆشەکەدا بینیوەتەوە و نەیانتوانیوە بگەڕێنەوە. پاشان پێیان خلیسکاوە بەرەو بەستنەوەی گرنگترین ڕاستییەکان بە کۆمەڵێك وەهم و خەیاڵەوە. ئیدی ناعەقڵانییەتێکی لەم جۆرە سا لەشێوەی گەڕاندنەوەی کاروبارە خواییەکاندا بێت بۆ بتە

جۆراوجۆرەکان بەجۆرێکی ئاشکرا، یان لەشێوەی بۆچوونی ئەو "دەلالی شەفاعەتکار"انەدا بێت کە موشریکەکان کەمێك وەك پاساو و کەمێکیش وەك جەدەل و، لەشێوەی پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆدا دەیانهێنایە سەر زمان.. بەڵێ، ناعەقلانییەتێکی لەم جۆرە بەئاشکرا پێچەوانەی هەم عەقڵ و هەم وەحییە و، لادانێکی ڕوونە.

هەمیشە ئەوەی مەعقوولە تاکە. کاتێك لادان لەو تاکە ڕوودەدات، بێ ئەوەی مرۆڤ بە خۆی بزانێت دەکەوێتە باوەشی زۆریی نامەعقوولییەتەوە. لەئەنجامدا بەچەندین شێوازی جۆراوجۆر "زۆریی ڕاستەقینە" شوێنی "تەوحیدی ڕاستەقینە" دەگرێتەوە. بۆ نمونە صائیبییەکان لەدایکبوون و، مردن و، بەختەوەری و، بەدبەختی و، بەلا و موسیبەتەکان بەجۆرێك دەگێڕنەوە بۆ مانگ و خۆر و ئەستێرەکان کە شتێك لە بیروباوەڕی قەدەر دەچێت لای ئێمەی موسڵمان. ژیانییەکان (الإحيائيون) ئەم کاروبارانە بۆ ڕۆحێکی هەمەکی و، مەجووسییەکان بۆ تاریکی و ڕووناکی و، بتپەرستەکانیش دەیانگێڕنەوە بۆ چەندەها بتی جۆراوجۆر. پاشان لە بەرامبەر ئەو پەیامە خواییانەوە کە ویستوویانە لەم لادانە بێداریان بکەنەوە، وتوویانە "وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ"[١] بێ ئەوەی بیربکەنەوە لەوەی داخۆ ئەو ڕێگایەی پێیدا دەڕۆن ئاسمانی و عەقڵییە یان نا.

بەڵێ، بەلای ئەمانەوە گرنگ نییە شتێك عەقڵی بێت یان نا، گرنگ ئەوەیە لەو شتانەدا کە بەگوێرەی هەوا و هەوەسیانە و بەکەڵکیان دێت شوێن پێی باووباپیرانیان هەڵبگرن. قورئانی پیرۆز ڕوو لە لاساییکەرەوەکانی ئەو ڕۆژگارە و لە پشتی ئەوانیشە بە هەموو چاولێکەرە کوێرەکانی

١. سورەتی الزخرف: ٢٣. واتە "بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیرەوی ئەوان دەکەین."

پێشین و پاشین دەفەرمووێت ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾،[١] "ئایا ئەگەر باوو باپیرانیشیان تێ نەگەیشتوو هیچ نەزان و ناشارەزا و ڕێنموویش وەرنەگرن...! نموونەی بێ باوەڕان وەکو ئەو شوانە وایە: کە هاوار دەکات بەسەر ئاژەڵەکەیدا، بەڵام تێی ناگەن، تەنها ئەوەیە کە گوێیان لە هات و هاوارێکە، ئەوانە کەڕ و لاڵ و کوێرن و ژیری و هۆشمەندییان لە دەستداوە." و، بانگیان لێدەکات تا بێنەوە هۆشی خۆیان.

دەتوانین لە ڕوانگەی شێوازی گشتیی قورئانی پیرۆزیشەوە بۆ ئەم بابەتە بڕوانین. بەڵێ قورئان تاو ناتاو بە زمانی عەقڵ موشریکانی هاوچەرخی پێغەمبەرمان دەدوێنێت و، بە زمانی لۆجیکیش تاسۆیان فراوان دەکات و بە هێزی داوەری مەعقوولیان بۆ حونجە دەکات. جاروباریش لاپەڕەکانی مێژووی دووبارەبووەوە هەڵدەداتەوە و، لە ڕێگەی نمونەکانیەوە، هاوڕێ لەگەڵ نامەعقوولییەتی موشریکەکانی ئەو ڕۆژگارە، بۆچوونی ئیلحادی سبەینێیش لە ڕەگەوە دەهەژێنێت و بانگهێشتمان دەکات بۆ بیرکردنەوە لە سەرجەم کاروبارەکاندا. پێغەمبەران و سەرگوزەشتەی ئیرشادی ئەوان وەك پێشانگایەك وایە بۆ نمایشکردنی زیندووترین نمونەکان لەبەرامبەر هەموو جۆرەکانی ئیلحاد و کوفر و شیرکدا و، چەشنی مینبەرێکە پاراوترین و قەناعەتبەخشترین وتارەکان لێیەوە دەخوێنرێنەوە. قورئان جاروبار دەستی قوتابییەکانی دەگرێت و بەم پێشانگایەدا دەیانگێڕێت و، جاروباریش هاوڕێ لەگەڵ قەناعەتبەخشترین ئاوازدا بەتامترینی وتارەکان دەدات بەگوێی شاگردەکانیدا.

١. سورەتی البقرة: ١٧٠-١٧١.

حەزرەتی ئیبراهیم کە یەکێکە لە بەهێزترین دەنگەکانی تەوحید، لە زۆر جێگای قورئانی پیرۆزدا وەك نمونەیەك ناوی هێنراوە. ئەو بتی بتپەرستە هاوچەرخەکانی شکاند و، بیروباوەڕی هاوبەشایەتیی لە ڕەگەوە دەرهێنا و، زنجیرێکی وای لە زاریان دەدا کە لە دەزگای عەقڵدا بەرهەمهاتووە تا جارێکی دیکە نەتوانن بکەونەوە گوفتار. پاشان بۆچوونی هاوبەشایەتیی ئەوان دەگوازێتەوە بۆ ئاسمان و، لەبەرامبەر ئەو بیروباوەڕە چەوتەیاندا کە خوایەتییان دەدایە پاڵ خۆر و مانگ و ئەستێرەکان، ئەم وەك بڵێی پەیوەندیی نێوان تەنە ئاسمانییەکانی دەبچڕاند و، دەیکردن بەژێر داروپەردووەکەیانەوە و، شارێی گەیشتن بە بەدیهێنەری لێدەدا بۆ ئەوانەی دوای خۆی.

لەهەمبەر ئەوانەشدا کە سەرەڕای هەموو شتێك پێداگرییان دەکرد لەسەر نامەعقولییەت، دەیفەرموو ﴿لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾[١] "بەڕاستی ئێوە و باوو باپیرانی ئێوە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون." جاری وایش هەیە دەبینیت بتەکانی شکاندووە و، هاوار دەکات بەسەر لۆجیکی لارولوێری شیرکدا و، دەڵێت ﴿أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[٢] "چۆن شتێك دەپەرستن لە جیاتی خوا کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یان زیانێکتان پێ بگەیەنێت، ئۆن لە دەستان و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەکار؟!" بەم هاوارەشی لەرزە دەخاتە دڵی موشریکەکانی ئەو سەردەمە و هەموو ئەو بتپەرستانەش کە دواتر

١. سورەتی الأنبیاء: ٥٤.

٢. سورەتی الأنبیاء: ٦٦-٦٧.

دەردەکەون.

هەموو پێغەمبەرە مەزنەکانی تریش -هەرچەندە ڕەنگ و شێوازی هەریەکێکیان بەگوێرەی هەلومەرجەکان و ژینگەکەیان تایبەت بووە- وەکو حەزرەتی ئیبراهیم هەمیشە هەمان پەیامیان گەیاندووە و بەهەمان ڕێگادا ڕۆیشتوون. حەزرەتی نوح و، حەزرەتی هود و، حەزرەتی سالْح و، حەزرەتی شوعەیب و، حەزرەتی موسا و هەموو پێغەمبەرانی دیکەش هەمان ڕێگای "عەقڵی ئاسمانی"یان گرتووەتەبەر و هەردەم "مەعقوول"یان بڵاوکردووەتەوە. بەپێچەوانەی ئەمەوە سەنگەری کوفر و ئیلحاد و شیرك، ئەمەنیان لە زیندانە تەسکەکانی هەوا و ئارەزووەکاندا و، وەك دیلی ئەو بیر و بۆچوونانە وابوون کە لە باوانیانەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە و، هەمیشە لەم هەستی لار بۆ ئەو بینینی چەوت ماخۆلانیان بووە و، وێنەی نامەعقوولییەتیان بەرجەستەکرووە.

ئەو کتێبی گەردوون و پێشانگای بوونەوەرانەی کە بەدیعوززەمان زوو زوو لەسەری دەوەستێت و داوای خوێندنەوە و تەماشاکردنیمان لێدەکات، هەمان ئەو بۆچوونەیە کە لە نوێنەرانی مەعقوولییەتەوە -کە پێغەمبەران و ئەصفیا و ئەولیا و زانایانی موسڵمانن- بە میرات بەجێماوە. جگە لە جیاوازیی کات و شوێن و هەلومەرجەکان، هەمان پەیام گەیەنراوە و هەمان ڕێگا تەی کراوە: سەرنجی ورد لە ئاسمان و زەوی دەدرێت.. شتان و ڕووداوەکان وەك پەمووی بەردەستی هەلاج شیدەکرێنەوە.. هەموو شتێك دەگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنە ڕاستەقینەکەی.. پاشان هەست بە ئاسوودەیی و ئارامیی ئەم مەعقوولییەتە دەکرێت لە ویژدانەکاندا و ئەو زانستانەش

کە گۆڕاون بە مەعریفەت هەریەکەیان دەبێت بە سەرچاوەیەکی چێژی ڕۆحانی.. تا وای لێدێت دانیشتوانی زەوی و ئاسمانەکان هەڵگری هەمان تایبەتمەندی و حاڵەتی ڕۆحی دەبن.

قورئانی پیرۆز لە زۆرێك لە ئایەت و فەرمایشتەکانیدا ئەم ڕێگایەمان بۆ ڕووندەکاتەوە و هاودەم لەگەڵ بەستنەوەی بە ئەبەدییەتەوە ڕاڤەی دەکات. بۆ نمونە:

﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴾

(ق: ٦-١٠)

"ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کەبەراسەریانەوەیە: چۆنمان دروست کردووەو ڕازاندوومانەتەوەبەجۆرێك هیچ کەم و کووڕی و کەلێنێکی تێدا نی یە ؟! هەروەها زەویمان ڕاخستووەو بلاومان کردۆتەوە و کژو کێومان لەسەری دامەزراندووەو لەهەموو جۆرە ڕوەکێکی جوان و ڕازاوەمان تیادا ڕواندووە. ئەمانەهەر هەمووی بۆ ڕۆشنکردنەوەی دڵ و یادخستنەوەیە بۆ هەموو ئەو بەندانەی کەبەلای ئێمەدا دێنەوە و ڕەزامەندی ئێمەیان مەبەستە. لەئاسمانەوەئاوێکی بەپیت و بەرەکەتمان هەردەم دابەزاندووەجا بەهۆی ئەوەوەچەندەها باخ و دانەوێڵەی ئەو کشتوکاڵانەی کەدرەو دەکرێن ئەروێنین . هەروەها دارخورمای قەشەنگ و بڵند سەری هەڵدا، کەهێشووە خورمای جوان و لەسەر یەك و ڕیزکراو دەگرێت."

لەم ئایەتەدا پیرۆزەدا سەرنجمان بۆ ئاسمانەکان و، لەویشەوە بۆ ڕووی زەوی و، پاشان بۆ ڕزق و ڕۆزی ڕادەکێشێت و، بانگهێشتمان دەکات بۆ بەکارهێنانی عەقڵ و، بیرکردنەوە و، قووڵبوونەوە لە ئیماندا و، دەوڵەمەندبوون لە مەعریفەتدا. جاری وایش هەیە پەنجە بۆ گرنگیی شتە هەستپێکراوەکان درێژدەکات و داوەتمان دەکات بۆ تەماشاکردنی ئەو ڕووی زەوییەی کە هەمیشە لەبەردەم چاوەکانماندا والاکراوە و، دەفەرمووێت:

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴾

(الحج: ٤٦)

"ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون بەدڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیربك بکەنەوە... یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر بوو بێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا."

بەم جۆرەش مەحروومییەتی ئەو دڵانە دەردەخات کە داخراون بەسەر بەسیرەتدا. جاروباریش لەشێوەی تەمێکردنی ئەوانەدا کە عەقڵ و بەسیرەتیان ناخەنەکار، دەفەرمووێت:

﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴾

(یوسف: ١٠٥)

"چەندەها بەڵگەو نیشانە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن (لەسەر دەسەڵاتداریتی و جوانکاری خوای پەروەردگار) کەچی زۆربەی خەڵکی بەلایدا تێدەپەڕن و تێنافکرن و پشتی تێدەکەن."

لێرەدا جەخت لەسەر گرنگیی نیەت و ڕوانگە دەکاتە و بیرماندەخاتەوە کە ڕوانینی ڕووت و پەتیی هیچ نرخ و بەهایەکی نییە.

قورئانی پیرۆز -لەپاڵ ئەوەدا کە هانمان دەدات سەرنج لە پەڕاوی گەردوون بدەین- لەسەر ئاستی توندوتۆڵی لە خستنەڕووی بابەتەکانیدا و، وردی و قووڵی ناوەرۆکەکەی و، گشتگیریی پەیامەکانی و، سیحری دەستەواژەکانی و، کاریگەری و قەناعەتبەخشیی شێوازەکەی و لە چەندەها لایەنی دیکەشەوە نمونەیەکی ناوازەی مەعقوولییەتە و هەموویان لەخۆیدا کۆدەکاتەوە. بەڵێ، هەروەك پاڵی بە وەحییەوە داوەتەوە، بەهەمان جۆر هەمیشە خولگە و تەوەرەکەشی عەقڵە. هەموو پەیامەکانی سەرەتا بە پاڵێوگەی عەقڵ و لۆجیك و داوەریی ژێریدا تێدەپەڕێنێت و ئنجا لە دەرگای گوێبیستەکانی دەدات.. بەجۆرێك بەرەو دڵەکان دەڕوات کە سەرنجەکان کێشدەکات.. لە چوارچێوەیەکی وادا قسەدەکات کە دەرفەتی ڕەخنە و تانە بۆ عەقڵ و هەست و شعوور ناهێڵێتەوە.. وە هەمیشە قوتابییەکانی لەسەر ئاستی مەعقوولییەت نوێدەکاتەوە. قورئانی پیرۆز لە هەموو بابەتێکدا -هەر لە خستنەڕووی سەدان باس و خواس بەشێوەیەکی هێندە ڕێکوپێك و ناوازە کە مەگەر تەنها پاش زەحمەتێکی زۆر و لە شیکردنەوەی یەك دانە بابەتدا بەدەستبێت، هەتا گەیاندنی دڵە ئیماندارەکان بە ئاسوودەیی و ئارامی بەیارمەتیی ئەو کاریگەری و گەرموگوڕییەی کە لە پەیامەکانیدایە و، قەناعەت پێکردنی ڕۆحە سەرکەش و یاخییەکان- پشت بە وەحی دەبەستێت و لە بنارەکانی عەقڵدا ئاڵوگۆڕی خۆی لەگەڵ ئادەمیزاددا ئەنجامدەدات..

لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین، هەروەك ئەوانەی دەتوانن تەماشای بوونەوەران بکەن و، ڕووداوەکان بخوێننەوە و ببیبەستن بە تەوحیدەوە شوێنکەوتووانی مەعقوولییەتن، بەهەمان جۆر ئەوانەش کە قورئان دەبیستن و، لەخۆیاندا جێبەجێی دەکەن، بە ڕێڕەوانی ڕێگایەکی عەقڵی ئەژماردەکرێن. بەپێچەوانەشەوە ئەوانەی کە ناتوانن بگەن بە کرۆکی شتان و ڕووداوەکان و تەنها لە ڕووکەشدا دەمێننەوە، هەروەك لەسەر ڕێگایەکی عەقڵی نین، ئەوانەش کە قورئان نابیستن و، گوێی بۆ شل ناکەن و، لە خۆیاندا جێبەجێی ناکەن، مانای وایە نەیانتوانیوە بەتەواوەتی لە نووری عەقڵ کەڵك وەربگرن. بەڵێ، مەعقوولییەت بریتییە لە خوێندنەوەی شتان و ڕووداوەکان و، بیرکردنەوە دەربارەیان و، هەڵسەنگاندنیان و، پاشان بەستنەوەیان بە ئیمان و مەعریفەت و بەدیهێنەرەوە. گەڕاندنەوەی شت و ڕووداوەکانیش بۆ هۆکارە جیاوازەکان و سروشت و شتانی تر دژی عەقڵ و بیرکردنەوەی ساغە. بوون و، یەکتایی خوا و، بێنیازبوونی لە هاوبەش و یاریدەدەر مەعقووڵە و، بیر و بۆچوونی ئیلحاد و شیرك بە هەموو لایەنەکانیەوە نامەعقوولە. هەبوونی کۆمەڵێك نێرراو لە نێوان خوا و مرۆڤەکاندا بە ئامانجی ڕوونکردنەوەی شتان و ڕووداوەکان و ڕاڤەکردنی بوون و گەیاندنی بە حەقیقەتێك، شتانێکن ژیری قبووڵیان دەکات. هەرچی قبووڵنەکردنی پێغەمبەرایەتی و پەیامە خواییەکانیشە سەرتاپا دژی ژیرین. دەتوانین لەم ڕوانگەیەی پەیامەکانی نوورەوە، چوارچێوەکە هێندە فراوان بکەین کە هەموو پایەکانی دیکەی ئیمانیش بگرێتەوە. پێم وایە لێرەدا ئەمەندە بۆ بابەتەکەمان بەس بێت و، موتالاکردنێکی وا فراوان بەجێدەهێڵین بۆ کتێبەکانی زانایان و بیرمەندانی موسڵمان.

لە سۆنگەیەکی ترەوە، عەقڵ کە بەمانای تێگەیشتن و، دەرك کردن و، کۆکردنەوەی هزرەکان دێت، هۆکارێکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لەو شتانەی بەجۆرێك لە جۆرەکان لە سنووری توانای ئەودان و، یەکێکە لە گرنگترین دینەمۆکانی ڕۆح. لەگەڵ ئەودا لە شتان تێدەگەین و، پەی بە ئەودیویان دەبەین و هەڵیاندەسەنگێنین، پێچەوانەی ئەمەش بریتییە لە بێعەقڵی و گەمژەیی و نەفامی. بێعەقڵ و گەمژە و نەفامەکان وەك ڕێبوارانی ئاوارە و بێئامانجی ڕێگا نامەعقوولەکان وان و، نە لە کتێبی گەردوون تێدەگەن و، نە هاودەمی لەگەڵ بوونەوەراندا دروستدەکەن و، نە قورئان دەبیستن و، نە ئاوەزیشیان بە نهێنییەکانی تەکلیف دەشکێت.. بەڵێ، کەسانی لەم شێوەیە مەحاڵە لە دین و، ڕۆحی دین و، ئامانج و مەبەستی بوون تێبگەن. ئەم وتەیە دراوەتە پاڵ پێغەمبەرمان: "ئەحمەق دوژمنی ئێمەیە." مەولانای ڕۆمی ئەم وتەیە دەکات بە ناونیشانی یەکێك لە شیعرەکانی و چەشنی وەستایەکی کارامەی وشە بەم جۆرە دەردی دڵی خۆی بەیان دەکات:

(پێغەمبەر دەفەرمووێت "ئەحمەق دوژمنی ئێمەیە، چەتەکانیش ڕێمان پێدەگرن." مرۆڤی ژێر گیانی ئێمەیە. ئەو با فێنکەی لەوەوە هەڵدەکات بۆنی ڕێحانە و شەوبۆمان بۆ دێنێت. ئەگەر عاقڵا لێم تووڕەببێت و جوێنیشم پێبدات، سەرم دادەخەم و دەنگ ناکەم. چونکە عەقڵ لە لایەن ئەو زاتەوەیە کە هەمیشە بەرەکەتم بەسەردا دەبارێنێت... بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ئەحمەق حەڵواش بکات بە دەممەوە، تام لێدێت و پێی نەخۆش دەکەوم!)

لە دیدی گەورە پیاوانی دیکەی تەسەوفیشەوە ئەو "عەقڵی ئاسمانی"یەی کە پشتی بە جیهانەکانی ئەودیو بەستووە، وەك زنجیرێك وایە لە ملی ئارەزووە جەستەییەکاندا. ئارەزووە جەستەییەکانی وەك هەڵپە و، تووڕەبوون و، شەهوەت هەتا ئەم زنجیرە نەشکێنن ناتوانن گوزارشت لە خۆیان بکەن. عەقڵ بەم مانایە، قوفڵی پۆلایینە بۆ پاراستنی بەها مرۆییەکان و کلیلی ئەفسووناویشە بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی. عەقڵ لغاوێکە لە دەمی ئارەزووە نەفسییەکاندا و، زنجیرێکە بۆ زاری و، جووتێك باڵی فریشتەئاسایە بۆ پەروازی ڕۆح بەرەو هەتاهەتایی. لەوانەیە نەفس هەموو ساتێك بە تووڕەهات و وڕێنەکانی، مرۆڤ پەلکێشی چەندەها کێشە و گرفت بکات، کەچی لەبەرامبەر ئەمەدا عەقڵ هێزێکی ئاسمانیی وایە کە نەخشەکانی ئەو پووچەڵ دەکاتەوە. بەتایبەت ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ دڵ هەبێت و پشت بە واریداتەکانی ببەستێت، ئیدی هیچ دوژمنێك نییە ئەم تەختی زەوی نەکات و بەسەریدا سەرنەکەوێت. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر عەقڵ لە دڵ داببڕێت و، لە ئاسمانییەوە بگۆڕێت بە زەمینی، ئەوا دەبێت بە خیانەتکارێکی وا کە ڕێ نیشانی دوژمنان دەدات. دەچێت لایەنی شەهوەت دەگرێت.. پشتیوانی لە قین و نەفرەت دەکات.. دەست دەداتە جەربەزەیی و هەوڵی دوژمنایەتی دەدات بەرامبەر هەر شتێکی ئاسمانی.. نوقمی جەدەل دەبێت و دەستدەکات بە پیشاندانی ناحەق بە حەق، جەدەل بە مەعریفەت ئەژماردەکات، بەجۆرێك تێکەڵاوی مشتومڕەکان دەبێت کە هەمیشە دووبەرەکی و ناکۆکیی لێدەکەوێتەوە، وە سەرکەوتن بەسەر کەسانی تردا و شەرمەزارکردنیان بە هونەر دەزانێت.. زوو زوو دڵی خۆی دەکوژێت و لەسەر داروپەردووەکەشی خێوەت بۆ

نەفسی هەڵدەدات.. هەموو ڕۆژێك چەند جارێك تێکەڵی بۆگەنییەکی وا دەبێت کە دڵی شەیتان خۆشدەکات و خەنجەر لە ڕۆحی خۆی دەدات.

عەقڵێك کە تا ئەم ئەندازەیە زنجیری بچڕاندووە و بووە بە هۆکاری هاری و زیان، دیسان مەولانا گوتەنی، سەرچاوەی وەهم و گومانەکانە. پێویستە ئەم عەقڵە لادەر و زیانبەخشە لە بەردەم حەزرەتی موستەفادا بکرێت بە قوربانی. "فوزولی" خوا لێی خۆشبێت دوو قسەی هەیە لەگەڵ ئەم عەقڵە شوومەدا:

"من لە عەقڵم دەوێت دەلالی،
ئەو نیشانم دەدات گومڕایی.."

ئێراسموس (Erasmus) نووسەری هۆڵەندی و دانەری کتێبی "ستایشی شێتی"، هەمیشە گاڵتە بە عەقڵێکی لەم جۆرە دەکات و پێداگرە لەسەر ئەوەی کە بەکەڵکی هیچ نایەت.

لەژێر ڕۆشنایی دەستووری "ئەگەر شتێکی بەنرخ تێکبچێت لە شتە زیانبەخشەکان زیاتر زیانی دەبێت"، دەتوانین بڵێین: ئەم عەقڵەی کە گرنگترین لایەنی مرۆڤە و لە زیندەوەرەکانی تری جیادەکاتەوە و، ئەم گەوهەرە مەزنەی کە بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاستی قسەبۆکراوی لەبەرامبەر خوای گەورەدا و، ئەم یەکەم مامۆستا و ڕابەرەی کە ئادەمیزاد سەردەخات بە پلەکانی ژیانی ڕۆح و دڵدا، تا ئەو کاتەی لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ وەحی و، لایەنی ئاسمانیی خۆی بپارێزێت و، پەڕاوی گەردوون بخوێنێتەوە و، موتالاکانیشی بگۆڕێت بە مەعریفەت،

مرۆڤێکی لەم شێوەیە لەگەڵ فریشتەکاندا جیاوازییەکی نییە. کاتێکیش لە خوا دادەبڕێت و، دەبەسترێت بە سروشت یان نەفسەوە، دەگۆڕێت بە مار و دوپشك لە جەستەی مرۆڤدا و، لەحاڵێکدا کە دەکرا ئاوی ژیانی زیندووبوونەوەی هەتاهەتایی بێت، دەبێت بە ژەهری مەرگێکی ناکۆتا.

## سەرچاوە سەرەکییەکانی
## میراتی ڕۆشنبیریمان

زۆرێك کۆکن لەسەر ئەوەی کلتوور بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە میللەتێك بەدرێژایی مێژوو بەرهەمی هێناون و بەتێپەڕبوونی کاتیش بووە بە ڕەهەندێکی ژیانی میللی، یاخود بریتییە لە کۆی ئەو یاسا و ڕێسا ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییانەی کە لە ئەستی میللەتدا ڕەگیان داکوتیوە. بەگوێرەی ئەم بۆچوونە، هەرچەندە هەندێك تایبەتمەندیی بنەڕەتیی کلتوور جیهانییە، بەڵام ئەوەش ڕوونە کە لە کۆمەڵگا و جوگرافیا کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا کلتوورێکی جیاواز فەرمانڕەوایە. بێگومان ئەم جیاوازییەش تا ئەندازەیەکی زۆر هۆکارێکی گرنگ و بەهێزە لە سیستەمە فیکرییەکاندا. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کلتوور بریتییە لەو چوارچێوەیەی کە وەك ئامرازێك تاك دەتوانێت لێیەوە گوزارشت لە بیر و بۆچوونەکانی ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراو بکات.

ژمارەی ئەوانەش کەم نین کە کلتووریان بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەست کردووە بە فیکرەوە و، بەجۆرێك ڕاڤەیان کرووە وەك ئەوەی بریتی

بێت لە کۆی ئەو شێوازانەی کە نەتەوەیەك لە نەتەوەکان -بەیارمەتیی هەموو شێوازەکانی دەربڕین یاخود زۆربەیان- بەهۆیانەوە گوزارشتی لە بەها ڕەوشتییەکانی و، بیروباوەڕی و، بۆچوونەکانی لەمەڕ بوون و گەردوون و مرۆڤ و، هەڵسوکەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی و، یاسا و ڕێسای ڕەفتارەکانی دەکات... هەروەها بریتییە لە کۆی ئەو فیکر و، هونەر و، دابونەریت و عادەتانەی -ئەم دوانەی کۆتایی لە چەند لاپەڕەی داهاتوودا هەندێك سنووریان بۆ دەکێشین- کە بەدرێژایی مێژوو و لە چوارچێوەی بیرکردنەوە و جیهانبینیی میللیدا لەسەر یەك کۆبوونەتەوە.

لە سیستەمی کلتووریی ئێمەدا وەك موسڵمان پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و گەردوون و خوا -بەجۆرێك کە لەم ڕیزبەندییەدا ئەسڵ و پاشکۆ پێکەوە موتالاکراون- لە سەرەکیترین بنچینەکانە و، هەموو چالاکییە زیهنی و فیکری و کردارییەکانمان وەك سەرچاوەیەك دەگەڕێنەوە بۆ ئەم پەیوەندییە بنەڕەتییە. لۆجیکی ئەورووپیی مۆدێرن -کە لەڕاستیدا میراتیی یۆنانی کۆنە- هەموو بیری خۆی ئاڕاستەی مرۆڤ و شت و ڕووداوەکان دەکات و، لە دەرەنجامی ئەمەشدا یان هیچ گرنگی بە حەقیقەتی خوایەتی نادات یاخود وەك بابەتێکی پاشکۆ مامەڵەی لەگەڵ دەکات. لەحاڵێکدا لە سیستەمی بیرکردنەوەی ئێمەدا مرۆڤ و بوونەوەران وەك پێشانگایەك و کتێبێك، چەشنی زار و زمان و ئامراز وان بۆ باسکردنی زاتی هەرە مەزن و، بەدیهاتووە هونەرییەکانی و کاروبارە سەرسووڕهێنەرەکانی. لە لۆجیکی مۆدێرنی ڕۆژئاوادا کە بە پاشکۆی

فەلسەفەی یۆنانی دادەنرێت، عەقڵی کارا لە تەنیشت بۆچوونی خوایەتی ناکاراوەیە. بەڵام بەپێچەوانەوە لە کلتووری ئێمەی موسڵماندا هەمیشە پەیوەندیی نێوان هونەر و هونەرمەند، بەدیهاتوو و بەدیهێنەر، سنعەت و خاوەنی سنعەت دەستبەکارە. ئێمە لە سیستەمی بیرکردنەوەی خۆماندا مرۆڤ و گەردوون وەك ئامرازگەلێك هەڵدەسەنگێنین کە دەمانگەیەنن بە ئاسۆیەکی عیرفانیی دیاریکراو و، ڕوو لە هونەرمەندی هەرە مەزن دەکەین و، بەشوێن ئەودا دەگەڕێین. بەڵام خەڵکانی تر، تەنها لەسەر ئەنجام و کاریگەرییە کردارییەکانی بۆچوونی خوایەتی هەڵوێستە دەکەن و، هەموو شتێك دەگێڕنەوە بۆ شتان و ڕووداوەکان. جگەلەوەش ئێمە لەپاڵ عەقڵی کارادا هەموو شتێك پەیوەست دەکەین بە چوارچێوەی قورئان و سوننەتەوە. بەڵام ئەوان عەقڵ و ئەزموون بە تاکە سەرچاوەی زانیاریی دادەنێن و، بەجۆرێك لە جۆرەکان ڕێگاکانی زانست و مەعریفەت تەسك دەکەنەوە.

بەکورتی و پوختی کلتوور کۆی ئەو چەمك و یاسا و پاڵنەرانەیە کە مرۆڤ دەیانزانێت و، باوەڕی پێکردوون و لە ژیانیدا ڕەنگیانداوەتەوە، بەجۆرێك بووە بە بەشێك لە سروشتی و وەك دۆسیەیەکی زانیاریی لێهاتووە لە نەستیدا... هەربۆیە دیاردەیەکی مەعریفییە و هەست بە بوون و کاریگەرییەکەی دەکرێت لە کاتە جیاوازەکاندا، تەنانەت لە دەمی ئامادەنەبوونی شعوور و ئیرادەشدا.

بەڵێ، زۆر باوەڕ و، قبووڵ و، عادەت و دابونەریت هەن کە لە ڕۆحدا دایانکوتیوە و لە نەستیشدا نووستوون، بەڵام جاروبار دینەمۆ ناوەکییەکانی

عەقڵ بەیارمەتیی هەندێك هۆکار و پاڵنەر ئەم پێکهاتانە بێداردەکاتەوە و، زیندوویاندەکاتەوە و، دەیانخاتە جوڵە و، شکڵ و شێوەیان پێدەدات. جاری وایە ڕێك بە شێوە ڕوون و خاوێنەکەی جاران دەردەکەونەوە، جاری وایش هەیە هەندێك ڕەنگیان پەڕیوە و کاڵ بوونەتەوە. بەڵام ئەو پێکهاتانە چەند قووڵیش ڕۆچووبن بەناو دەمارەکانی ڕۆحدا، هێشتا بەتەواوەتی وەك شێوەکەی جارانی ناتوانێت لەئێستادا خۆی بنوێنێت، چونکە هەموو ڕۆژێکی نوێ جیهانێکی سەربەخۆیە. هەموو ڕۆژێك کاتێك هەڵدێت هاوڕێ لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی خۆی هەڵدێت و لەگەڵ ئەوانیشدا ئاوادەبێت. لەم ڕووەوە ئێمە نامانەوێت پێکهاتەکانی ناو نەستمان وەك شتانێکی کۆن دووبارە بکەینەوە، بەڵکو لەژێر ڕۆشنایی هەلومەرجە جیاوازەکاندا هەندێك قووڵایی نوێی پێدەبەخشین و بەو جۆرە دەیهێنینەوە مەیدان. ڕاستتر بڵێین ئەو پێکهاتانە هاودەم لەگەڵ ڕەنگ و قووڵایی نوێ کە بنەچە و نەسڵیان ڕاست و ڕوونە، سەرلەنوێ دێنەوە ناو ژیانمان. لێرەدا جێی خۆیەتی پەنجە بخەینە سەر هەڵەیەك کە بەبەردەوامی دووپاتی دەکەینەوە. لەبری ئەوەی شتە کۆنەکان بناغەیەکی توندوتۆڵ بۆ شتە نوێیەکان فەراهەم بهێنن و تازە ئەوەندەی تر کۆن ڕوونبکاتەوە و گەشەی پێبدات، ئێمە زۆربەی جار وا لەبابەتەکە دەڕوانین وەك ئەوەی دوو کاتی جیاواز و لەیەکدابڕاوبن و، جاری وایە ئەم دوو دەمەی کات دەدەین بەیەکدا و، جاری وایش هەیە دوژمنایەتییان لەنێواندا سازدەکەین و هەمیشە دەبین بە هۆکاری کۆمەڵێك قەیران لەسەر ئاستی بناغەکان. یاخود هەندێك جار وتوومانە "تازەکان بۆنیان پێوە دەکرێت و پاشان دەخرێنە زبڵدانەوە، بەڵام کۆنەکان وەکو میسك و عەنبەر وان، چەند

دەستیان بەربکەوێت ئەوەندەی تر بۆنی خۆش بڵاودەکەنەوە." بەم جۆرە لەمەڕ واریداتەکانی لایەنێکی کات گرفتاری زیادەڕەوی بووین. یاخود بە وتنی "چی لە شتانی کۆن و بەسەرچوو سەوزدەبێت؟ پێویستە لە دونیای ڕەنگاوڕەنگی داهاتوودا بەشوێن هەموو داخوازییەکانماندا بگەڕێین!"، بەمەش تەواو خۆمان بێنیاز کردووە لە لایەنەکەی تری کات و، لەئەنجامیشدا هەم لە چەمکی میللیی کات غافڵ بووین و هەم ڕەهەندی گەردوونیی بابەتەکەمان فەرامۆش کردووە.

لەحاڵێکدا ئێمە ناچارین زەمینەیەکی لەبار بۆ "کات"ێکی کلتووریی نوێ دەستەبەربکەین کە گەشە بە ژیانی فیکریمان بدات و، ڕاڤەیەکی قووڵی کلتوورمان بکەین و، بەوردی هەڵیبسەنگێنین، ئەمەش نەك تەنها لەبەر خاتری جوگرافیای ئێستامان، بەڵکو بۆ دامەزراندنی پردێکی توندوتۆڵ و هەمیشەیی لە نێوان خۆمان و دونیای هاوچەرخدا. بە دەربڕینێکی تر، لەپێناو پێکهێنانی جیهانبینییەکی کلتووریی توندوتۆڵ و ڕەگداکوتاو و تەمەندرێژتر لەناوماندا، "ناچارین" بەهاکانی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی -لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەولەوییەت بۆ ئایندە- نەکەین بە قوربانی یەکتر و، بەهەمان ئەندازە کراوەبین بەڕووی بەردەوامیی مێژوو و فراوانبوونیدا. لەڕاستیدا "کاتی کلتووری" وابەستەی چەمکەکانی وەك هەبوونی پێشتر و دواتر پەیدابوون نییە و جیاوازە لەو بۆچوونەمان لەمەڕ کاتی ئاسایی کە پێی ڕاهاتووین. پێم وایە وا گونجاوترە بە "سەروو کات" ناوی بێنین. تەنانەت لەوانەیە سەیرکردنی وەك ئەوەی دیاردەیەکی "دابڕاو"بێت لە کات، لەجێگای خۆیدابێت. خۆی لەخۆیدا بەردەوامیی کلتوور بەندە لەسەر ئەم سەربەخۆیی و دابڕانەیەوە لە کات.

بەڵام ئەوەش ڕوونە کە کلتوور چوارچێوەیەکی وای هەیە کە شکڵ و شێوە بە بنیاتی تەواو سەربەخۆی ئەو دەدات و شێوازی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەلومەرجە جیاوازەکاندا دەستنیشان دەکات. لەم ڕوانگەیەوە و لەناو چوارچێوەیەکی لەم جۆرەدا، دەتوانین بڵێین: کلتوور و ڕۆشنبیریی بریتییە لە کۆی چەمکە جیاوازەکان و، ڕێگا جۆراوجۆرەکانی بیرکردنەوە و، گۆشەنیگا جیاوازەکان و، بەها ئەخلاقییەکان و، جیهانبینییە هونەرییەکان کە هەریەکەیان وابەستەی ڕاڤەیەکن و بابەتەکانی تری هاوشێوەیان.

بەڵام کۆمەڵێك بنچینەی وا هەن کە ناچارین هەموو چەمك و، شێوازەکانی بیرکردنەوە و، ڕاڤە و، جیهانبینییەکانیان لەسەر بنیات بنێین. کلتووریش بە سەرجەم ڕەنگەکانیەوە بە چواردەوری ئەم بناغانەدا بازنەی یەك لەدوای یەك دەکێشێت.. هەروەها لەوانەوە خۆراك وەردەگرێت و گەشەدەکات، تا لەئەنجامدا حاڵەتێکی سەروو کات و شوێن وەردەگرێت. قورئان و سوننەت لە پێشی پێشەوەی ئەم بناغانە دێن. بەنیازین لە چەند لاپەڕەی داهاتوودا بەکورتی و لە شێوەی بیرخستنەوەدا ئاماژە بەم دوو بناغەیە بدەین. هەر لەهەمان ئەم چوارچێوەیەدا و لەژێر ڕۆشنایی ئەم دوو بناغەیەدا کۆمەڵێك زانستی تری وەك تەفسیر و، فەرموودە و، ئوسوڵی تەفسیر و، ئوسوڵی فەرموودە و، فیقهـ و ئوسوڵی فیقهـ هەن. بەتایبەت فیقهـ و ئوسوڵی فیقهـ (میتۆدۆلۆجیی فیقهـ)، هەم لەو ڕووەوە کە بەرهەمی هەوڵ و کۆششێکی جددین و، هەم لەو لایەنەشەوە کە سەرچاوەگەلێکی هێندە کراوەن بەڕووی دەوڵەمەندبوون و فراوانبووندا کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وێنەیەکی تریان نییە، ئەوا ئەو میللەتانەی

خاوەنی ئەم سەرچاوانەن، مانای وایە گرنگترین شتیان دەست کەوتووە. هەموو شارستانێتییەك کۆمەڵێك بەهای تایبەتی وای هەن کە شانازییان پێوە دەکات. فیقهـ و ئوسولی فیقهیش یەکێکن لە هەرە دیارترین بەهاکانی شارستانێتیی ئێمە. بەجۆرێك ئەگەر پێویستی بکردایە ناوێك بۆ شارستانێتیی ڕابردووی خۆمان هەڵبژێرین، ئەوا شتێکی گونجاو دەبوو ئەگەر ناوی شارستانێتیی "فیقهـ" یان "ئوسولی فیقهـ"مان لێ بنایە. شارستانێتییەکی فیقهـ و ئوسولی فیقهی وا کە تا سەر پشت دەرگاکانی بەڕووی بیرکردنەوە و، حیکمەت و، فەلسەفەدا کراوەن.. یۆنانی کۆن شارستانێتییەکی فەلسەفی بوو. شارستانێتییەکانی بابل و حەڕڕان، عیرفانی (Gnostism) بوون. شارستانێتیی ئەورووپیی ئەمڕۆش شارستانێتیی زانست و تەکنەلۆجیایە. لەبەرامبەردا شارستانێتیی ئێمە کە چەندین سەدەیە بەردەوامە، شارستانێتییەکی فیقهـ و ئوسولی فیقهی وایە کە کراوەیە بەڕووی هەموو کەسێکدا و، خولگەکەشی بیرکردنەوە و عەقڵ و لۆجیك و داوەریی ژیرییە. سەیید بەگ و موحەممەد حەمیدولڵا و چەندین بیرمەندی دیکەش ئاماژەیان کردووە بەوەی کە هەوڵەکان لەمەڕ میتۆدۆلۆجیی فیقهـ جددیترین و یەکەمین هەوڵە لە بوارەکانی پێکهێنان و بەرەوپێشچوونی کامڵترین زانستی یاسا و سیستەمی یاسایی و، کرانەوە بەڕووی سەرجەم چەرخ و سەردەمەکاندا. بەتایبەت ئەم یەکەم هەوڵ و ئەم زانستە لەو ڕوانگەیەوە کە دەتوانێت کاریگەربێت لە دروستکردن و پێکهێنانی زانستی دیکەدا، گونجاوە بۆ ئەوەی ببێت بە سەرچاوە بۆ کلتوور و شارستانێتییەکانی تریش.

هەمیشە کۆمەڵگا جیاوازەکان خاوەنی سیستەمی یاسایی جۆراوجۆر بوون. هەر لە ڕۆمانییەکان و، چینییەکان و هیندییەکانەوە هەتا یۆنانییەکان... بەڵام هەرگیز نە تابلۆی یۆنانییەکان و، نە یاساکانی کاسیوس (Casius)ی ڕۆمانییەکان و، نە دەقە یاسایی و بەیاننامە مۆدێرنەکان نەیانتوانیوە بیبەستنەوە بە یاسا و بنچینەی جێگیر و زانستێکی میتۆدۆلۆجیی وەك ئەوەی لە سیستەمی فیقهی ئیسلامیدا دەبینرێت. هەربۆیە مەحاڵە زانستێکی لەم جۆرە کە بناغەکەی بریتییە لە قورئان و، سوننەت و، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی پیاوچاکانی پێشین، لە میللەتێکی دیکەدا بوونی هەبێت.

فەلسەفە، بریتییە لە بەرهەمی لۆجیکێکی هەمیشە گەشەسەندوو کە وەڵامدانەوەی پێداویستی و داخوازییەکانی سەردەمە جۆراوجۆرەکانی کردووە بە ئامانجی خۆی. لە شارستانێتیی ئێمەشدا میتۆدۆلۆجیی فیقهـ بەدرێژایی مێژوو هەمان ئەرکی بینیوە بۆ سیستەمە یاساییەکانمان. فیقهـ و یاسا ئەرکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لە ڕێگەی ڕێساکانەوە دەگرنە ئەستۆ. هەرچی ئوسوڵی فیقهیشە، ڕابەرایەتیی سیستەمەکانی فیقهـ و یاسا دەکات. "ژیریی ساغ و تەندروست"یش بەگوێرەی حاڵەتی بابەتەکە بڕیار لەسەر جۆری ئەو میتۆدە دەدات کە لەم ڕابەرایەتیکردنەدا بەکاردەهێنرێن. کاریگەریی مەزنی شێواز و میتۆدێکی لەم جۆرەش لەسەر باش حاڵیبوون لە بابەتە یاساییەکان شتێکی ڕوون و ئاشکرایە. لەڕاستیدا ئەو شتانەی کە دەربارەی فیقهـ و ئوسوڵی فیقهـ دەوترێن، بۆ هەموو ئەو زانستانەی دیکەش ڕاستن کە وابەستەی قورئان و سوننەتن. گەرچی لەسەر کتێبە پیرۆزەکانی دیکەش کۆمەڵێك کاری

جۆراوجۆر کراون و پەرە بە هەندێك سیستەم دراوە کە پەیوەندیدارن پێیانەوە، بەڵام کار و چالاکییە چڕبووەوەکان لەمەڕ قورئان و سوننەت و ئەو تەفسیرانەش کە خراونەتە مەیدان، هەمیشە ڕووداوێکی ناوازەیە و شایانی بەرزنرخاندنە. بەڵێ قورئان، چ ئەو تەفسیرانەی کە ڕاستەوخۆ لە لایەن پێغەمبەرەوە بۆی کراوە و، چ ئەو تەفسیر و تەئویلانەش بێت کە هاوڕێ لەگەڵ ڕەچاوکردنی یاساکانی زمان و، شێوازی تایبەتی زمانی عەرەبی و هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان، لە لایەن زانایانەوە خراونەتە گۆڕێ، بووە بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ژیانی فیکریمان. بەجۆرێك ئەگەر کەسێك بەشێوەیەکی زۆر سەرپێیی و ڕواڵەتییانەش لێی بڕوانێت، تێدەگات سەروەتێکی چەند مەزنە. دەکرێت هەموو کاتێك هەمان شتیش دەربارەی فەرموودە بوترێت. بەڵام ئەوەندە هەیە پێویستە کەسانی بەوەفا و خاوەن زیرەکیی لێهاتوو خۆیان بکەن بە خاوەنی و، باسی بکەن و ڕوونی بکەنەوە. ئەگینا ئەم کانیاوە بەخوڕ و خاوێنانە دەخوازرێت لە ڕێگای دوژمنایەتیی ترسناکی دوژمنان و بێوەفایی یان بێدەنگیی دۆستانییەوە لێڵ بکرێن، یاخود بەتەوەواتی بە نەبوو دابنرێن. لەئەنجامدا لەوانەیە خوانەخواستە ماوەیەکی دووروودرێژ وەکو ئوممەت ماڵمان پڕبێت لە ڕازیانە و کەچی بە ژانەسك بمرین!

دەتوانین لە چوارچێوەی ئەم دوو سەرچاوە[۱] مەزنەدا، ئەم بابەتانەی لای خوارەوە وەك سەرچاوە پاشکۆکان ئەژماربکەین: "زانستی کەلام" و بابەتە قبوولکراوەکانی لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت و، هەوڵدانی بۆ سەلماندنی عەقیدەی ئیسلامی بەیارمەتیی بەڵگە عەقلی و

۱. مەبەست لێی قورئان و سوننەتە.

نەقڵییەکان و، ڕەواندنەوەی گومان و وەهمەکان لە دەوری دینەکەمان و، وەڵامدانەوەی بۆچوونە فەلسەفییە چەوتەکانی وەك شوبهاندن (التشبیه) و جیسماندن (التجسیم). بوونی سیفەتە خواییەکان و دەستنیشانکردنی چۆنێتییەکەیان، بابەتەکانی وەك "باشتر" (الإصلح) و جوانی و ناشرینی (حسن و قبح).. هەروەها باسەکانی وەك: بەرژەوەندی و، ئاسانکاری و، عادەت و، دابونەریت و کردارەکان.

ڕوونکردنەوەی تەنها یەکێك لەم سەرچاوانە چەندین کتێبی دەوێت، لەبەرئەوە لێرەدا تەنها بەجۆرێکی گشتی و لەشێوەی چەند هێمایەکی خێرادا ئاماژە بە هەندێك لەم سەرچاوانە دەکەین:

## ١. قورئان

ئەو کتێبەی کە وشەی پیرۆزی "قورئان"ی لێ نراوە، چاوی دڵی مرۆڤ دەکاتەوە و، هەستەکانی فراوان دەکات و قووڵیی دەبەخشێت بە بیرکردنەوەکانی.. جۆرە جیاوازەکانی ڕەوانبێژییەکەی -ڕوون و دامەزراو (المحکم)و، چوواندن (المتشابە)و، دەق و، ڕوخسار (ظاهر) و، کورتبڕی (المجمل) و، ڕوونکردنەوە (المفصل).. هەروەها هێما (إماء) و، نیشانە (إشارة) و، خوازە (إستعارة) و، مەجاز و، چوواندن (تشبیە) و، نمونەهێنانەوە (تمثیل) و، کینایە..- سەرچاوەیەکی هێندە دەوڵەمەندە کە ژیرییەکان سەرسام دەکات و، خاوەنی هێزێکی کرانەوە و فراوانبوونی وایە کە بەشی سەرجەم چاخ و سەردەمەکان دەکات. بەڵام ئەوەندە هەیە سوودوەرگرتن لێی یان سوودمەندبوون بەقەدەر گەورەی و قووڵییەکەی،

کەمێك بەندە لەسەر کرانەوەی دەرگای بیرکردنەوە بەویژدانەکان بەڕوویدا. بەڵێ، ڕاستە کە ئەو کتێبێکە لەسەروو کات و شوێنەوە، بەڵام جاری وایە لاری و چەوتیی نیەت یان ڕوانین، ئەو لە شوێنی بەرزی خۆیەوە دادەبەزێنێتە خوارەوە و لە تەسکیی بیرکردنەوە ئادەمییەکاندا بەندی دەکەن. ئەوانەی کە ڕوانگەیەکی لەم شێوەیە یاخود لادانی فیکرییان هەیە، هەرگیز ناتوانن ئەو قووڵاییە سەرسووڕهێنەرە ببینن کە تایبەتە بە ئەو. لەڕاستیدا ئەو ڕۆحە کۆنانەی کە بەچەند بڕیارێکی لەپێشین کەلەپچەیان لە دەستی بیرکردنەوەی خۆیان توندکردووە، لە هەر کات و ڕۆژگارێکدا بژین، هیچ کاتێك ناتوانن پەی بە نهێنییەکانی ئەم کتێبە ببەن کە لە دەربڕین و ڕەوانبێژییەکەیدا بێهاوتایە و، ناتوانن خۆی و ئاسۆ موعجیزەئاساکەی ببینن. ئەو هەمیشە کتێبێکی لوتکەیە و ئاسۆی مرۆڤ تێدەپەڕێنێت و، شەپۆلە جۆراوجۆرەکانی تەفسیر و تەئویلیش دەیکەن بە گوفتارێکی بێوێنە، بەڵام بۆ ئەوانەی کە بە دڵێکی پاکەوە سینەی خۆیانی بۆ دەکەنەوە.. ئەو کەرەمێکی خواییە بۆ مرۆڤایەتی، ناسینی ئەو و گەڕانەوە بۆ لای لە هەموو بابەت و گرفتەکانیشدا، بەختێکە لەسەروو هەموو بەختەکانی ترەوە. بەڵام داخۆ چەند کەس هەن ئاگاداری ئەم "بەخت"وەرییەن؟! لەڕاستیدا بەبێ پەنابردن بۆ ڕووناکیی ئەو هەروەك ئەستەمە هیچ کێشەیەکی مرۆیی چارەسەربکرێت، بەهەمان جۆر مەحاڵیشە بەبێ ئەوەی گوفتارە بەپێزەکەی ئەو بکرێتە بناغە، بەختەوەرییەکی دوورمەودا بۆ مرۆڤ دەستەبەربێت.

هەتا ئەمڕۆ چەندین مامۆستای وشە پەیکەری ئەفسووناوییان لە کەرەستەکانی ڕەوانبێژی سازکردووە و، چەندەها بیریاریش سیستەمی

فەلسەفی و نمونەییان دامەزراندووە. بەڵام هەنووکە هەموو ئەو پەیکەرانە وردوخاش بوون و، سیستەمە نمونەییەکانیش وەك چەند دێڕێکی یادگاریی ڕەنگپەڕیو ماونەتەوە لە دووتوێی لاپەڕەکانی مێژوودا. ئەگەر گوفتار و دەربڕینێك هەبێت کە لەو ڕۆژەوەی بەسەر ئاسۆی مرۆڤدا هەڵهاتووە هەر بە تازەیی مابێتەوە، ئەوا ئەم قورئانەیە و، سیستەمێکیش هەبێت مرۆڤ بگەیەنێت بە کەناری ئارامی و ڕزگاری تەنها ناوەرۆکی ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە. لە گوفتاری ئەودا هێزێکی ڕاکێشەری هێندە ڕوون و ئەفسووناوی هەیە کە دەنگی بە هەر جێیەك بگات، ئیدی وتەکانی تر وەك شتانی پڕوپووچ دەردەکەون. لەهەمبەر دەوڵەمەندیی ناوەرۆکەکەشیدا زێڕەنگەرانی بیر و سیستەم وەك سواڵکەریان لێدێت.

ئەم کتێبەی کە وەرگێڕی حەقیقەتی مرۆڤ و بوون و بەدیهێنەرە، ئەوەندە بەوردی حەقیقەتی ئادەمیزاد شیتەڵ دەکات و، هێندە هەستیار و هاوسەنگانە شتان و ڕووداوەکان هەڵدەسەنگێنێت، بەجۆرێك ئەگەر هەر کەسێك سەرنجێکی کەمی لێبدات، نزیکە بە چاوی خۆی لەوسەری ئەم شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەدا "ڕەهایی" ببینێت. لەبەر ئەم هۆیە، ئەو مرۆڤانەی کە خاوەنی دڵ و ڕۆحن و توانیویانە لە دەرگای ئەو قورئانەوە بچنە جیهانە ئەفسووناوییەکەیەوە، ئیدی هەر شتێك لە ڕۆحی خۆیاندا وەك پێڕست و پوختە هەستی پێبکەن، لە شێوەی کتێبێکی ڕوونکەرەوەی دووروودرێژدا لە گەردووندا دەیبینن و، ژیانیان لە جیهانی هێما و ئاماژەکاندا بەسەردەبەن و هەمیشە وەك گەشتیارێك بەرەو ڕووی ئەو دەڕۆن.

بەڵێ، ئەم کتێبە بەجۆرێك ئاسۆی عیرفانمان ڕۆشن دەکاتەوە، کاتێك مرۆڤ بە چاوساغی و ڕابەرایەتیی ئەو ڕووەو "عەرشی کەماڵات"ی دڵی خۆی هەنگاودەنێت، نە هەست بە نامۆیی ڕێگا دەکات و، نە دووچاریی چەقینی بیرکردنەوە دەبێتەوە و نە تووشی خنکانی ڕۆح دەبێت.. لەم ڕێگایەدا کە پێکەوە و لەناو یەکدا هەست بە زانست و هەیەجان، ئیمان و موشاهەدە، قورسایی کۆڵی پشت و ئاسوودەیی، پەیوەست بوون بە ڕێسا و هەستکردن بە ئاسایش دەکرێت، ئەم گەشتیارە هەردەم بەرەو لوتکەکان ڕێدەکات.. بەرزدەبێتەوە بۆ لوتکە دەست پێنەگەیشتووەکان.. وە دەگات بە ئاسۆیەك بۆ بینینی ڕوخساری گەشی بەختی خۆی.

ئەم کتێبە بە هێما و ئاماژەکانی تیشك دەخاتە سەر قووڵاییەکانی ناوەوەی مرۆڤ و گەردوون و، فراوانیی ڕۆحی ئادەمیزاد و، ڕەهەندە گرنگەکانی وەك هەست و شعوور و ئیرادە و دڵ و، ئامانج و مانای بەدیهاتنی ئەم بوونەوەرە ناوازەیەی کە بەدیهاتنەکەی لە هەمان کاتدا بە لەدایکبوونی گەردوونیش دادەنرێت و، بەرزیی توانا و لێهاتنەکانی و، فراوانیی بازنەی کاروبارەکانی و، مەزنییە شاراوەکەی و، ئارەزوو ئاوات و خۆزگە و جۆشوخرۆشەکانی.. بەڵێ، ئەم کتێبە بەجۆرێك ئەم بابەتانە ڕووندەکاتەوە کە زانستەکانی وەك فەلسەفە و، کۆمەڵناسی و، زیندەوەرزانی و، دەروونناسی و پەروەردە تەنانەت بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە.

کەسێك ئەم کتێبە بناسێت، باوەڕناکەم پێویستی بە سەرچاوەیەکی تر -جگە لە حاڵەتی شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە و وردەکارییەکان- هەبێت لە بابەتە بنەڕەتییەکانی پەیوەندیدار بە مرۆڤ و گەردوون و خوادا. لەڕاستیدا

پێویستە ئەم شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە و وردەکارییانەش دیسان لە چوارچێوەی ئەودابن و، پشت بە گوفتارێکی پێغەمبەر، یان موشاهەدە و داوەرییەکی ژیریی توندوتۆڵ، یاخود بەڵگەی عەقڵی ببەستن. ئەمەش مانای ئەوەیە کە دواجار هەموو شتێك بەدەوری تەوەرەی ئەودا دێت و دەچێت.

ئەم کتێبە بە دابەزینی بۆ سەر پیرۆزترین و بەختەوەرترین مرۆڤ و، لە خاڵێکی گرنگی مێژوودا کە بە سەرەتای وەرچەرخان دادەنرێت، ڕێکخستنی ژیانی کەسی و، کۆمەڵایەتی و، سیاسی و، ئیداری و، ئابووری و، ڕۆحی و فیکریی کۆمەڵگایەکی بەختەوەری کرد بە ئامانجی خۆی و، ئامانجەکانیشی لە چاوتروکاندنێکدا و بە یەك هەڵمەت هێنایەدی و، بوو بە تاکە سەرچاوەی ئیلهامی چەندەها گۆڕانی یەك لەسەر یەك لەناو کۆمەڵێکی دەشتەکیدا، بەجۆرێك ئەم ڕووداوە دەتوانێت ببێت بە نمونەی سەرمەشق بۆ میللەتانی خاوەن شارستانێتی. لەڕاستیدا ئەو هەنووکەش هەمان هێز و دەوڵەمەندیی هەیە بۆ ڕاپەڕاندنی هەمان کاروبار سەبارەت بەوانەی کە پەنای بۆ دەبەن. بەڵێ، ئەم کتێبە لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و گەردوون و خودا خاوەنی دەوڵەمەندی و فراوانییەکی بێوێنەیە، لەم شیکردنەوەیەشیدا -کە کارێکی تابڵێی سەختە- گونجان و تەبایی و هاوسەنگیی نێوان ئەم پەیوەندییانەی پاراستووە. دەتوانین بەدیعوززەمان گوتەنی بڵێین: ئەم کتێبە مەزنە دەنگ و ڕەنگ و تەفسیری کۆشك و پێشانگای گەردوونە.. پوختترین تەفسیر و تەئویلی فەرمانە تەکوینییەکانە.. کلیلێکی ئاڵتوونی و ئەفسووناوییە بۆ ئەو "شوێن"ەی کە هەموو کاتێك لەبەردەمماندا والایە و بۆ ئەو "کات"ەی کە ڕەهەندێکی گوێزەیی "شوێن"ە. گۆیاترین زمان و تەرجومانە

بۆ ناساندنی زاتی پیرۆزی خوای گەورە و سیفەت و ناوەکانی.. تاکە ڕوانینگەیە بۆ تەماشاکردنی ئەودیو پەردەی شتان و ڕووداوەکان.. بریتییە لە میهرەبانی و ئاوڕلێدانەوەیەکی خوایی کە لەودیو گەردوون و "شوێن"ەوە هاتووە و، لە دڵ و زمانماندا دەنگیداوەتەوە.. سەرچاوەی ڕووناکی و هەوا و نوور ئەم جیهانە مەزنەی ئیسلامە.. وە گرنگترین و تاقانە بناغەی مانەوەی هەمیشەییە. چاوساغ و ڕێ نیشاندەر و نەخشەی ئەو جیهانانەی دواڕۆژە کە هەموان بێ جیاوازی یان هاوڕێ لەگەڵ مەیل و ئارەزوویەکی بەتین، یان هاودەم لەگەڵ ترس و لەرز و ئەندێشەدا چاوەڕێی دەکەن.. کۆبەندی مەعریفەت و ئەنسیکلۆپیدیای زانستەکان و کتێبێکی پەروەردەیە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە ئامانجی گەیشتنیان بە کەماڵاتە مرۆییەکان.. بەتایبەتی سەرچاوەیەکی ڕوون و خاوێن و سازگاری زانست و عیرفان و حیکمەتە بۆ جیهانی ئیسلامی.. سەرجەمی ئەو یاسا و ڕێسایانەیە کە بەدرێژایی چەندەها سەدەی ڕەبەق ژیانی کەسی و، خێزانی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سیاسی و ئابووریی موسڵمانانی ڕێکخستووە و ئاڕاستەی کردوون.. بە دوعا و، زیکر و، فیکر و موناجاتەکانی ناوی، پێشەوایەکە بۆ سەیر و سلوك.. کتێبێکی دەراسای وایە کە لە سەروو کات و شوێنەوەیە، بەڵام بەشی هەموو کات و شوێنە جیاوازەکان دەکات.. ڕۆدەچێتە ناو وردەکارییە هەرە ناسکەکانی شتان و ڕووداوەکانەوە و، تابڵێی کورتبڕە، بەڵام هیچ شتێکیشی بە لێڵی و داخراوی بەجێنەهێشتووە..ئەوپەڕی سەخاوەتمەندە، بەڵام دەستی لە ئاستی باوەڕداراندا زیاتر کراوەیە.

ئەم کتێبەی کە نە فریشتەکان و، نە ڕۆحانییەکان و نە جنۆکەکانیش ناتوانن لێی بێنیازبن، یەکەمین و گرنگترین سەرچاوەی میراتی کلتوورییمانە. ئەو شتانەی لێرەدا هەوڵماندا دەربارەی ئەم کانیاوە پیرۆزە بیڵێین، هیچ نەبوون جگە لە چەند ئاماژەیەکی کورت و پوخت.

## ٢. سوننەت

سوننەت، وەکو زاراوەیەکی فیقهی، بریتییە لە کۆی گوفتار و ڕەفتارەکانی پێغەمبەری خوا و ئەو شتانەش کە فەرمان یاخود ئاماژەی بە کردنیان کردووە. بە واتایەکی تر سوننەت هەموو ئەو گوفتار و ڕەفتار و ڕەوشتانەی پێغەمبەرن کە لە لایەن خۆیەوە ئاماژە بە فەرز یان واجب بوونیان نەدراوە و دەکرێت جاروباریش وازیان لێبهێنرێت. ئەوانەیان کە پەیوەندیدارن بە عیبادەتەکانەوە پێیان دەوترێت ”سوننەتی هودا“، ئەوانەشیان کە پەیوەندیدارن بە عادەتەکانی ئەو پێغەمبەرە پیرۆزەوە ناوی "سوننەتی زیادەکان" (سنة الزوائد)یان لێنراوە. زانایانی ئوسوڵی سوننەت بەشێوەیەکی جیاوازتر لەم بابەتەیان ڕوانیوە. ئەو سوننەتانەی گوفتاری پیرۆزی ئەویان لەبارەوە هاتووە پێیان دەوترێت "سوننەتی گوفتار" (السنة القولية). ئەوانەی کە پێغەمبەر خۆی هەستاوە بە کردنیان پێیان دەوترێت "سوننەتی کردار" (السنة الفعلية). ئەوانەشیان کە لەبەرچاویدا کراون و هیچ شتێکی نەفەرمووە لەسەر کردن یان نەکردنیان، ناوی "سوننەتی بێدەنگی و ڕازیبوون" (السنة التقريرية)ی لێنراوە. هەموو جۆرەکانی سوننەت هەر لەوانەوە کە پەیوەندیدارن بە کردارەوە

هەتا ئەوانەی پەیوەندییان بە ئەخلاقەوە هەیە، هەر لەو گوفتارە نوورانی و درەخشانانەوە کە دەربارەی پەروەردە و فێرکردن و هەڵسوکەوت هاتوون هەتا ئەو دەستوورانەی کە بۆ پاکژکردنەوەی نەفس و پەروەردەکردنی رۆح دانراون، هەموو ئەم سوننەتانە لە مەیدانێکی یەکجار فراواندا سەرچاوەیەکی بێسنووری وان کە رووناکی دەبەخشن بە چاو و دڵمان و، هەڵە نییە ئەگەر بوترێت مرۆڤی ئێمە لەئەنجامی نۆشینی ئەم کانیاوەدا بەدرێژایی چەندین سەدەی دوورودرێژ وەکو نمونەیەکی زیندووی "سوننەت"ی لێهاتووە.

بەڵێ، سوننەت چ لە سایەی فراوانییەکەی بێت لە مەیدانی تەشریعدا و چ ئەو نەرمونیانییەشی بێت کە دەرگا لەسەر چەندین تەفسیری جیاواز دەکاتەوە، سەرچاوەیەکی هێندە بەخورِ و سازگارە کە ئەستەمە لە هیچ دین و میللەتێکی تردا گەنجینەیەکی پرِ لە بەرەکەتی وا بوونی هەبێت. ئەوەتا بووە بە سەرچاوە بۆ هەریەك لە تەفسیری قورئان و، فیقهـ و، بابەتە ئیمانییەکان و، ئەخلاق و، زوهد و تەقوا و، ئیخلاس. بەڵام ئێمە لێرەدا ئەم بابەتە گرنگ و هەستیارە جێدەهێڵین بۆ ئەو کتێبانەی کە لەم بوارانەدا نووسراون یان دەنووسرێن و دەچینە سەر بابەتێکی دیکە.

## ٣. کۆدەنگی (ئیجماع)

کۆدەنگی (ئیجماع) کە لەرووی زمانەوانییەوە بە مانای رێکەوتن و یەکگرتن و کۆبوونەوە دێت، بریتییە لە یەکگرتنی موجتەهیدانی موسڵمانی سەردەمێکی دیاریکراو لەسەر بابەتێکی ئایینی. ئیجماع بەم

مانایە، خەسڵەتێکی تایبەتە بەم ئوممەتە. ئیجماع کاری هەموو کەسێك بەتایبەت هی کەسانی ئاسایی نییە، بەڵکو بریتییە لە ڕێکەوتنی ئەو "پسپۆڕ"انەی کە دەتوانن لەسەر بنەمای بەڵگە ئەسڵییەکان بابەتێکی دیاریکراو بسەلمێنن و، هەڵیبسەنگێنن و پاشان لەسەری بگەن بە ڕێکەوتن. هەروەك ڕێکەوتنی کەسانی عەوام لەسەر هەر بابەتێك بە ئیجماع هەژمارناکرێت، بەهەمان جۆر ئیجماعیش لەسەر شتێك پێکنایەت کە پێچەوانەی بەڵگە شەرعییەکان بێت. بەڵێ ئیجماع، ئەو بابەتانە ناگرێتەوە کە لە لایەن دانەری شەرعەوە دەقیان لەبارەوە هاتووە و پێداویستیی سەرەکی ئایین و باوەڕن (معلوم من الدين بالظرورة). هەروەها لە بابەتەکانی وەك هەبوونی سەرەتایەك بۆ بوون (ئائەزەلییەت) و هاوشێوەکانیدا ئیجماع خاوەنی ڕا نییە. بەهەمان جۆر باسەکانی وەك بوونی خوا و، یەکتایی و، حەقیقەتی پێغەمبەرێتی دەکەونە دەرەوەی سنووری ئیجماعەوە. جگەلەوەش لەو بابەتانەدا کە تێگەیشتن لێیان تەنها بەندە لەسەر گوفتاری خاوەنی شەرع، وەك کاروبارەکانی قیامەت، نیشانەکانی قیامەت، جۆرەکانی نیعمەت و سزاکانی ئەوێ و هاوچەشنەکانی، ئیجماع خاوەنی کاریگەری نییە.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێت "ئوممەتەکەم لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە."، "دەستی خوا لەگەڵ جەماعەتدایە." ئەمانە و چەندەها دەقی تریش تەنها چەند نمونە و بەڵگەیەکن لەسەر ڕاستیی ئیجماع و ئەو حەقیقەتەی کە پاڵپشتیی خوای گەورە لەگەڵ جەماعەتدایە.

ڕوانینی جیاوازی "زەیدییەکان" بۆ ئەم بابەتە و، ڕاڤە جۆراوجۆرەکانی "شیعەکان" و، سنووردارکردنی حەقیقەتی ئیجماعیش تەنها لە کاتێکی دیاریکراودا وەك لای "ڕواڵەتگەراکان" (الظاهریون) دەبینرێت، ئەم ڕا پێچەوانانە هەرگیز ئەوەندە بەهێز نین تا بتوانن زیان بە بناغەکانی ئەم سەرچاوەیەی کلتوور بگەیەنن. ئەمەش بە مانای کەم تەماشاکردنی ڕەخنە و ڕا پێچەوانەکان و ئەو وەڵامانەش نایەت کە لە لایەن زۆرینەوە دراونەتەوە. بەڵام هەموو ئەم بابەتانە سنووری ئەم نووسینە تێدەپەڕێنن و، ئەوەندە فراوانن دەکرێت لە هەریەکەیان کتێبخانەیەك دروستببێت و هەروەها تا ئێستا چەندین جار لە ڕابردوودا تاوتوێ کراون. ئێمە لێرەدا تەنها ویستمان ئیجماع وەکو سەرچاوەیەکی میراتی کلتووریمان بهێنینەوە بیر...

## ٤. قیاس (بەراورد)

مانای قیاس بریتییە لە پێوانەکردنی شتێك بە شتێکی تر و هەڵهێنجانی بەهایەك و بڕیارێکی هاوبەش لێی. لەڕووی دەستەواژەیشەوە بریتییە لە بڕیاردان دەربارەی بابەتێك یان کردارێك لەڕێگای بەراوردکردنیەوە بە بابەتێکی تری هاوشێوە یان هاوشان. لە ئوسوڵی فیقهدا بە بابەتی یەکەم دەوترێت بەراوردپێکراو (المقیوس علیه) یان ئەسڵ، بە بابەتی دووهەم دەوترێت بەراوردکراو (المقیس) یان (فرع)، بە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم دوانەش، کە لە ڕوویەکەوە "لایەنی بەراوردکردن"ە، دەوترێت "خاڵی بەراورد" (مناط الحکم). قیاس بەم مانایە زەمینەیەکی فراوان و گرنگە بۆ دەرکەوتن و گەشەکردنی ئەو دەوڵەمەندییە شاراوەیەی نێو قورئان

و سوننەت کە لەسەروو کات و شوێنەوەن. بەڵێ، قیاس سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی وایە کە دەگونجێت لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا و بۆ مەبەستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە گریمانکراوانەی کە پێداویستییە گۆڕاوەکانی پەیوەست بە کات و شوێن دروستیدەکەن، پەنای بۆ ببرێت.. وە دەرگایەکی کرانەوەیەکی وایە کە هەموو کاتێك تا سەر پشت کراوەیە بەڕووی ئەهلی خۆیدا. هەربۆیە لە جێگایەکدا ئەوی لێبێت هەرگیز چارەسەرەکان تەواونابن.

جاری وایە خاڵی هاوبەشی نێوان دوو بابەتی هاوشان و لەیەکچوو کە "ڕووی لێکچوون"یشی پێدەوترێت، هێندە ڕوون و ئاشکرایە، تەنانەت ئەگەر کەسێك ئەزموونێکی کەمیشی لەم بوارەدا هەبێت لەم لەیەکچوونە تێدەگات. هەربۆیە زانایان بەم جۆرە قیاسانەیان وتووە "قیاسی ئاشکرا" (القیاس الجلي). بەڵام جاری وایش هەیە خاڵی هاوبەشی نێوان "بەراوردکراو" و "بەراوردپێکراو" ئەوەندە ئاشکرا نییە کە یەکسەر دیاربێت و، پێویست بە لێکۆڵینەوە و وردەکاری دەکات. تەنانەت لەوانەیە پێویست بە بەراوردکاریی بەدیل بکات. ئەم جۆرەیان پێی دەوترێت "قیاسی شاراوە" (القیاس الخفي).

هەرچەندە قیاس هەردوو جۆرەکەی گوزارشت لە فراوانی و دەوڵەمەندی دەکات، بەڵام نابێت بکرێت بە سەرچاوەی یاساکانی سزادان، چونکە گەڕانەوە بۆ قیاس لەم بابەتەدا بە مانای داهێنانی تاوان یان سزای نوێ دێت. جگە لە هەندێك لەم بابەتە تایبەتییانە، سەرچاوەیەکی زانستیی گرنگە و دەکرێت هەمیشە سوودی لێوەربگیرێت. زۆربەی فەقیهەکان پێداگرن لەسەر بەڵگەبوون (حجیة)ی قیاس و کۆکن لەسەری. لێرەدا

هەرئەوەندە دەڵێین کە ئەمیش بابەتێکی فراوانە و دەکرێت چەندەها جەڵد و زنجیرەکتێب لەبارەیەوە بنووسرێت.

## ٥. ئیستیحسان

ئیستیحسان کە بەماناکانی ئەژمارکردنی شتێك وەك شتێکی جوان و باش، حەزلێبوون و خۆشویستن دێت، و لە لایەن زانایانی ئوسوڵی فیقهەوە ڕاڤەی جۆراوجۆری بۆ کراوە. هەندێکیان لەبری قیاسی شاراوە و لەبەرامبەر قیاسی ئاشکراوە بەکاریانهێناوە. ئیستیحسان بریتییە لە گەڕان بەدوای بەڵگەیەکدا بەهێزتر لە هی قیاس لە بابەتێکی دیاریکراودا، یان تایبەتکردنی بڕیارێك کە پێشتر بە قیاس دراوە لە ڕێگەی بەڵگەیەکی بەهێزترەوە، یان پشتبەستن بە بەڵگەیەکی بەهێزتر، یان وازهێنان لە قیاس و ڕەفتارکردن بەجۆرێك کە لەگەڵ دەستوورە گشتییەکان تەبا بێت و گونجاوتربێت لەگەڵ دەقەکان، یان هەڵبژاردنی ئاسان بەسەر گراندا و ئاسانتر بەسەر ئاساندا بەمەرجێك ئەگەر هەردوو هەڵبژاردنەکە گونجاوبن لەگەڵ حاڵەتەکەدا. زۆرێك لە فەقیهەکان -لەپێش هەموویانەوە ئەبو حەنیفە- بۆچوونیان بەئاڕاستەی بەڵگەبوون(حجیة)ی ئیستیحساندایە. لەڕاستیدا ئەوانەش کە دژی ئیستیحسانن، هەمان ئەم مانایانەی کە لەم نراون، ئەوان لەژێر چەند ناونیشانێکی تردا ناویانە لە هەندێك دەستووری تر و، هەمان کاریان ئەنجامداوە. لەم ڕووەوە بانگەشەی ئەوانەی کە ئیستیحسان وەکو بەڵگە قبووڵ ناکەن تەنها لەسەر ئاستی گوفتارە و توانای ئەوەیان نییە ئەم کانیاوە سازگار و بەخوڕە لێڵ بکەن. لێرەدا

بەمەندە وازدەهێنین و ڕوونکردنەوە و وردەکارییەکانی بۆ پسپۆڕانی ئەم بوارە بەجێدەهێڵین.

## ٦. بەرژەوەندی

بەرژەوەندی کە بە مانای هۆکار و ئامراز دێت بۆ گەیشتن بە شتانی باش و سوودبەخش، هەر لە سەردەمانی زووەوە وەکو یەکێك لە دەستوورەکانی ئیجتیهاد و، چەشنی قیاس و ئیجماع حسابی بۆ کراوە و، بەتێپەڕبوونی کاتیش لە لایەن هەندێك لە ئیمامی مەزهەبەکانەوە وەکو دەستوورێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵ کراوە و، بەیەکێك لە سەرچاوەکانی "بەڵگەی شەرعی" -بەڵام بە پلەیەکی کەمتر لەوانی تر- دانراوە. بەژەوەندی وەك دەستوورێك -هەروەك لە مانا ڕاستەوخۆکەشیەوە دەردەکەوێت- سوودی بەندەکانی خوا ڕەچاودەکات و بەدوای خێر و خۆشییاندا دەگەڕێت. لەم ڕووەوە پێگەیەکی گرنگ لە ژیانی دینیدا داگیردەکات. لەڕاستیدا خوای گەورە "بەرژەوەندی" وەك بناغەیەك داناوە بەئامانجی پارێزراوبوونی ئایین و، گیان و، ماڵ و، عەقڵ و، نەوەی بەندەکانی. ئەمەش دەبێت بە کۆڵەکەی بەرژەوەندی لە زانستی ئوسوڵی فیقهدا.

بەرژەوەندی، ئەگەرچی بەئەندازەی بەڵگە فیقهییەکانی دیکە بەربڵاو و ناسراو نییە، هێشتا فەقیهانێکی زۆر، بەتایبەت فەقیهانی مەزهەبی مالیکی، گرنگییەکی جیاوازیان پێداوە. هەرچەندە ئیمامی شافیعی ڕاستەوخۆ باسی بەرژەوەندی نەکردووە، بەڵام لەو ڕوانگەیەوە کە بەشێوازێکی تر و لە بازنەی قیاسدا مامەڵەی لەگەڵدا کردووە،

واپێدەچێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دانی پێدانابێت. فەقیهانی مەزهەبی حەنەفی هاوڕێ لەگەڵ ڕاڤەیەکی جیاوازدا گومانباشیی خۆیان بەرامبەر بە "بەرژەوەندی" دەردەبڕن. هەرچی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیشە، وەکو لە زۆر بابەتی دیکەیشدا دەبینرێت، لەم باسەشدا هاوشێوەی ئیمامی شافیعی بڕیاریداوە.

سەرەڕای هەموو ئەم بۆچوونە جیاوازانە و تا ئەندازەیەك، بەرژەوەندی ئەگەر بەرژەوەندییەکی ڕێگەپێدراو و قبووڵکراوبێت و دوژمنایەتیی دەستوورەکانی تری شەرع نەکات، ئەوا بەنزیکەی لە سەرجەم مەزهەبەکاندا -ئەگەرچی لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆریشدا بێت- قبووڵ کراوە و، بەیەکێك لە بەڵگە پاشکۆکان تەماشاکراوە و لە زۆر بابەتدا مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. بەرژەوەندی، هەم لە ڕووی ئەو مانایانەوە کە خاوەنی شەرع خۆی پێی بەخشیوە و، هەم لە ڕوانگەی ئەو ئەرك و فەرمانانەی کە فەقیهان خستوویانەتە سەر شانی، هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە سەرچاوەیەکی گرنگی کلتوورمانە. هەڵبەتە پێویستە فراوانتر باسی ئەم بابەتە بکرێت. بەڵام لەبەرئەوەی ڕوونکردنەوەی ئەمەش دیسان توانای ئەم وتارە دەبەزێنێت، ئەوا لێرەدا خاڵی کۆتایی دادەنێین.

## ٧. تەسەوف

پێناسەی تەسەوف جێدەهێڵین بۆ کتێبە تایبەتمەندەکان و لێرەدا بەکورتی لەسەر ناوەڕۆکەکەی دەوەستین:

تەسەوف کە دەکرێت لەڕووی نەزەرییەوە ناوی "تەریقەت" و لەڕووی عەمەلیشەوە ناوی "سۆفیگەری" لێبنرێت، بریتییە لە سەرچاوەیەکی گرنگی زانست و کلتوور لە بوارێکی فراوانی هەر لە ژیانی ڕۆحییەوە هەتا ئەخلاق و لەویشەوە بۆ ئادابی تێکەڵاوبوونی خەڵك.

تەسەوف چەندەها ڕاڤەی جۆراوجۆری بۆ کراوە: وەك مردنی نەفس و منێتیی مرۆڤ و زیندووبوونەوەی ژیانی ڕۆح و دڵ تێیدا.. یان تەسلیمبوونی ڕێبواری ڕێگای حەق وەك مردووی بەردەم مردووشۆر بەرامبەر بە ئیرادەی ڕەهای خوای گەورە، هاودەم لەگەڵ داننان بە بوونی ئیرادەی هەندەکیی مرۆڤدا لە چوارچێوە ڕێژەییەکەی تایبەت بەخۆیدا.. یان دژایەتیکردنی ئەو ئەخلاقە خراپانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا زەمیان کراوە و پڕچەکبوون بە ئەخلاقە جوانەکان.. یان هەستکردن بە نزیکیی خوای گەورە لە ویژداندا لەژێر ناونیشانی "قوربەت"دا و، تێپەڕاندنی "ڕەهەندە مرۆییەکان" -کە تایبەتمەندی و داخوازیی مرۆڤێتین- لەسەر ئاستی دڵ و ڕۆح.. یان گرتنی ڕێگایەك لەژێر ڕۆشنایی و ڕابەڕایەتیی قورئان و سوننەتدا و، دامەزراندنی هودا لەجێی هەوا و ئارەزوو لە ژیانماندا.. یان بەتەواوەتی ڕووکردنە سازێنەری هۆکارەکان و بینینی هۆکارەکان لە دەرەوەی بازنەی کاریگەرێتی.. یان ڕزگاربوون لە ئارەزووە جەستەییەکان و -بەئەندازەی قووڵیی پلەی ئیمان- ڕەنگداربوون بە خەسڵەتی فریشتەکان..

ئەگەر زیاتر لەسەر لایەنە ئەخلاقییەکەشی بوەستین، دەتوانین بڵێین: تەسەوف بریتییە لە پاك ڕاگرتنی دڵ بەرامبەر بە بزواندنە بەردەوامەکانی نەفس و شەیتان.. ناچارکردنی نەفس بە وازهێنان لە مەیلەکانی تایبەت

بە خۆی و تەسككردنەوەی بواری جوڵەكەی بەگوێرەی توانا.. هەوڵدانی هەمیشەیی بۆ مانەوە لە پلە باڵاكانی ژیانی دڵ و ڕۆحدا و، سەركەوتن بە پلیكانەی مرۆڤێتیی ڕاستەقینەدا.. لەپاڵ ئەوپەڕی جددییەت لە پەیوەندی لەگەڵ خوادا، تەرخانكردنی ژیان لەپێناو بەختەوەریی ماددی و مەعنەویی كەسانی تر.. چاوەڕواننەكردنی پاداشت تەنانەت لە هەوڵە هەرە سەخت و مەزنترین كاروبارەكانیشدا و گرتنی ڕێگای پێغەمبەران.. لە بابەتی بەندایەتیكردن بۆ خوای گەورەدا سووربوونی بەردەوام لەسەر ڕۆیشتن لەژێر ئاڵای حەزرەتی موحەممەددا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).. نیشاندانی بەندایەتییەكی پاك و بێگەرد و خاڵی لە هەموو نەنگییەك لە بابەتی پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورەدا، هەڵسوكەوت كردن لە چوارچێوەی تێگەیشتنێكی ڕاست و دروست لە پەیوەندیی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراو، پەرستیار و پەرستراو، خوازیار و خواستراو، داواكار و داواكراو.. دان بەخۆداگرتنی بەردەوام لە هەمبەر تاوان و گوناهەكاندا.. بەجێهێنانی عیبادەتەكان هاودەم لەگەڵ چێژ و خۆشییەكی بێئەندازەدا و بینینیان وەك ئامانجی سەرەكیی ژیان.. بەدەم خەندەوە پێشوازیكردن لە بەڵا و موسیبەتەكان و.. پشتبەستن بە تەقدیری خوایی لەبری نەخشەی مرۆیی لە سەرجەم كار و چالاكییەكاندا و، خۆڕاگرتن لە بەرامبەر خاویی كات وەكو ئارامگرتنی مریشكی كڕكەوتوو لەسەر هێلكەكانی.

تەسەوف بەم مانایانەی كە لەسەرەوە هێنامان بابەتی سەرەكیی هەموو ئەو پەڕاو و كتێبانەیە كە دەربارەی "تەپۆڵكە زومڕوتییەكانی دڵ" نووسراون... تەسەوف حەوزێكی زانست و مەعریفەتی هێندە فراوانە كە بەجارێك هەموو ژیان لەباوەش دەگرێت و، دەوڵەمەندی دەكات. بەجۆرێك

سەرچاوەیەکی تری تا ئەم ڕادەیە قووڵ و بەرین نە لە "بیروباوەڕی ڕۆحیی" ڕۆژهەڵات و نە لە تەوژمە فەلسەفییەکانی ڕۆژئاوادا نمونەی نییە.

## ٨. زانستی کەلام

کەلام لەڕووی زمانەوانییەوە بە مانای وتە و، زمان و، قورئانی پیرۆز و، ئەمر و نەهییەکانی خوای گەورە دێت. مانای دەستەواژەکەیشی بریتییە لە کۆی ئەو زانیارییانەی کە ئامانجیان بەرگریکردنە لە سیستەمی بیروباوەڕی ئیسلامی لەڕێگەی بەڵگە عەقڵی و نەقڵییەکانەوە و، پاراستنی ئاراستەی بیرکردنەوەی ئیمانداران و، بەرپەرچدانەوەی ئەو گومان و دوودڵییانەی کە جاروبار بەرامبەر بە ئایین وروژێنراون یاخود گریمان دەکرێت لە داهاتوودا بوروژێنرێن و، پارێزگاریکردن لە ڕاستییەکانی ئیسلام لە چوارچێوەی "سوننەتی پیرۆز"دا لەبەرامبەر کۆمەڵێك تەوژمی فەلسەفیی هەڵە. بە واتایەکی تر، زانستی کەلام بریتییە لە کۆی ئەو دەستوور و یاسا نەزەرییانەی لەمەڕ زانست و مەعریفەت و، هەریەك لە ئوسوڵی دین و، قورئان و سوننەت -هەروەها ڕای زانایانی پیاوچاکی پێشین لەسەر ئەم دوو سەرچاوەیە- دەبەستێت بە یەکەوە. ئەم دەستوورانە هەر لە کۆنەوە لە لایەن زۆرێك زانا و بیرمەند و فەیلەسوفی موسڵمانەوە کراون بە کتێب و لە حوجرەکاندا کە قوتابخانەی جاران بوون خوێنراون.

هەندێك لە بیرمەندان و زانایان تەنها لە چوارچێوەی قورئان و سوننەتدا

ماونەتەوە و ڕای فیکریی خۆیان لە بابەتێکی دیاریکراودا نەخستووەتە ڕوو، بەڵام هەندێکی تریان کێشەیەکیان نەبینیوەتەوە لە ڕوونکردنەوەی گوفتاری خوا و پێغەمبەر بە بەڵگە جۆراوجۆرەکان و دەوڵەمەندکردنی بە عیرفان و، فراوانکردنی بابەتەکە بە کەرەستەی تەسەوفی و فەلسەفی. نەك هەر کێشەیەکیان تێدا نەبینیوەتەوە، بەڵکو سەرقاڵبوونیان بەمەوە بە خزمەتکردنی دین ئەژمارکردووە. هەرچەندە کرانەوەیەکی بەم جۆرە ڕێی بۆ هاتنە ناوەوەی هەندێك شتی لار و چەوتی پاشماوەی میراتە کۆنەکان خۆش کردووە بۆ ناو سیستەمی بیروباوەڕی ئیسلامی، بەڵام دواجار ئەوەش حەقیقەتە کە ئاسۆی گەورەتر و فراوانتری بەڕووی موسڵماناندا کردووەتەوە. ئەوەندە هەیە ئێمە لێرەدا نامانەوێت مشتومڕی لایەنە باش و خراپەکانی زانستی کەلام بکەین، بەڵکو تەنها دەمانەوێت ئەوە یادی خۆمان بخەینەوە کە ئەم زانستە سەرچاوەیەکی چەند فراوان و بەپیتی میراتی کلتووریمانە و، بەنیازنین دەرگا لەسەر مشتومڕی نوێ بخەینە سەر پشت.

## ٩، ١٠، ١١: نەریت، عادەت، هەڵسوکەوتە باوەکان

نەریت بریتییە لەو عادەت و حاڵەت و هەڵسوکەوتانەی کە -هەرچەندە یاسا نین- لە لایەن مرۆڤەکانەوە قبووڵکراون و، خەڵك بەگشتی پەیوەندییان لەگەڵ گرێداون و، گرنگییان پێداون و، پێچەوانەی عەقڵ و، سروشتی ساغی مرۆڤ و ئایین نین. فەقیهانی مەزهەبی حەنەفی بەشێوەیەکی جیاوازتر پێناسەی دەکەن و، دەڵێن: "بریتییە لە کۆی ئەو حاڵەت و

ڕەوشتانەی کە لە ڕوانگەی عەقڵ و شەرعەوە بە جوان و باش دادەنرێن و ژیریی تەندروستیش بە شتێکی خراپیان نازانێت."

جیاوازییەکی جددی هەیە لەنێوان نەریت لە لایەك و عادەت و هەڵسوکەوتە باوەکان لە لایەکی دی. چونکە نەریت هەموو ئەو کردار و هەڵسوکەوتە باشانە دەگرێتەوە کە لە ڕابردووەوە بە میرات ماونەتەوە، بەڵام عادەت و ڕەفتارە باوەکان لەوانەیە هەندێك جار شتانی باش نەبن. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە دەڵێین "عادەتی باش و عادەتی خراپ" یان "ڕەفتاری باوی جوان، ڕەفتاری باوی ناشرین"، بەڵام لە حاڵەتی نەریتدا جیاکارییەکی لەم شێوەیە ناکەین. هەروەها نەریت گوفتار و ڕەفتاریش دەگرێتەوە، وەلێ عادەت و هەڵسوکەوتە باوەکان تەنها لە سنووری ڕەفتاردان. جگەلەمەش، عادەت و هەڵسوکەوتە باوەکان لایەنێکی پەیوەندیداریان هەیە بە "عەقڵی لەکارکەوتوو"(العقل العاطل)ەوە، لەم ڕووەوە بریتین لە قبووڵکردنی تەواوەتی هەموو شتێکی ڕابردوو و لەسەر چاولێکەری بەندن. قورئان لە زۆر شوێندا ڕەخنە لە تێگەیشتنێکی لەم جۆرە دەگرێت و، لەسەر زمانی ئەمانەوە دەفەرمووێت:

﴿ ...إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴾[1]

(الزخرف: ١٠٧)

"ئێمە باوباپیرانی خۆمان بینیووە پابەندی بیروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیڕەوی ئەوان دەکەین."

١. هەروەها بڕوانە: سورەتی البقرة: ١٧٠؛ المائدة: ١٠٤؛ الأعراف: ٢٨؛ الأنبياء: ٥٣.

وەك دەبینرێت قورئان لۆمەی لاسایی و چاولێکەریی کوێرانە دەکات. بەڵام نەریت (العرف) هەمیشە لەژێر ناونیشانی (المعروف)دا فەرمانی ڕەچاوکردنی دەدرێت، یان بەلایەنی کەمەوە بەرزدەنرخێنرێت.

ئێمە لێرەدا لەڕووی یاساییەوە باسی ئەو نەریت و عادەتانەمان نەکرد کە دەبن بە بناغەی هەندێك دەستوور و یاسا، بەڵکو تەنها ویستمان ئەوە یادبخەینەوە کە نەریت (العرف) بە ڕەهای و، عادەت و هەڵسوکەوتە باوەکانیش بەشێوەیەکی سنووردار -بەمەرجێك پێچەوانەی ڕۆحی ئایین نەبن- یەکێکن لە سەرچاوە گرنگەکانی میراتی کلتووریمان. ئەگینا هەریەکێك لەم بابەتانە بەلایەنی کەمەوە نامیلکەیەك یان وتارێکی دووردرێژی دەوێت. ئەمەش هەم توانای ئێمە و هەم توانای ئەم وتارە دەبەزێنێت.

ئەوەی کە تا ئێرە و لە دووتوێی وتارێکی کورتدا -هەرچەندە بابەتەکانمان تابڵێی تەسك کردەوە و، تەنانەت لە هەندێکیاندا تەنها بە هێنانی ناو و پێناسەی باسەکە وازمان هێنا- ئاماژەمان بۆ کرد، هەوڵێك بوو بۆ بیرخستنەوەی سەرچاوەکانی میراتی کلتووریمان و ناوەڕۆکەکانیان. لەم نێوەندەشدا پەنجەمان خستە سەر بوونی پەیوەندییەکی جددی و زیندوو لەنێوان ئەو سەرچاوانەی میراتی کلتووریماندا کە بەڕواڵەت لەیەکتر جیاوازن و، خەسڵەتێکی دیکەی تایبەت بە خۆمان هێنایەوە یاد. لەم ڕێڕەوەشدا ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان دا بۆ خۆبەدوورگرتن لە شوێنکەوتنی هەندێك فەنتازیا و، گرنگییەکی زۆرمان دا بە نەکەوتن بۆ ناو باوەشی هەندێك شتی دەستکرد و هاوشێوەکانیان و، سەرنجی خۆمان تا ئەندازەیەکی زۆر لەسەر لایەنی مەعریفیی (Epistemology)

بابەتەکە چڕکردەوە و، هەوڵماندا پەیوەندیی نێوان بوارە جیاوازەکانی میراتی کلتوور و جیهانبینیمان بەیادبهێنینەوە. لەسەر بنەمای ئەوەی کە یادخستنەوەی هەموو ئەو بابەتانە شتێکی پێویست بوو، چەند لە دەستمان هات باسەکەمان کورت کردەوە و، بە ڕوانینێکی گشتیی تەماشامان کرد و ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکانیشیمان بەجێهێشت بۆ فیراسەتی پسپۆڕەکان. لەوانەیە لە داهاتوودا ئەگەر تەمەن ڕێگەی دا لە جێگایەکی تردا ڕوونتر لەسەر ئەم بابەتانە بوەستین، بەڵام لەئێستادا لە ڕێگەی چەند دڵۆپێکەوە ئاماژەمان بۆ دەریاکان کرد و بەمەندەش وازمان هێنا.

# ڕۆحی ئیسلام

ئەگەر ئەمڕۆ کەشوهەوایەك هەبێت کە بتوانێت دەرفەتی هەڵمژینی هەناسەیەکی ئاسوودە بە مرۆڤایەتی بدات ، بێگومان کەشوهەوای ئیسلامە. زۆربەی ئەو سیستەمانەی کە لەم یەك دوو سەدەیەی ڕابردوودا بەزۆر سەپێنران بەسەر مرۆڤایەتیدا، جگە لە زیادکردنی ئازارەکانی چ سوودێکی تری نەبوو. پێش لە هەر شت بەنزیکەیی هەموو ئەم سیستەمانە هەریەکەیان تا ئەندازەیەك نامۆ بوون بە ڕۆحی ئەو. لەوانەیە بەشێوەیەکی کاتی لەگەڵ هەندێك لەمانەدا جۆرە گونجانێك دەستەبەرکرابێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕەتکردنەوە و پەرچەکرداریان لە زۆربەی خەڵکیدا وروژاندووە. ئەمەش لەزۆربەی خەڵکدا گومانی بەرامبەر بە هەموو شێوازێکی بیرکردنەوە و سیستەمێك دەبزواند و، گومان و، دوودڵی و نەبوونی دڵنیاییش بەم ئەندازەیە، بێگومان سەری بۆ قەیرانی نوێ کێشا. لەم ڕووەوە هەموو بانگەوازێکی تازە لە هەمان کاتدا وەك هۆکاری تەنگژەیەکی نوێ دەبینرا و لەگەڵ خۆیشیدا

پەرچەکردارێکی نوێی دەهێنا. چونکە پێش لە هەر شتێکی دی، ئەم سیستەمانەی کە بە زۆرەملێ سەپێنران بەسەر مرۆڤایەتیدا، لەسەر شانی کۆمەڵێك بیردۆزی تیۆریی وا دامەزرابوون کە لە ڕوانگەی پەیوەندیی مرۆڤ بە ژیان و گەردوون و بەدیهێنەرەوە چەندین بۆشایی گەورە و فراوانیان تێدابوو. جگەلەوەش، نەناسینی سروشتی مرۆڤ و، لەمەش خراپتر نینکاریکردنی ژیانی ڕۆح و دڵی مرۆڤ، کۆمەڵێك کەموکورتیی وا بوون لەم سیستەمانەدا کە پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییانە بە هەر شتێکی تر مەحاڵ بوو.

دامەزراندنی پەیوەندییەکی هاوسەنگ لەنێوان مرۆڤ و گەردوون و خوای گەورەدا لە چوارچێوەیەکی هەستیار و ورد و سەرنەکەردا بێنەوەی ڕێگا بە دروستبوونی هیچ بۆشاییەك بدرێت، تەنها و تەنها بۆ ئیسلام مەیسەر بووە. چ ئەو ڕێڕەوە مەعنەوی و پێکهاتنە ماددییانەی کە پێش ئەو دەرکەوتوون و، چ ئەو سیستەمە جۆراوجۆر و تەوژمانەش کە دوای ئەو بەڵێنی هیوا و ڕزگارییان بە مرۆڤایەتی داوە، نەیانتوانیوە هیچ یەکێك لە چاوەڕوانییەکانی مرۆڤایەتی بهێننەدی، تەنانەت هەمیشە کورتیان هێناوە. ئەو شتانەی ئەمڕۆ مرۆڤایەتی چاوەڕێیان دەکات یان پێویستی پێیانە پەیوەندی بە برسێتیی دڵ و ڕۆحەوە هەیە. بەڵام ئەوەی کە سەرجەم هەوڵ و کۆششەکان بەئاراستەی تێرکردنی ئارەزووە جەستەییەکانە، "سەرلێشێوان"ێکی گەلێ مەزنە. هەوڵدان بۆ شکاندنی هەستی تینوویّتی بە ئاوی سوێری دەریا چ ئەنجامێکی هەبێت، هەوڵی دابەستەکردنی جەستە و نەفسیش بەمەبەستی ڕەواندنەوەی برسێتیی مەعنەوی و ناناسوودمیی هەمان ئەنجامی دەبێت. چەندین ساڵی دووردرێژ

سەرجەمی مرۆڤایەتیی بەگشتی و دونیای ئێمە بەتایبەتی لە بازنەیەکی داخراوی لەم جۆرەدا دەسووڕێتەوە کە لێوانلێوە لە خراپەکان. لەم سەردەمەدا هەموو هەڵمەتێك بەئامانجی تێرکردنی ئارەزووە جەستەییەکان، هەنگاوێك زیاتر لە ڕۆحی خۆی دووریانخستووەتەوە و، هەموو دوورکەوتنەومیەکیش وڕێنەی نوێیان لەودا هێناوەتە مەیدان! جیهانی ئێمە لەم سەردەمەدا، لە لایەك هاودەم لەگەڵ بۆشاییەکانی ژیانی ڕۆح و دڵی، لەنێو چنگی پێداویستییە جەستەییەکانیدا دەینالآند و تامی برسێتیی یەك لەدوای یەکی دەکرد، لە لایەکی تریشەوە جەستەی تا دەهات بێ ئەدەب و ڕێز دەبوو و، داخوازییەکانی نەفسی دەبوون بە تاکە فەرمانڕەوا بەسەر بەها مرۆییەکانیەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە سەرچاوەی ڕاستەقینەی برسێتی و تیونێتیی سەرجەمی مرۆڤایەتی بریتی بوو لە دوورکەوتنەوە لە ڕۆحی ئیسلام. کاتێك دەڵێین ڕۆحی ئیسلام بێگومان مەبەستمان لەو ئیسلامە نییە کە لەئێستادا بەهۆی ڕوانگە و هەڵسەنگاندنی هەڵەی ئێمەوە مات و بێڕەنگ بووە و سەرنجڕاکێشییە ئاسمانییەکەی کزبووە. بەڵکو مەبەستمان لەو ڕۆحی ئیسلامەیە کە بە خۆی و ڕەنگ و نەخشە تایبەتەکەیەوە هێشتا لە هەندێك ڕۆحی پاکدا هەستی پێدەکرێت و، مرۆڤی "چەرخی بەختەوەری" لە باوەشیدا ژیاوە. لەڕاستیدا ئەم ڕۆحە هەمیشە و لە هەموو سەردەمەکاندا وەك دەریا قووڵ و بێگەرد و خاوێنەکان لە شەپۆلدان بەردەوام بووە و، هەرگیز لەکەی جیهانبینییەکانی وابەست بە کات و شوێن نەیانتوانیوە لێڵی بکەن. بەڵام ئەوەندە هەیە بۆ گەیشتن پێی و سوودوەرگرتن لێی، پێویست بە نیەت و ڕوانگەیەکی دیاریکراو و، هەوڵ و کۆششێکی دیاریکراو و، ڕووتێکردن و متمانەیەکی دیاریکراو دەکات.

ئەم ڕۆحە چەند کامڵ و، لاهووتی و چالاك بێت، هێشتا ئەگەر نوێنەر و شوێنکەوتووەکانی خاوەنی نیەتێکی پتەو و بەردەوام و، ڕوانین و هەڵسەنگاندنێکی تەندروست و، هەوڵێکی دامەزراو نەبن بۆ دۆزینەوە و ئیجتیهاد و، باوەڕ و متمانەی تەواویان بەوە نەبێت کە هەر شتێك بەدوایدا وێڵن لەودا بوونی هەیە، ئەوا سەرەڕای دەوڵەمەندی و فراوانی سەرچاوەکە، هێشتا ناتوانن وەك پێویست و بەتەواوەتی سوودی لێوەربگرن. ئیدی ئەگەر هەموو تەمەنیشیان لە نزیکی ئەم سەرچاوەیەشەوە بەسەربەرن، دیسان لەهەمبەر چەندەها دەردی وەك برسێتی و، هەژاری و دواکەوتوویدا دۆش دادەمێنن. چونکە هیچ ئەگەرێك لەئارادا نییە بۆ ئاسوودەبوونی دونیایەك -بە شتانی تر- کە پێشتر بە قورئان و سوننەت گۆش بووە. من وەك شەخسی خۆم لەو باوەڕەدام ئەگەر قورئان و سوننەت وەکو موسڵمانانی سەردەمە یەکەمینەکان مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و هەڵبسەنگێنرن، دەتوانن زۆرێك لە کێشە درێژخایەنەکانی ئەم ڕۆژگارەیشمان چارەسەربکەن و، شەپۆلی قەیرانە گریمانکراوەکانی داهاتووش دەشکێنن، یان بەلایەنی کەمەوە دەبن بە بەربەست لە بەردەم زیانەکانیاندا. لەڕاستیدا ئیسلام لە دونیای ئێمەدا هەمیشە وەك شیری دایکمان یەکەم ماددەی خۆراکیی ئێمە بووە.. لە هەست و، بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنەکانماندا هەردەم ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی بینیوە.. هەموو کاتێك لەناو ماڵەکانماندا هاودەممان بووە و، بەبەردەوامی چەشنی هەناسە هەڵمژراوە و هیچ کاتێك هەستمان بە نامۆیی نەکردووە بەرامبەری.. کەچی لەبەرامبەر ئەمەدا چەندەها جیهانبینی و ئایدۆلۆژیا کە سەرچاوەکەیان نامۆ بووە، تا بەردەرگاکانمان

هاتوون و، کۆڵانەکانمانیان بە نەڕە و هاواری خۆیان هەژاندووە، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە بێنە ناومانەوە و، تێکەڵاوی ڕۆحمان نەبوون و، نە ئێمە بووین بە هی ئەوان نە ئەوانیش بوون بە هی ئێمە. تەنانەت بەپێچەوانەوە هەر لە یەکەم بینینەوە نامۆیی شکڵ و ڕوخساریان خۆبەدوورگرتنی لە ئێمەدا وروژاندووە و، گومانەکانمانی کولاندووەتەوە و، لە زەمینەی بیرکردنەوەماندا بێزکردنەوەی هێناوەتە مەیدان و، تەنها بەئەندازەی زیان گەیاندن بە سیستەمی بەرگری و لاوازکردنی، هەلی مانەوەیان بۆ ماوەیەکی کاتی لە بنیاتی ئوممەتدا بۆ ڕەخساوە.

ئیسلام لە نیشتمانی ئێمە و، جوگرافیای ئێمە و، شارەکانی ئێمە و، ماڵەکانی ئێمەدا، بەدرێژایی سەردەمەکان ئەوەندە ژیانی ئێمە و، پێداویستییەکانی ئێمە و، هەیەجانەکانی ئێمەی لەباوەش گرتووە و هێندە نزیك بووە لێمانەوە کە دەتوانین لە هەموو هەڵسوکەوت و چالاکییەکماندا چەندەها ڕەنگ و نیشانەی تایبەت بە ئەو بەدیبکەین. بۆیەی ئەو لە ئەندام و ڕەفتارەکانماندا، هەڵکشان و داشکانی شەپۆلەکانی ئەو لە زیهنەکانماندا و، دەنگ و هەناسەی ئەو لە دڵەکانماندا و، شوێنەواری ئەو لە سیماکانماندا و، دەرکەوتنی لە شێوەی هەڵناوسان و ئەستووربوونی ئەژنۆ و پاژنەکانماندا[1] و، تایبەتمەندییە حەوێنەرەوەکانی ئەو لە دەمی ماندوویەتیماندا و، بیرکردنەوە ئیلهامبەخشەکانی ئەو لە کاتی حەوانەوەماندا و، دەست تێوەردان و دەسەڵاتی ئەو بەسەر گیانەکانماندا و، هاوبەشێتیی ئەو لە سەروەت و سامانماندا و، ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی ئەو لە ژیانی کەسی و خێزانیماندا و، پاڵنەرە قەناعەتبەخشەکانی ئەو لە

١. مەبەست لێی هەڵئاوسان و ئەستووربوونی ئەژنۆ و پاژنەکانە لەئەنجامی نوێژی زوردا.

دەربڕینی خۆشەویستیماندا بۆ یەکتر و، بەڵێنی ژیانی هەمیشەیی ئەو کە شاباڵ بە هیوا و ئاواتەکانمان دەگرێت و، دەستوورە هاوسەنگەکانی ئەو لەمەڕ ماف و دادپەروەری و یەکسانی کە دڵنیایی و ئاسوودەیی بە دڵان دەبەخشن.. هەموو ئەمانە ئێمەیان ئەوەندە بەوەوە گرێداوە، ڕاستتر بڵێین هێندە ئالوودەی بووین، ئەگەر خوانەخواستە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەجێمان بهێڵێت، لە خەم و پەژارەدا دەمرین و لەناودەچین.

لەبەرامبەر ئەوەدا کە کەسانێك بابەتەکانی وەك ماف و دادپەروەری و یەکسانییان وەك ئامرازێك بەکارهێناوە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێك ئامانجی دیاریکراو یان چەشنی هۆکارگەلێك لێیان ڕوانیون بە ئامانجی بەدیهێنانی جیهانبینییەکی دیاریکراو، ئیسلام لە خاڵی یەکتربڕی نێوان بەختەوەریی خەڵك و ڕەزامەندیی خوای گەورەدا مامەڵەی لەگەڵ ئەم بەها جیهانییانە کردووە و، پێکەوە داواکارییەکانی بەدیهێنەر و بەدیهێنراوانی هێناوەتەدی. ئەو داوای هەمان ئەم تێگەیشتن و جیهانبینییەش لە موسڵمانان دەکات. لەم ڕووە ئەگەر موسڵمانانی ئەم ڕۆژگارە لە ئاستی هەستیاریی ئەم بابەتەدا بن و، کاتێك بە زار "ماف" و "دادپەروەری" و "یەکسانی" دەڵێن، ئەم بەها باڵایانە نەکەن بە ئامرازێك بۆ داخوازییە جەستەیی و نەفسییەکانیان و، ڕەزامەندیی خوایی بکەن بە ئامانجیان، ئەوا ئەگەر ئەمڕۆش نەبێت بێگومان سبەی، دەگەن بە پێگەیەك کە هەموو کەسێك ئیرەییان پێببات. ئەم پێگەیەش بریتییە لە خۆشویستنی خوا و، خۆشویستران لە لایەن خوا و بەرزنرخێنران لە لایەن خەڵکانی ترەوە. یەکەم پاڵنەریش بۆ گەیشتن بە پایەیەکی ئاوا بریتییە لە هێزی نەدۆڕاوی ئیسلام و شێوازی ژیانی ئیرەییبزوێنی موسڵمانان.

ئیسلام وەك هەر ئایدۆلۆژیا و سیستەمێکی هاوردەکراوی دیکە نییە تا پێویستی بە پڕوپاگەندە بێت. مەرجەعییەتی ئەو زاتی خۆی و هەڵسوکەوتی نمایندە بەوەفاکانیەتی. ئەو هەمیشە هانمان دەدات پشتی حەق بگرین و، حەق بەرەو لوتکەکان بەرزبکەینەوە و، ڕێزگرتنی حەق بە گەورەترین عیبادەت دەزانێت.

"بێسنووورە ناوەکانی خالق، لەپێش هەموویانەوە (حەق)
شتێکی چەند گەورەیە بۆ مەردوم بەرزکردنەوەی حەق!"

(موحەممەد عاکیف)

ئەمە یەکێکە لەو وتانەی کە لەژێر ڕۆشنایی ئەم جیهانبینییەدا وتراوە و گوزارشت لە ڕاستییەك دەکات کە هەرگیز ناتوانین وازی لێبهێنین. ئیسلام هەمیشە بەگوێرەی دەستووری "هێز لە حەقدایە." مامەڵەدەکات و هیچ کاتێك مل بۆ هێزە هار و ستەمکارەکان نادات. هەمیشە قنج دەوەستێت، مەردانە دەڕوات، نە چەپڵە بۆ ستەم لێدەدات، نە سەریش بۆ ستەمکار نەوی دەکات.

"بۆ خاتری دونیای دەنی، مل نادەین بۆ دەنی تەبیعەتان،
هەر بۆ خوایە، تەوەککول و بەندایەتی و پشتبەستنمان."

(باقی)

هاوسەنگیی نێوان "حەق" و "هێز" بابەتێکی گرنگە و پێویستە سەربەخۆ تاوتوێ بکرێت.. وە پێویستی بە ڕوونبوونەوەی زیاتر هەیە. بەڵام هەنووکە دەڵێین "کاتێکی دیکە" و بەسەریدا تێدەپەڕین.

ئیسلام وەکو شێوازێکی ژیان مامەڵە لەگەڵ دادپەروەری و ڕاستڕەوی دەکات و زەمینەیەکی فراوانی هەر لە ژیانی کەسی و خێزانییەوە هەتا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە. بەڵێ، کەسێك ژیانی خۆی وابەستەی ئیسلام کردبێت، دروست بیردەکاتەوە و، دروست دەژی و، هەمیشە تێدەکۆشێت لە چوارچێوەی حەقڤانییەتدا بمێنێتەوە. سەرەتا لە خۆیەوە دەست پێدەکات و، پێگەی خۆی لەبەرامبەر ستەم و ناحەقیدا دەستنیشان دەکات و، بەئەندازەی ئەو هەستیارییەی دەینوێنێت لە پاراستنی مافەکانی خۆیدا، بگرە لەوەش زیاتر، لە ڕەچاوکردنی مافی کەسانی دیکەشدا هەستیارانە هەڵسوکەوت دەکات و، هەمیشە -وەك ئەوەی ژیانی وابەستەی تەرازوویەکی سەرنەکەربێت- ژیانێکی ورد و پێوراو بەسەردەبات.

بابەتەکانی وەك دادپەروەری و ڕاستڕەویش دەبێت بە تەنها هەڵوێستەیان لەسەر بکرێت و شیبکرێنەوە، دیارە ئەمەش سنووری ئەم وتارە دەبەزێنێت.

ئیسلام، یەکسانی وەك داواکاریی خوای گەورە و یەکێك لە داخوازییەکانی بەرێزیی ئادەمیزاد دەبینێت.. وە لەرزینی ئەو یان لەناوچوونی تەواوەتیی ئەو بە گەورەترین تاوان دەزانێت لەدژی مرۆڤایەتی.

ئەو ڕوون و ئاشکرا بۆچوونی خۆی لەدژی جیاکاری لەنێوان ڕەنگ و، نەتەوە و، شوێن و چینەکانی کۆمەڵگادا دەخاتەڕوو و، لە هەموو زەمینەیەکیشدا جەنگی فیکری لە بەرامبەر ئەم بیرکردنەوە چەوتە بەرپادەکات. ئەو هەمیشە پشتگیری لە جیاوازیی نێوان توانا و لێهاتن

و بەهرەکان دەکات و هەوڵی گەشەپێدانیان دەدات. هەروەها ئەوپەڕی هەستیاری دەنوێنێت لەبابەتی بەخشینی هەمان دەرفەتی یەکسان بە خەڵك و ڕێگەدان بە سوودوەرگرتنیان لە سەرجەم بەروبوومەکان بە یەکسانی. ئیسلام هەروەك پشتگیری لەو پێکهاتانە ناکات کە لەسەر بنچینەی خانەدانی و نەسەب وەستاون، بەهەمان جۆر فەرمانڕەوایەتیی چینێکی دیاریکراو، واتە هەموو جۆرێکی ئۆلیگارشی (Oligarchy)، - ئەگەر تەنها لە یەك بواری ژیانیشدا بێت- بەئاشکرا ڕەتدەکاتەوە. ئەو هەموو کاتێك ڕێگای بەردەم توانا و لێهاتنەکانی تاکەکەس دەکاتەوە و، چەپڵە بۆ سەرکەوتنەکانیان لێدەدات و ئەمەش بە داخوازیی ناوەرۆکی "پلەی هەندێك لە ئێوەمان بەسەر هەندێکی دیکەتاندا بەرزکردووەتەوە"[١] دەزانێت. جگەلەوەش، بەردەوامی بە خەباتی خۆی دەدات بەرامبەر بە هەموو جۆرەکانی تاکڕەوی (Monarchy).

ئیسلام بەهەمان گەرموگوڕیی هەموو تاکێك و هەموو توێژێکی کۆمەڵگا بە سنگی خۆیەوە دەنێت. پێداویستی و چاوەڕوانییەکانی هەموو کەسێك بەیەکسانی هەڵدەسەنگێنێت و تا هێزی تێدایە هاوار دەکات کە هیچ کەسێك لە کەسێکی تر گەورەتر و بەرزتر نییە. لەم هاوارەشیدا هەم لەسەر یەکسانی پێداگرە، هەم جەختیش لەسەر یەکسانی هەل و دەرفەتەکان دەکاتەوە. ئەو بەرقەوە هێرش دەکاتە سەر خامۆشکردنی توانا و لێهاتنەکان لە داوی فەرامۆشکردندا و، بەستنەوەی بەهرەکان بە زنجیری "لەبارچوونی هەڵبژێرراو" و ئیفلیج کردنیان.. لەبەردەم هەر گەورەبوون و بەرزبوونەوەیەکدا دەوەستێت کە لە دینەمۆی ناوەکیی تاکەکەس و

١. سورەتی الإسراء: ٢١.

هەوڵە دڵسۆزەکانیەوە سەرچاوەی نەگرتووە و بەئاشکرا نائەخلاقیبوونی ئەمە دەردەخات. ئەم ڕەفتارانەش کە پێچەوانەی ئەخلاقن، بەزۆری دەبەستێتەوە بە هەرزەیی ڕۆحەوە. ئیسلام هەوڵی ڕیشەکێش کردنی سووکی و هەرزەییەکی لەم جۆرەی ڕۆح دەدات، هەم لە ڕێگەی لابردنی ئەو هۆکار و پاڵنەرە مادديیانەی دەگەن بەم ئەنجامە، هەم بەیارمەتیی بەهێزکردنی ئیرادە کەسییەکان لە ڕێگەی چاندنی هەستی ئیمان و عیرفان و ئیحسان لە ویژداندا.

بەڵێ، پاراستنی ڕۆح لەهەمبەر گشت جۆرەکانی نزمیتی و هەرزەیی تەنها بە پەنابردن دەبێت بۆ قەڵغانێکی ڕێکوپێك کە لە باوەڕێکی بەهێز و، عیرفانێکی فراوان و چاودێریکردنی بەردەوامی نەفس پێکهاتووە. لەسایەی ئەم پڕچەکبوونەدا، گەیشتنی ڕۆح بە کەماڵا و ئاسوودەییەکی لەم جۆرە، چاوی ئادەمیزاد دەکاتەوە بەڕووی شتانێکی گرنگ و مەزندا کە زۆر لە سەروو ئاستی لاشە و جیسمانییەتەوەن. بەپێچەوانەوە ئەوانەش کە بێبەشن لە وەها پڕچەکبوونێك بەئەستەم دەتوانن بەها مرۆییەکان بپارێزن و ماوەیەکی دووروودرێژ بەپێوە بوەستن. چونکە هەرزەیی ڕۆح ئەوەندە مرۆڤ لە خۆی دووردەخاتەوە کە ڕاپێچی دەکات بەرەو دارمانێکی وا کە دەکرێت بەرەو هەموو لایەك کێشبکرێت و، بچێتە هەموو قاڵبێکەوە. کەسێکی لەم جۆرەش بێگومان درەنگ یان زوو دەبێت بە کۆیلە و بەندەی زنجیرلەملکراوی بەردەرگای ئەم و ئەو.

ئێمە لەو باوەڕەداین ئەگەر پەی بە نهێنیی ئەو دینەمۆ پاڵنەرە ببەین کە بیروباوەڕی ئیسلام لە دڵە باوەڕدارەکاندا دایمەزراندووە یان دایدەمەزرێنێت، ئەوا نەك هەر لە هۆکارە ڕاستەقینەکانی سەرکەوتن و

ژێرکەوتنە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان تێدەگەین، بەڵکو دەرك دەکەین بە بناغەکانی سەرلەنوێ زیندووبوونەوە و گەیشتنەوە بەو کاروانەی لێی بەجێماوین. لەم بوارەدا باشترین نمونەی ئێمە هاوەڵە پیرۆزەکانی چەرخی بەختەوەری و ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی سەرکەوتن و سەربەرزیماندا هەڵگری ئاڵای ئوممەتمان بوون. ئەگەر ئێمەش وەك پێشینان ڕابردووی شکۆدارمان چەشنی هێزێکی پاڵنەر بخەینە دوای خۆمان و بەتوندی دەست لە ڕەگەکانی مەعنای خۆمان گیربکەین، واتە موحەممەد عاکیف گوتەنی "گەر تەوەککولمان بە خوا بێت و، باوەش بە کارکردندا بکەین و ڕام ببین بۆ حیکمەتی خوایی" -کە پێویستە هەر وابین- ئەوا هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە سەرجەم چیا ڕێگر و سەختەکانی بەردەممان دەگۆڕێن بە دەشتایی پان و بەرین.

کۆمەڵگای چەرخی بەختەوەری و ئەندازیارە مەزنەکانی ڕابردووی شکۆدارمان، چ لەسەر ئاستی ژیانی بیر و بزاوتن و، چ لەسەر ئاستی جیهانی ویژدان، نوێنەرانی بێکەموکوڕیی ئیسلامن. ئەوان لەسایەی قورئان و کانیاوی ئیسلامدا پێگەیشتبوون و، تەمەنیان لە ئاسۆیەکی دوورەدەستی وادا بەسەربردبوو کە دەکەوێتە نێوان جیهانی شتە سنووردارەکان و نەبەدییەتەوە. کۆمەڵگایەك کە پێش هاتنی ئیسلام خووە خراپ و عادەتە زیانبەخشەکان جەستەیان کون کون کردبوو و، لە هەڵسوکەوتەکانیاندا تابڵێی ڕەق، بگرە وەحشی بوون و، لە دابونەریتەکانیشیاندا ئەوپەڕی دەمارگیر و کەللەڕەق بوون.. بەڵێ، گۆڕانی کۆمەڵگایەکی لەم شێوەیە بە یەك دانە هەڵمەت بۆ کۆمەڵێك مرۆڤی نمونەیی لەسەر ئاستی عەقڵ و دڵ و ڕۆح و نەفس، موعجیزەیەکی ڕوون و ڕەوانی ئیسلامە نەك هەر

شتێکی دی. ئەمانە گوێیان بۆ قورئان هەڵخست، بە قورئان گۆش بوون، دڵیان بەو پێغەمبەرە بەخشی کە قورئانی بۆ دابەزیوە، تا وای لێهات لەسەر ئاستی جیهانی هەست و بیرکردنەوەکانیان خۆیان لە ناوجەرگەی زەمینەیەکی ئاوەدانکردنەوە و بووژاندنەوە و زیندووکردنەوەدا بینییەوە و، بە جۆشوخرۆشی گەیشتن بە زیندووبوونەوەیەکی تازە سەر هەتا پایان گۆڕا.. لە خووە بەد و عادەتە کوشندەکان دوورکەوتنەوە.. لەگەڵ نەفسدا دەستەویەخەی یەکتر بوون و، چوون بەگژی سەرجەم ئارەزووە جەستەییەکانی دەرەوەی بازنەی ڕێپێدراودا.. وەك نماینده چاکەکارەکانی سیستەمێکی خاوەن فەزیلەت، ژیانی خۆیان تەرخانکرد بۆ بەختەوەریی کەسانی تر و، لە ژیانی خۆیان زیاتر خەمی ژیاندنیان بوو.. هەمیشە لەدۆخی ئامادەباشی و ورياییدا بوون و هەوڵیاندەدا نەخلیسکێن، چونکە باوەڕیان وابوو دەگونجێت هەموو کاتێك کۆمەڵێك خاڵی لاوازیان هەبێت کە لە سروشتی مرۆڤێتییەوە سەرچاوەی گرتووە. کاتێکیش بەحاڵ هەڵدەنوتین، هاوڕێ لەگەڵ ئەوپەڕی دڵسۆزی و پەشیمانیدا و، بە تەوبە و داوای لێخۆشبوونەوە ڕوویان لە خوای گەورە دەکرد و، بەدوای ڕێگاکانی "بەرزبوونەوەی ستوونی"دا دەگەڕان و هەمیشە وا بەرنامەڕێژ کرابوون کە لە لوتکەکاندا بێن و بچن.. هەمیشە بەپێوە وەستان و هەرگیز ملیان کەچ نەکرد بۆ تەنیا مانەوە و نامۆبوون و، هەڕەشەلێکردن و تۆقاندن و، ستەم و بێبەشی و مافخوراوی و، ئەو فشارانەش کە بەهۆی کەمیی ژمارەیانەوە دەخرایە سەریان. بەئەندازەی ئەم بەرگرییەشیان هەموو کاتێك وەك فیدایيەکانی خۆشەویستی ڕەفتاریان کرد و، سنگیان بۆ هەموو کەسێك کردەوە و، ڕێزیان لە هەموو جۆرە بیروڕایەك گرت و،

سەرجەم داخوازییەکانی "مرۆڤی کامڵ"یان هێنایەجێ. دونیایەکی تەواو نوێیان لەو زانیارییانە دامەزراند کە لە قورئان و سونتەوە دەڕژایە نێو ڕۆحیانەوە و، بەها مرۆییە شاراوەکانی ناخیان کە لە دۆخی "هێز"دا بوو گۆڕییان بە دۆخی کردار و هێنایاننە سەر ئەرزی واقیع و، بوون بە نمونە و سەرمەشق بۆ هەموو ئەوانەی دوای خۆیان.

ئەو مرۆڤانەی کە ڕوویان لە خوای گەورە کردووە و، قیبلەی ڕاستەقینەی خۆیان دیوەتەوە و، بە بەندایەتیکردن بۆ خوای تاقانە خۆیان لە چەندەها جۆری بەندایەتی ڕزگارکردووە و، لە بەندایەتییە نزمەکانی وەك پەرستنی ئارەزوو و، هێز و، شەهوەت و، ناوبانگ کە ئادەمیزاد بێنرخ دەکەن قوتاریان بووە.. ئا ئەو مرۆڤانە ڕەگی ئێمە بوون و ئێمە ئەوان بووین.. ئێمە بەرجەستەبوونی ئەوانین لە ئێستادا و ئەوانیش سەرچاوەی ئێمەن. ئەوانەش کە دوای ئێمە دێن دەبن بە میوە و بەروبوومی ئێمە. ئێمە منداڵی ئیسلامین، بەجۆرێك لە ماڵەکانماندا ئیسلاممان وەك لایلایەیەك بەرگوێ کەوتووە و، لە جیرەی بێشکەکانماندا ئەومان بیستووە و، لە سنگی دایکیشمانەوە ئەومان نۆشیوە و، لە ژینگە و کەشوهەواکەشماندا هەر ئەومان هەڵمژیوە. ئیسلام لەناو ئێمەدابوو. وە هەرگیز هەستمان بە نامۆیی نەکرد بەرامبەری.

## پوختەیەك دەربارەی سیستەمی بیرکردنەوەمان

لە سیستەمی بیرکردنەوەی ئێمەدا هەریەك لە عەقڵ و، فیکر و، دڵ و، هەستە مرۆییەکان و وەحی بە سەرجەم میوەکانیەوە تابلێی گرنگن و وەکو ڕووە جیاوازەکانی یەك شت وان. دەتوانین بڵێین هەمیشە ئەم سیستەمە لەڕووی ئەو مەیدانەوە کە داگیریدەکات فراوانتربووە لە هەر شتێکی تری جگە لە خۆی. خۆی لەخۆیدا ئیسلام هەردەم لە پێشکەشکردنی پەیامەکانیدا بۆ مرۆڤایەتی ڕەچاوی ئەم کراوەیی و فراوانییەی کردووە. ڕێگایەکی پەیوەندی و دیالۆگێکی وای هەڵبژاردووە لەگەڵ شوێنکەوتوو و قسەبۆکراوەکانی کە لە چوارچێوەی مەرجەعییەتی عەقڵدا بووە و، خاوەنی ڕەهەندی فیکری بووە و، ڕەنگی هەستە مرۆییەکانی وەرگرتووە و، پاڵی بە وەحیەوە داوە و بە ئیلهامیش فراوانی بەدەستهێناوە. بڕیارەکانیشی لەسەر کۆمەڵێك بناغەی مەعقوول و لۆجیکیی وا دامەزراندووە کە مرۆڤ و بوونەوەران و بەدیهێنەر بەیەکەوە دەبەستێتەوە و، گونجاوە لەگەڵ جێگیرە(المحكمات) قورئانییەکاندا.

ئەم پەیوەندییەی کە ئیسلام لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا سازاندوویەتی هێندە بەهێز و ئەوەندە تەبایە لەگەڵ هەست و، بیر و داوەریی ژیریی ئادەمیزاددا، ئەستەمە هیچ سیستەمێکی تری پێش ئەو یان پاش ئەو هەبێت بەم ئەندازەیە ڕەچاوی هاوسەنگیی نێوان عەقڵ و دڵ و ڕۆحی کردبێت.

بەڵێ، ئیسلام نموونەییترین و گونجاوترین سیستەمە بۆ سروشت و توانا و لێهاتنە مرۆییەکان -چ لەسەر ئاستی جیهانە ناوەکییە تەسکەکەی مرۆڤ بێت یان لەو ڕووەوە بێت کە پەیوەندی بە هەموو گەردوونی فراوانەوە هەیە- و لە ڕوانگەی وەڵامدانەوەی پێداویستییەکانیشیەوە وێنە و هاوشێوەی نەبووە و نابێت. پێویستە لێرەدا ئەوەش بڵێم کە ئەم حاڵەتە تابڵێی سروشتی و ئاساییە، چونکە یەکەم سەرچاوەی ئیسلام وەحیی ڕوونە و، یەکەم ڕاڤەکاریشی سوننەتە. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین هەروەك قورئان موعجیزەیە، ئەم سیستەمەش کە لە پەیامەکانی ئەوەوە دروستبووە موعجیزەیەکە بۆ خۆی. هەروەك قورئان وێنەی نییە، ئیسلامیش کە بە بەرهەمی ئەو دادەنرێت بێهاوتایە.

بوون و بوونەوەران و سروشت لە دونیای ڕووناکی قورئاندا لەپڕێکدا دەگۆڕێن و شێوەیەکی نوێ وەردەگرن.. مرۆڤ و هەستە ماددی و مەعنەوییەکانی دەگەن بە قووڵاییەکی جیاواز.. عەقڵ لەسایەی ئەو گوفتارە پڕ لە ئیعجازەدا بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی بینینی شتان وەك خۆیان.. ڕۆحیش تەنها بە واریداتەکانی ئەو دەتوانێت لە شەقەی باڵ بدات و بفڕێت بەرەو "عەرشی کەماڵات"ی تایبەت بە خۆی و هەموو شتێك بە "سەڵتەنەتی دڵ"ەوە ببەستێتەوە.. ئەمە دوێنێ وابوو، ئەمڕۆ

وایە، سبەینێش هەر وا بەردەوام دەبێت. بەمەرجێك ئیمانداران بە هەست و شعوور و بیر و هەناویان ڕووی تێبکەن و، هەست بە تازەیی و، پاراوی و، سازگاری و نوورانێتیی دابەزینی یەکەم جاری بکەن و، هەمان ئەو جۆشوخرۆشە لە دڵیاندا هەست پێبکەن کە لە یەکەم شوێنکەوتووانیدا وروژاندی.

لەڕاستیدا ئەوانەی بەهرە و توانای ئەم جۆرە هەستکردنەیان هەیە، هەمیشە لە هەناسەکانی ئەودا هەستیان بە عەشق و شەوق و هەیەجان کردووە. ئەوانەش کە بە دڵ گوێیان بۆ هەڵخستووە، هەموو کاتێك بە زایەڵەی "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ی ئەو ڕاچڵەکیون.

بەڵێ، قورئان لەڕووی ناوەرۆکەوە تێگەیشتنێکی نوێی بۆ "جیهاد" هێنا. جیهادی بێدارکردنەوەی مەردووم بۆ ناسینی خۆیان.. جیهادی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ هەموو بووندا.. جیهادی یاخیبوون لە جیسمانییەت و نەفسانییەت، جیهاد لە دژی دوژمنایەتی و، ڕق و، قین و، نەفرەت و، شەهوەت و، هەڵپە و بەخیلی و سەرجەم هەست و خووە خراپەکان کە مرۆڤ سووك دەکەن.. جیهادی تێپەڕاندنی هەموو بەرژەوەندی و ترسەکان.. جیهادێك کە هەموان خۆیان بۆ فیکرێکی باڵا تەرخانبکەن.. جیهادێك کە تێیدا شوێنکەوتووان فەتحی دونیای ناوەوەی خۆیان بکەن.. جیهادێك کە تێیدا دونیا بە هۆڵی چاوەڕوانیی ئاخیرەت ببینین و، ئەودیو زیندووبکەینەوە و، ئێرەش لەبەرنەوەی پەیوەندیدارە بەوێ ئاوەدان بکەنەوە.. وە چەندەها جیهادی تریش...

قورئانی پیرۆز نزیکەی چارەکە سەدەیەك پەیامی ئەم جۆرە

جیهادانەی پێشکەش بە مرۆڤەکان کرد.. وە ڕۆژێك هات ئەو، بەم پەیامە زیندووکەرەوانەی وەك "درەختێکی پیرۆز"، "وەك درەختێك کە ڕەگەکانی لە قوڵایی زەویدا جێگیرن و لق و پەلەکانیشی بە ئاسماندا بڵاوبوونەتەوە"[١] گەشەی کرد و دەرکەوت و مەودایەکی پان و بەرینی گۆڕی بە بەهەشت.. بەڵێ، هەموو ئایەتێك لە کاتی نازڵبوونیدا وەکو هاژەی تاڤگەیەکی بەخوڕ، چەشنی کەوسەرێکی سازگار و فوارەیەکی بەگوڕ، یان ڕاستتر بڵێین، وەك میوەکانی جیهانی ئولوهییەت وابوو. هەرکاتێك ئەم میوانە دەردەکەوتن، لە لایەن کۆمەڵێك موشتاقی سەرشار بە ئارەزوو و بەوپەڕی هەیەجانەوە لێدەکرانەوە و، دەخرانە بەردەستی دڵ و ڕۆحە نرخشناسەکان. ئەم پێشکەشکردن و بەرزنرخاندنە یەك لەدوای یەك بەردەوام دەبوون و ئەو مرۆڤە بەختەوەرانەش هەموو ڕۆژێك هاوڕێ لەگەڵ ئەفسوونی سفرەیەکی ئاسمانیی جیاوازدا هەڵدەستان و دادەنیشتن. قسەبۆکراوە چالاك و زیندووەکانی ئەو ڕۆژگارە کە بە وەها تایبەتمەندییەك سەرفرازبووبوون، بەیارمەتیی ئەو لێزمەبارانەی کە هەموو ڕۆژێك لەسەر ئاسۆیان دەباری، وەك ئەوەی دەنگی شەیپوورێکیان لە ئەبەدییەتەوە بیستبێت، ژیانێکیان بەسەردەبرد کە پڕبوو لە چەندین "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ی یەك لەسەر یەك. لە ئەنجامدا هەریەکێك لەوان دەبوو بە "خضر"ێك و دەگەیشتن بە هەر کەسێك ژیانیان تێدا دەبووژاندەوە. هاودەم لەگەڵ چەندین زیندووبوونەوەی یەك لەدوای یەکدا بەرەو لوتکەی بەختی خۆیان هەنگاویان دەنا. خوای گەورە بە پەیامی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴾[٢]

١. سورەتی إبراهیم: ٢٤.

٢. سورەتی الأنفال: ٢٤.

"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامە و ڕێبازێك کە دەتانژێنێتەوە و ژیان بەخشە" بانگی دەکردن بۆ زیندووبوونەوەی هەست و، بیر و، ڕۆح و دڵ، ئەوانیش بێ هیچ دوودڵی و وەستان دەیانوت ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴾[1] "پەروەردگارا! بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێك بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەدگارا! دەتۆش لەگوناهـ و هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمان و (لەسەر ڕێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە." و بەدەم ئەم بانگەوازەوە دەڕۆیشتن.

نهێنیی ئەم هەمیشە زیندووبوونەی ئەوان تا ڕادەیەکی زۆر لەو کەشوهەوایەدا حەشاردرابوو کە تێیدا دەژیان. ئەم مرۆڤانە لە دڵەوە گوێیان بۆ قورئان ڕادەگرت و خاوەنی بڕیارێکی لەپێشین نەبوون بەرامبەری.. لە ناخی دڵەوە باوەڕیان پێیبوو.. وە لەژێر ڕۆشنایی ئەم کتێبە مەزنەدا بەرەو خوا هەنگاویان دەنا و لەناخەوە ئەویان خۆش دەویست.. هەر بە خۆشویستنیشەوە نەدەوەستان، بەڵکو هاوڕێ لەگەڵ عەشقیکی قووڵدا ئەوپەڕی توانای خۆیان دەخستەکار بۆئەوەی لە لایەن کەسانی تریشەوە قبووڵبکرێت و خۆشبویسترێت. تابڵێی هەستیاربوون بەرامبەر بەوەی کە بیر و هەستە ئیسلامییەکان بە ڕەنگی ئارەزووەکانی خۆیان لەکەدار نەکەن و، تێدەکۆشان بە هەمان ڕەنگ و، شکڵ و، شێوە و، تام و بۆنی خۆیەوە بیهێننە سەر زمان و نوێنەرایەتی بکەن. هەربۆیە

---

١. سورەتی آل عمران: ١٩٣.

هەمیشە دەیانتوانی "وەڵامی ئەرێنی" لە بەرامبەرەکانیان وەربگرن. ئا لەم کەشوهەوا ڕووناکەی ئەواندا قورئانیش و ئیسلامیش وەك خۆیان خەڵکی لێیان تێدەگەیشتن و، زۆرینەی مەردووم دەیانتوانی بێ هیچ بەربەستێك پێیبگەن و لێی تێبگەن.. دەیانتوانی بە چاوی دڵ گەورەیی خوای گەورە لەودا ببینن و، بەو عەقڵ و لۆجیك و داوەریی ژیرییەشیان کە خاڵی بوو لە هەموو نەنگی و بڕیارێکی لەپێشین دەیانتوانی هەموو شتێك وەك خۆی هەڵبسەنگێنن. ئەوان هەرگیز لە زانیاریی ڕووت و پەتیدا نەدەچەقین. ئەوان لە سەرجەم کاروبارەکانیاندا دەیانتوانی بەخێرایی لە زانستەوە بەرەو کردار بپەڕنەوە و، ڕەفتاریان هەنگاوێك دەخستە پێش زانین و، بەوەی کە دەیانتوانی زانیارییە کەڵەکەبووەکانیان بکەن بە هێزێکی جوڵێنەر، زۆر بەئاسانی زانینی نەزەرییان دەگۆڕی بە کردار و ڕەفتار. ئەم مرۆڤانەی کە بەیارمەتیی فراوانیی ویژدانیان بەتەواوەتی لە ئامانجی بەدیهاتنی مرۆڤ و نهێنیی دروستبوونی تێدەگەیشتن، ئەو شتانەی کە کەسانی تر لە مادده و چێژە جەستەیی و ئارەزووە نەفسییەکاندا بەدوایاندا وێڵ بوون، ئەوان لە ڕووکردنە خوا و لە هاودەمی ئەودا بێ کەموکورتی دەیانچەشت. بەوەی کە لە سەرجەم تەسکی و تەنگەبەرییەکانی جیسمانییەت ڕزگاریانبووبوو، هەموو ڕۆژێك لە جیهانی پان و بەرینی دڵدا دەگەیشتن بە قووڵاییەکی جیاوازتر.

ئەم جۆرە ژیانە هەتا ئەمڕۆ و لە چەندین ڕۆژگاری جیاوازدا، ئەگەرچی بەشێوەی پچڕ پچڕیش بووبێت، هەر بەردەوام بووە و لەسایەی تەفسیرێکی پتەوی قورئانیدا و جیهانبینییەکی ڕاسترەوی ئیسلامیدا- ڕاستتر بڵێین لە سایەی ئەو سیستەمە سەرسووڕهێنەرەی ژیان کە خاوەنی

ئاسۆی ئاسمانی بووە و تەنانەت لە جیهانی خەونەکانیشدا بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە- دووبارە بووەتەوە.. کات چەند بگۆڕێت و سەردەمەکان چەند جیاوازبن، هیچ ڕێگرێك نییە لەبەردەم مرۆڤەکاندا بۆئەوەی تا ئەم ئەندازەیە ببن بە بوونەوەرانێکی ڕۆحانی.

هەمان ئەم سەرکەوتنە دەکرێت لەمرۆشدا دووبارە ڕووبداتەوە، بەمەرجێك موسڵمانان لەو چوارچێوەیەدا کە کەمێك پێش ئێستا کێشامان خاوەنی ڕۆحێکی باشی بەرەنگاربوونەوە بن و، هەمیشە وریا و هۆشیاربن و لە هیچ حاڵەتێکدا دووچاری خاوبوونەوە نەبن و، ژیانیان لەودیو سنووری نەفس و جەستەوە و لە ئاسۆی دڵ و ڕۆحدا بەسەرببەن و، هەمیشە لە ئامادەباشیدابن دژی ئەو خراپکارییە گریمانکراوانەی کە دەکرێت لە سروشت و ماهییەتی مرۆییەوە سەرهەڵبدەن و، نەهێڵن هیچ بیرێکی نەرێنی لەسەر ئاستی دونیای ناوەوەیان بێتە مەیدان.

لەڕاستیدا یەکێك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی بیری ئیسلامی بریتییە لەوەی ئەم ژیانی دونیایەی کە لە لایەن هەندێکەوە وەك شتێکی سووك و بێنرخ تەماشادەکرێت، لای موسڵمان دەبێت بە جێگای ئاوەدانکردنەوەی ژیان و بەستنەوەی هەموو شتەکانی ناوی بە ڕەزامەندیی خواوە و، دەیکات بە هۆڵی چاوەڕوانیی ئاخیرەت و دەیگۆڕێت بە ژینگەیەك کە ئیرەیی پێببرێت. لەم ڕوانگەیەوە دەتوانرێت هەموو کاتێك وەك ڕێڕەو و، بەندەر و، ڕەمپا و کێڵگەی دوارۆژ لەم دونیایە بڕوانرێت.

بەڵێ، کاتێك ئیسلام قسەبۆکراوەکانی دەدوێنێت ڕەچاوی سەرجەم هەستە دەرەکی و ناوەکییەکان و، بیر و، شعوور و، لۆجیك و توانای

تێگەیشتنیان دەکات.. ئەو مرۆڤەکان بە خۆیان و هەموو ئامێر و، کۆئەندام و، توانا و، بەهرە و لایەنە ناسکەکانیانەوە وەك یەك پارچەی دابەشنەبوو قبووڵدەکات و لەو چوارچێوەدا گفتوگۆیان لەگەڵ سازدەکات. وەڵامی ئارەزووەکانیان دەداتەوە و، هەموو پێداویستییە سروشتی و مرۆییەکانیان دەهێنێتەجێ و، زەمینەیەکی وا لەباریان بۆ دەڕەخسێنێت کە توانا و لێهاتنەکانیان بتوانن لە هەموو کات و شوێنەکاندا بتەقنەوە و بکرێنەوە.

یەکێکی تر لە خەسڵەتەکانی تری فیکری ئیسلامی ئەوەیە کە لەبری زانیارییە جۆراوجۆرەکان لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوە دەگرێت. لەم لایەنەیەوە ئەو لە سەرجەم پێکهاتە ئایینی و تەوژمە فەلسەفییەکانی دی جیادەبێتەوە. بەڵێ، ئیسلام لەو ڕۆژەوەی دەرکەوتووە هەمیشە خۆی بەدوورگرتووە لە میراتی کۆن و ئەو جیهانبینییە جیاوازانەی کە لەسەر شێوەی ئایین بوون و، هەردەم لە هەوڵی مانەوەدا بووە وەك خۆی. ڕێزی لەو لایەنانەی ئەوان گرتووە کە دووچاری دەستکاری و چەواشەکاری نەهاتوون، بەڵام هەموو کاتێك وابەستەی سەرچاوە سازگارەکانی خۆی بووە.

خۆی لەخۆیدا ئیسلام نە پێویستی بە میراتی کۆن و نە بە فەنتازیای نوێ هەبوو. جا چۆن هەیبێت، لەکاتێکدا قورئان لەپشتی ئەوەوە بوو. ئەو قورئانەی کە 'کتێبی هەموو پێغەمبەرانی سەردەمە جیاوازەکان و، پەیامی سەرجەم ئەولیا مەشرەب جیاوازەکان و، بەرهەمی هەموو ئەصفیاکان کە ڕێبازیان لەیەکتر جیاوازبووە، بەکورتی و پوختی لەخۆدا کۆکردووەتەوە.. ئەو کتێبەی کە سەر و، خوار و، ڕاست و، چەپ و، پێش و، دوا و هەر شەش لاکەی ڕووناکە و، بەتەواوەتی داخراوە بەڕووی هەر

چەشنە وەهم و گومانێکدا.. خاڵی پیشت پێبەستنی وەحیی ئاسمانی و گوفتاری ئەزەلییە و بە یەقین چەسپاوە.. ئامانج و مەبەستی بەختەوەریی هەمیشەییە وەك بەڕوونی دەبینرێت.. ناوەرۆکەکەی هیدایەتێکی ڕوون و ئاشکرایە.. لای سەرەوەی بە نوورەکانی ئیمان دەدرەوشێتەوە.. لای ژێرەوەشی لەسەر بەڵگە و بورهان ڕاگیربووە وەك بە (علم اليقين) چەسپاوە.. لای چەپی ڕامبوونی ژیری و دڵەکانە بە (عين اليقين).. میوەکەیشی ڕەحمەتی خوایی و بەهەشتی هەمیشەییە."[١] ئەو ئیسلامەی کە بە کتێبێکی ئاوا گۆشبووە، هەرگیز نە موحتاجی خەیاڵاتی ئایدیالیستەکانە و، نە سەری لە لۆجیکی ڕیالیستەکان و، شێواز و میتۆدی ئەزموونگەراکان (Positivism) یان هەر کەسێکی دی داوە و، نە هیچ یەکێك لەمانەیشی وەك سەرچاوەی باوەڕپێکراو قبووڵکردووە.

ئیسلام لەڕوانگەی شێوازی تایبەت بە خۆی و، میتۆدەکانی و، پێشنیاری چارەسەر بۆ کێشە مرۆییەکان، لە هەموو سیستەمە ئاسمانی و نائاسمانییەکانی تر جیاوازە و، ئەو لە هەموو ڕوویەکیەوە نمونەیەکی پڕاوپڕی کامڵییە. بەڵێ، ئەو ڕەچاوی هەموو تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ و، توانا زیهنی و فیکری و ڕۆحییەکانی ئادەمیزاد دەکات و، لە چوارچێوەیەکی زۆر فراواندا پێگەی ئەو دیاریدەکات و، پاشان پڕچەکی دەکات بە وزەی جۆراوجۆر. نە وەك هەندێك لە ڕێبازە فەلسەفییەکان تەنها ڕوو لە عەقڵ و فیکری ئەو دەکات و هەستەکانی فەرامۆش دەکات، نە چاو لە ئاستی میکانیزمی ویژداندا دەنووقێنێت و تەنها وەك بوونەوەرێکی عەقڵی و لۆجیکی هەڵیدەسەنگێنێت. بەپێچەوانەوە ئیسلام

١. لە کتێبی "وتەکان"ی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، بە کەمێك دەستکارییەوە.

لە چاوی بەدیهێنەرەوە بۆ مرۆڤ دەڕوانێت.. وەکو "گشت"ێك کە شایانی دابەشبوون و پارچەپارچەبوون نییە مامەڵەی لەگەڵ دەکات.. وەڵامی سەرجەم داخوازییەکانی هەستە دەرەکی و ناوەکییەکانی دەداتەوە.. وە ئەو ئادەمیزاد بە هەموو لایەنە ماددی و مەعنەوییەکانییەوە ئامادە دەکات بۆ بەختەوەریی دونیا و قیامەت و، شایانی بەهەشتی هەمیشەیی.

هەرچی جێبەجێکردن و هێنانەدی هەموو ئەمانەشە هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی، بەجێدەهێڵین بۆ ئەو قەڵەمە تایبەتمەندانەی کە ڕوونتر و فراوانتر شیدەکەنەوە و، لێرەدا خاڵی کۆتایی دادەنێین.

## هەڵوێستی پێغەمبەرانە...
## لە بەرامبەر خوا و ڕووداوەکاندا

کەسێك کە خۆی بۆ خوا تەرخان کردووە و پشتی بە ئەو بەستووە، بێنەوەی ئاوڕ لە دواوەی بداتەوە بەئاڕاستەی ئەرك و فەرمانبەرییەکانی هەنگاودەنێت. دەزانێت پاڵی بە چ هێزێکەوە داوە و بەناوی کێوە کارەکانی بەڕێوەدەبات. دڵنیایە لە ئامانجەکەی و ڕاستیی ئەو ڕێیەی بەسەریدا دەڕوات و، ئەوەی کە بەدرێژایی ڕێگا تەنانەت چرکەیش بەجێنەهێڵراوە و بەجێناهێڵرێت. لەم ڕووەوە ئەو هەرگیز دووچاری پەرێشانیی فیکری و عاتفی نابێت و، دوودڵی و لێتێکچوونی بەسەرنایەت و، هەوڵدەدات فەرمانبەرییەکانی هاوڕێ لەگەڵ هەستیاری و شعوورێکی قووڵدا جێبەجێبکات، پاشان هاودەم لەگەڵ ئاسوودەیی ڕۆحدا دەستدەکات بە چاوەڕێکردنی ئەنجامی کارەکە لە خوای گەورەوە و، ئەوپەڕی هەستیاریی دەنوێنێت نەوەك خۆی لە بازنەی کاروبارە خواییەکان هەڵبقورتێنێت و، چالاکی و جموجوڵەکانی تەنها بە ڕەزامەندیی خواوە دەبەستێتەوە.

ڕەزامەندیی ئەو دەکات بە تاکە بناغەی سەرەکی و، هەوڵدەدات بەڕووی هەموو بەهاکانی دیکەی جگە لەمەدا دەرگاکان دابخات و، هەمیشە تێدەکۆشێت خۆی لە ئارەزووەکانی نەفسی بەدووربگرێت. ئەگەر ڕۆژێکیش ڕێگاکان بەتەواوەتیی بگۆڕێن بە هەوراز و هەڵدێر و، ئاسۆکان تاریك دابێن و، لەهەمەوو لایەکەوە دەنگی ئازار و گرمەی ئەندێشە و ترس بێنەبەرگوێ، ئەو نە سکاڵا لەو ڕێگایە دەکات کە پێیدا دەڕوات، نە دەشڵەژێت، نە دەیشگەڕێتە دواوە، بەڵکو "پاڵ بە خواوە دەدات و، باوەش بە کارکردندا دەکات و، مل بۆ حیکمەتی خوایی کەچدەکات."

و، حەزرەتی نوح ئاسا دەڵێت ﴿أَنِّي مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ﴾[١] "خوایە، بەڕاستی من شکستم خواردووەو سەرکەوتنم پێ ببەخشە"و، بەهەمەوو هێزی خۆی هانا بۆ پارێزگاری و چاودێریی ئەو دەبات و، دەستدەکات بە چاوەڕێکردنی کات و شوێنی ئەو ڕزگاربوونەی کە ئەو لوتفی دەکات.

هەروەك ڕۆیشتن بە ڕێگای خوای گەورەدا و، باسکردن و ناساندنی ئەو بە گشت کەسێك و، نیشاندانی ئادابی ڕێگا بە ڕێبوارانی دیکە عیبادەتە، بەهەمان جۆر چاوەڕێکردنی هەموو شتێك لە خواوە و، لەو شتانەشدا کە پێویستی بە چاوەڕێکردنە ئارامگرتن لەسەر خاوی و نەڕۆشتنی کات و دان بەخۆداگرتن دیسان عیبادەتە. جاری وایە مرۆڤ لە یەکەم جوڵە و، هەڵمەت و، فڕیندا خێرا سەرکەوتوو دەبێت و دەگات بە مورادی خۆی. جاری وایشە بەدرێژایی تەمەن وەکو ئەسپی کوحەیلان غاردەدات و کەچی بەڕواڵەت هیچ شتێکی دەست نەکەوتووە. بەڵام ئەمیش لەئەنجامدا بە صەبر و، خۆڕاگری و نیەتەکەی ڕزگاری دەبێت...

---

١. سورەتی القمر: ١٠.

جاری وایە خەڵکانی دونیایی و ڕوداوە دونیاییەکان ڕێی مرۆڤ نادەن، جاری وایە تەوژمی ڕووداوەکان هێندە بەهێزن ناتوانین لەژێریاندا پشتمان ڕاست بکەینەوە، جار هەیە ساڵان هەر وەك موحەڕڕەم دێن و دەچن و، هەموو ڕێگاکانیش دەچنەوە سەر کەربەلا. بەڵام ئەو دڵانەی کە فەرمان لە خواوە وەردەگرن هەرشتێك ببینن و ببیستن هەرگیز نە لەرزەیان پێدەکەوێت و، نە هەڵدەنووتن و نە دەکەونە ناو دووڵییەوە. هەموو ڕووداوێك وەك کردارێکی ئیرادەی پیرۆزی خوایی دەبینن و، هەرشتێك بەسەریان بێت بە تاقیکردنەوە هەژماریدەکەن و، بە تەوەککول و تەسلیمبوون پێشوازی لە تاقیکردنەوەکان دەکەن و، وانەی مرۆڤایەتی فێری ئەو نەزانانە دەکەن کە وەك چەتە ڕێیان پێدەگرن و، هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکیان لە چوارچێوەی گونجان لەگەڵ فەرمانە خواییەکاندا هەڵدەسەنگێنن و، چاوێکیان لەسەر کردارەکانی خۆیانەوە و بە چاوەکەی دیکەشیان چاودێریی ئەو دەرگا پیرۆزە دەکەن و، بەرەو ئەو ئامانجە هەرە مەزنە -گیانمان فیدای ئەو ئامانجەبێت کە ڕەزامەندیی خوای گەورەیە- دەڕۆن و، تەنانەت خەیاڵەکانیشیان دەپارێزن لە بیرکردنەوە ناپاك و نامۆکان.

پاڵەوانێکی بواری ڕاستگۆیی تەنها یەك خەمی هەیە کە چەشنی سەودا دڵی داگیرکردووە، ئەویش بریتییە لەوەی کە هەموو کەسێك خوا بدۆزێتەوە و، ڕوو لە ئەو بکات و، لە بەندایەتییە جۆراوجۆرەکان ڕزگاریان ببێت و تەنها ببن بە بەندەی ئەو.. بێ وچان و ماندووبوون کوچە و کۆڵانەکان تەی دەکات و، دەنگ و هەناسەکانی تەرجومانی ناو دڵین و، هاودەم لەگەڵ ئوسلوبێکدا کە بێگومان لە لایەن هەموو

کەسێکەوە -بەمەرجێك ویژدانی نەگەنیبێت- قبووڵا دەکرێت، هەمیشە دەناڵێنێت. بەدەم ناڵینەوە ڕێی لە هەرکەسێك بکەوێت، دەڵێت:

﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾[1]
(ئەمە تەنها چەند دانەیەکە لە نەوا و ناڵینەکانی حەزرەتی نوح...)

﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾[2] (ئەمەش هاوارەکانی حەزرەتی هوودە..)

﴿إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ١٠٧ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٠٨ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[3] (ئەم گوفتارە پڕ لە دڵسۆزییەش بریتییە لە وتەی هاوبەشی هەموو ئەو ڕۆحانەی کە خۆیان بۆ خزمەتکردنی ڕێگەی حەق تەرخانکردووە..) ئەم گوفتارانە دەردەبڕێت و هەموو کاتێک نەغمەکانی دڵی ڕادەگەیەنێت یان دەچێت بەدەم ئەوانەی کە ڕایانگەیاندووە؛ دەچێت و بە نرکە و ناڵەوە دەڵێت:

﴿يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٢٠ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٢١ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٢ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ٢٣ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٢٤ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ٢٥ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ﴾[4] (لە کتێبەکانی مێژوودا ئەم سەدا ئازا و بەگوڕەی

---

١. سورەتی الأعراف: ٥٩.
٢. سورەتی الأعراف: ٦٥.
٣. سورەتی الشعراء: ١٠٧-١٠٩.
٤. سورەتی يس: ٢٠-٢٦.

کە هاوشانی دەنگ و هەناسەی فریشتەکانی ئاسمانە، دراوەتە پاڵ "حبیب النجار"ی بەجەرگ.)

لەناو خانەدانی فیرعەونیشدا ئیماندارێکی نەناسراوی وا هەیە هەرکاتێك زایەڵەی ئەو دەبیستم ڕادەچڵەکم و لە شوێنی خۆم بەرزدەبمەوە. ئەم شێرە پاڵەوانە بەم شێوەیە دەست بە قسە دەکات ﴿ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ﴾[1]... هاودەم لەگەڵ ڕەوانترین ئامۆژگاریدا کاریگەریی چەشنی صوری دەبێت لەسەر بیر و هەستە مرۆییەکان.. ترس و سام دەخاتە دڵەکانەوە.. لە هەندێك ڕۆحدا ئەندێشەیەکی ترسناك و، لە هەندێکی دیکەیشدا ئاسوودەیی و ئارامی بەرهەم دەهێنێت.. پاشان مەردانە هاوار بۆ ئەو شتە دەکات کە پێویستە بوترێت و، دەڵێت ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾[2] و بەم وتانە قسەکانی کۆتای پێ دەهێنێت.

ئەم مرۆڤانەی کە خاوەنی ورە و ئیرادە بوون هەمیشە دامەزراو و جێگیر بوون بەرامبەر بە حەشاماتە بێڕێز و، لەخۆبایی و، خۆپەرست و، دڕەندە و، ڕقنەستوور و، لەسنووردەرچوو و، نەفرەتکارەکان.. ئەو حەشاماتانەی کە جوامێری و ئازایەتیی ئەوانیان بە گومڕایی و هەرزەیی دادەنا و، جاری وابوو بە دەرکردن لە خانە و نیشتمانی خۆیان دەیانترساندن و، جاری وابوو هەڕەشەی دەست و قاچ بڕینەوەیان لە شوێنکەوتووانیان دەکرد و، گاهـ سەرلەبەری خەڵکیان بە سووك و بێنرخ تەماشادەکرد و، گاهـ هەڵسوکەوتی پێغەمبەرانەی نێرراوەکانیان دەگێڕایەوە بۆئەوەی کە

١. سورەتی غافر: ٢٨.
٢. سورەتی غافر: ٤٣-٤٤.

گوایە خواکانی ئەوان دەستیان لێوەشاندوون و، جار هەبوو دەمیان لەوە دەکوتی کە ئەم پێشەوایانە بەردباران دەکەن و، جاری وایشبوو بە وتنی ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾[1] لە شان و شکۆیان دادەگرتن. بەڵام ئەوان بە دەنگێکی دلێر وەڵامیان دانەوە:

﴿يَٰقَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِى وَتَذْكِيرِى بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ ٱقْضُوٓاْ إِلَىَّ وَلَا تُنظِرُونِ﴾[2] (ئەم هەڵوێست و دەنگە نەبەردە هی پێغەمبەری تۆ فان، حەزرەتی نوحە..)

﴿قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ﴾[3] (ئەم سنگ دەرپەڕاندنە هی وتاربێژی پێغەمبەران، حەرزرەتی شوعەیبە..)

﴿إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓاْ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ۝٥٤ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ۝٥٥ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ﴾[4] (ئەمەش ڕەنگدانەوەی ڕەفتارەکانی حەزرەتی هودە..)

﴿يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾[5] (ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکی حەزرەتی شوعەیبە و نمونەی ڕەوانبێژییە..)

---

١. سورەتی إبراهيم: ١٠.
٢. سورەتی يونس: ٧١.
٣. سورەتی الأعراف: ٨٩.
٤. سورەتی هود: ٥٤-٥٦.
٥. سورەتی هود: ٨٨.

﴿ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾[1] (ئەمەش تەنها بەشێکە لە هەڵوێستی بەرزی پێغەمبەرە مەزنەکانی وەك حەزرەتی نوح و هود و صالح..)

کاتێکیش فەرمانبەریی بانگەواز دۆخێکی وای وەرگرت کە چیدی مرۆڤ ناتوانێت بەرگەی بگرێت، بە هەموو بوونیان ڕوویان لە خوا کرد و، وتیان ﴿ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾[2](ئەمەش چەپکێك پەیامە دەربارەی تەوەکوول لە حەزرەتی ئیبراهیمەوە و پێشکەشە بە ڕێبوارانی ڕێگای حەق..)

لەڕاستیدا هەموو ئەم مرۆڤانەی کە ئیرادەیان بەهێز و هەڵوێستیشیان لەجێی خۆیدا بووە، هەمیشە بەدوای هەمان ئامانجدا وێڵبوون و، بەهەمان ئاڕاستە جوڵاون و، ڕێزیان لەهەمان بەها گرتووە. لە هەست و بیر و هەڵسوکەوتەکانیاندا هەمان شت نمایانە و، لە پەیامەکانیشیاندا هەمان دەعوا و بانگهێشت بەرچاو دەکەوێت. هەرچەندە ئەم پێغەمبەرانە لە کات و سەردەم و شوێنی جیاوازدا دەرکەوتوون، بەڵام بەئاشکرا دەردەکەوێت کە هەموویان نوێنەر و جێبەجێکاری هەمان ئەرك و فەرمانبەرین. دیارترین تایبەتمەندیی ئەمانە بریتییە لەوەی کە لە سەرجەم چالاکی و هەڵسوکەوتەکانیاندا ڕەچاوی ڕەزامەندیی خوای گەورەیان کردووە و، لە

١. سورەتی إبراهيم: ١١-١٢.
٢. سورەتی الممتحنة: ٤-٥.

خەباتیشیاندا تەنها پشتیان بە توانا و چاودێریی ئەو بەستووە و، هانایان بۆ پارێزگاریی ئەو بردووە و، بەناوی ئەوەوە کاروباریان ڕاپەڕاندووە.

هەرچی ئەرکی سەرەکیی ئەم مرۆڤە پیرۆزانەیشە، بریتییە لە: ڕزگارکردنی مرۆڤەکان لە تاریکییەکانی گومڕایی و کوفر و گەیاندنیان بە ڕووناکیی ئیمان، بێدارکردنەوەی ڕۆحەکان و ناساندنی خوا بە دڵەکان، ڕەواندنەوەی گومان و دوودڵییەکان بەوەی کە ئەمدیو و ئەودیوی پەردەی بوونەوەریان -وەك خۆی- پیشانی زیهنەکان داوە، هێندە نووریان پرژاندووە بەسەر ڕوخساری بووندا تا وەك پەڕاوێك بخوێنرێتەوە و چەشنی پێشانگایەکی شتە سەرسووڕهێنەرەکان تەماشابکرێت و، مانەندی بەرهەمێکی هونەری ڕاڤەی بۆ کرێت و وێنەبکرێت، پاشان گوزارشت کردن لەم حەقیقەتانە بەگوێرەی ئاست و تێگەیشتنی ڕۆژگار و، گۆڕینی ئەم گوزەرگا فانییەی دونیا بە پلیکانەیەك و، پردێك و کێڵگەیەك و بازاڕێکی جیهانە هەمیشەییەکان.

کاتێك قورئان باسی هەندێك لەم ئەرکانە دەکات، بەم جۆرە فەرمان بە پێغەمبەری خوا دەکات ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾[1] و، چوارچێوەی فەرمانبەریی پێغەمبەرایەتیش بۆ ئێمە دیاریدەکات. لەم بابەتەدا پێغەمبەری ئێمە تەنیا نییە، هەموو پێغەمبەران هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە هەتا حەزرەتی موسا، لەویشەوە هەتا حەزرەتی عیسا هەمان خزمەتیان پێشکەش کردووە. قورئانی پیرۆز هەر لە هەمان سورەتدا دەربارەی حەزرەتی موسا دەفەرمووێت:

١. سورەتی إبراهیم: ١.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ﴾ (ابراهیم: ٥)

گەرچی نوێنەرانی ئەم فەرمانبەرییە مەزنەی کە پێویستی بە هەستێکی بەرپرسیارێتیی جددی و، ئیرادەیەکی پتەو و کەسایەتییەکی بەهێز هەیە، ئەوانیش هەر وەك ئێمە مرۆڤ بوون، بەڵام ئەوان مرۆڤانێکی جیاوازی وا بوون کە خاوەنی هیممەت و ئیمان بوون و، هەتا بڵێی ڕاست و دروست و، ئەوپەڕی ئەمین و، هەمیشە لە خەیاڵی ئەرکەکەیاندا بوون و، لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورەدا هەڵپەیەکی بێسنووریان نواندووە و، بەرامبەر بە گوناهەکانیش هەمیشە خۆڕاگر و دامەزراو بوون و، بانگکردنی مرۆڤەکانیش بۆ لای خوای گەورە وەك خوویەك و خولیایەکی لێهاتبوو لە سروشتیاندا.. بێ وچان و بێ وەستان بەرەو ڕێنمایی خەڵك ڕایاندەکرد و، هەموو کاتێك بەوپەڕی چێژەوە ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکرد و، بێزاربوون و ماندووبوونیان نەدەناسی و، لەپاڵ ئەوەدا کە بەوپەڕی هەستیارییەوە ئەرکی سەرشانیان ڕادەپەڕاند، لەهەمان کاتدا خۆیان لە کاروبارە خواییەکان هەڵنەدەقورتاند و، خۆیان بە حسابکردنی ئەنجامەکانەوە سەرقاڵ نەدەکرد و، تەنها و تەنها چاوەڕێی ڕووتێکردن(التوجه)ی خوایی بوون. دەیانزانی کە هیدایەت و گومڕاییش لە لایەن خواوەیە -لەگەڵ دانانی بە کاریگەریی ئیرادەی مرۆڤدا وەك "هۆکارێکی هەندەکی و گوێڕەیی"- و، هەموو فەرمان و بڕیارێکیان دەگێڕایەوە بۆ خوا و، هەزاران جار لەبەرامبەر قەزا و قەدەری خواییدا ملکەچ بوون. ئەمانە لەپاڵ ئەوپەڕی ڕەچاوکردنی بابەتە نەقلی و تەشریعییەکاندا، تابڵێی هەستیاربوون بەرامبەر بە فەرمانە

تەکوینییەکان. ئەمانە هەم لەبەرامبەر قورئان و گەردووندا و، هەم لەبەرامبەر گوێگرەکانیان و خوای خۆیاندا خاوەنی هەڵوێستێکی دروست و دامەزراو بوون. ئەمەش هەڵوێستێکی تایبەتە بە هەڵبژێرراوەکان و (أولو العزم)ەکان.

ئەم مرۆڤە هەڵبژێرراوانە هیممەتیان ئەوەندە بەرزە کە نە بەوەی دەستیان کەوتووە وازدەهێنن، نە بەوەی لەدەستیشیان چووە دەکەونە داوی نائومێدی و شڵەژانەوە. سەرکەوتنەکان بە هی خوا دەزانن و، شکستەکانیش دەدەنە پاڵ نەفسی خۆیان و، هەمیشە ڕێك و ڕاست دەڕۆن و، هەوڵ دەدەن لانەدەن. خۆ ئەگەر هەژانێکی کەمیش ڕوویدات، خێرا ڕاست دەبنەوە و لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبن. نە بە قازانجە دونیاییەکان دڵ خۆش دەکەن و لەخۆیان بایی دەبن، نە بەوەی لەدەستیان چووە خەم و پەژارە دایاندەگرێت. هەموو مەزهەرییەتەکان لە خواوە دەبینن و، لە لایەك لە ترسی ئەگەری تاقیکرانەوە هەڵدەلەرزن و، لە لایەکی دیکەشەوە هەموو چاکە و جوانییەکان بەوەوە دەبەستنەوە و هەمیشە لە حزووری شکۆداری ئەودا بەوپەڕی ڕێزەوە دەوەستن. لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستە توندوتۆڵەی ئەم کەسە هەڵبژاردانەدا خوای گەورەش هەرگیز بە تەنها جێیان ناهێڵێت، لە دونیادا بە سەرکەوتن پشتگیرییان لێدەکات و شەرەفمەندیان دەکات بە وەرگرتنی ناونیشانی "میراتگرانی زەوی" و، لە ئاخیرەتیشدا دەیانکات بە دانیشتووانی فیردەوسی باڵا. ئەمەش شایەت:

﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّـٰلِحُونَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٥)

"سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە لە کتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمان داوە کە:
بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی."

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾

(المؤمنون: ١٠-١١)

"ئا ئەوانە میراتگران و خاوەنانی بەهەشتن. ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس
و بۆ هەمیشە ژیانی نەبڕاوەی تیادا دەبەنە سەر."

لەبەرئەوەی دینەمۆی ناوەکی و کار و فەرمانبەریی ئەم باڵابەرزانە هێندە فراوانە کە چوارچێوەی ئەم وتارە دەبەزێنێت و، پێویستە سەربەخۆ تاوتوێ بکرێت، ئەوا لێرەدا بەمەندە کۆتایی بە باسەکە دەهێنین.

## ئەو شتانەی لە سیمای پێغەمبەرایەتیدا دەیانخوێنینەوە

هەروەك خوای گەورە ویستی لەسەر ئەوەبووە کە لەڕێگەی بوون و گەردوونەوە خۆی بناسێنێت، بەهەمان جۆر خواستی لەسەر ئەوە بووە لەڕێگەی زمانی وەحییەوە مرۆڤ فێربکات کە: فەرمانە تەکوینی و فەرمانە دابەزیوەکانی نێو کتێبە پیرۆزەکان پێکەوە موتاڵابکات، بەو شەماڵانەی کە لەڕێگای بیستنەوە دێنە ژوورەوە و ڕۆح دادەپۆشن پشتگیری لەو مانایانە بکات کە لە دەرگای چاوەوە دەڕژێنە ناخەوە، چەمکی خوایەتی لەسەر ئاستی زات و ناو و سیفەتە پیرۆزەکان و بەگوێرەی دەستووری "من حیث هو هو" بخاتەڕوو. بێگومان لەگەڵ ئەمانەشدا ئیرادەی پیرۆزی خوا وای خواستووە کە بەندەکانی فێری بەرپرسیارێتییەکان و، چۆنێتیی بەجێهێنانی ئەم بەپرسیارێتییانە بکات و، لە ئاداب و ئوسوڵی ئەو ڕێگایەی پێیدا ڕۆیشتوون و دەڕۆن ئاگاداربکاتەوە و، گەورەیی ئەو ئامانجە مەزنەشیان یادبخاتەوە کە لە کۆتایی ڕێدا پێی دەگەن. بەڵێ، هەروەك زانیاریی ڕاست و دروست سەبارەت بە غەیب پێویستی بە وەحییە،

وەحیش لە لایەن خۆیەوە داخوازی پێغەمبەرایەتییە. هەر لەسەر بنەمای ئەم داخوازییەیە کە خوای گەورە هەموو سەردەمێك و هەموو کیشوەرێکی -لە ڕۆژگارێکی دیاریکراودا- بە ناردنی پێغەمبەرێکی جیاواز شەرەفمەند کردووە. بەدیعوززەمان گوتەنی: ئەو قودرەتە ئەزەلییەی کە مێروولە و هەنگی بێ سەرکردە و پێشەوا جێنەهێشتووە، مرۆڤایەتیشی هەرگیز لە ڕابەر و ڕێنموونیکار بێبەش نەکردووە.

خوای گەورە بە زانست و ویستی خۆی گەردوونی بەدیهێناوە و، بوونی دەرەکی لەبەرکردووە و، هەموو شتێك و بوونەوەرێکی زەمینی و ئاسمانی و، ئاسك و چرووپر و، گیاندار و بێگیانی بە چەندەها دانایی و بەرژەوەندیی جۆراوجۆر ڕازاندووەتەوە و، بەچەند مەبەستێکەوە وابەستەی کردووە و بۆ چەندەها ئامانجیش ئاراستەی کردووە. لە لایەکی ترەوە خوای گەورە، لەشێوەی شەپۆلی تەجەللییەکی جیاوازدا، بۆئەوەی خۆی "وەك خۆی" بناسێنێت و، لەم ڕووەوە هەموو کەسێك لە بوونی خۆی بێداربکاتەوە و، بەتایبەت بۆئەوەی بەدیهاتووە خاوەن هەست و شعوورەکان ئاگاداربکاتەوە لەوەی کە بۆچی بەدیهاتوون و، بۆ چ شتێك و شوێنێك دەپاڵێورێن و، بەرپرسیارێتییەکانیان بریتین لە چی.. بەڵێ، لەبەر هەموو ئەم مەبەستانە خوای گەورە هەندێك کەسی تایبەتی وەك نوێنەر ناردووە بۆ مرۆڤایەتی تا ببن بە وەرگێڕی نهێنییەکانی خوایەتی و ڕێساکانی بەندایەتی. هەروەك بەدیهێنەر لەڕێگەی ڕەنگ و، شێوە و، نەخش و، جوانی و، مانا و ناوەرۆکی بەدیهاتووەکانیەوە خۆیمان پێدەناسێنێت، بەهەمان جۆر لەڕێگای ئەم مرۆڤە هەڵبژاردانە و گوفتارە نازڵ بووەکانیەوە و، بەڕەچاوکردنی ئاستی هەست و شعوور و تێگەیشتنی

ئادەمیزاد و، ئەو گونجان و تەباییەش کە لەنێوان زات و ناو و سیفەتە پیرۆزەکانیدا هەیە، دەخوازێت نهێنییەکانی خوایەتی و پەروەردگاریتی و، ئامانجی بەدیهاتن و، ئەنجامی فیترەت و، پێگەی مرۆڤ لەسەر زەوی و، ئەو جێگایەی کە دواجار پێی دەگات، بدات بەگوێی ڕۆحەکانماندا.

ئەوەندە هەیە خوای گەورە -کە لە هەموو کاروبارێکیدا چەندەها حیکمەتی هەیە و بازنەی پەروەردگاریتیی ئەو لە یەك کاتدا ڕەچاوی چەندەها دانایی و بەرژەوەندیی بێسنوور کردووە- لەم فەرمانە تەشریعی و نازڵبووانەدا هەموو کەسێکی وەك قسەبۆکراو قبووڵنەکردووە و، لەگەڵ هەموو کەسێکدا ڕوون و ئاشکرا گفتوگۆی نەکردووە و، لە بابەتێکی گرنگی لەم جۆرەدا کە پێویستی بە تایبەتمەندییە، هەندێك کەسایەتیی دانسقەی وای هەڵبژاردووە کە بەهرە و توانای تایبەتیان پێبەخشراوە و ژیانیان لەسەر ئاستی دڵ و ڕۆح بەسەربردووە و، لەگەڵ ئەمانەدا دواوە. لەڕێگەی ئەم توانا و لێهاتنە مەزن و، سروشتە دەراسا و، خاوەن تایبەتمەندییە باڵایانەوە بابەتەکانی وەك ئامانجی بەدیهاتن و، حیکمەتەکانی بوون و، مانا و ناوەڕۆکی دونیا و شتانی ناوی و، ماهییەتی جیهانەکانی غەیب و، ئەو ڕێگایانەی ئادەمیزاد دەگەیەنن بە بەهەشت و نەمری، گەیاندووە بە ویژدانی مرۆڤایەتی و لەسەرجەم ئەم کاروبارانە ئاگاداری کردوونەتەوە. گاهـ دڵەکان کەوتوونەتە ترس و سام لەهەمبەریەوە و، گاهـ شاباڵی بە شەوق و ئارەزووەکان گرتووە بەرامبەر بە جیهانەکانی ئەودیو و، پێی ڕاگەیاندوون کە سەرانسەری گۆی زەوی بریتییە لە پێشانگایەك بۆ درەوشانەوەی جوانییەکانی خۆی و، سەبارەت بە جیهانی هەتاهەتایی زەمینەی چاندن و دوورینەوە و خەرمانکردنە و،

بەمەش ئەوانی لە تەنیایی و، نەبوونی ئامانج و مەبەست و فەرمانبەرێتی ڕزگارکردووە و، حاڵی کردوون کە ئەم جیهانە وەك هۆڵی چاوەڕوانیی ئەودیو وایە و، بە مژدەیەك ڕۆحە لەبار و گونجاوەکانی دڵخۆش کردووە کە زۆر لەسەروو بوون و هەستکردن بە بوونەوەیە، کە ئەویش بریتییە لە پەیمانی ئەبەدییەت و بینینی جوانیی پیرۆزی خۆی.

خوای گەورە سەرجەم ئەم ئامانجە مەزنانەی لەڕێگای ئەم مرۆڤانەوە هێناوەتەدی کە ناوی پێغەمبەری لێناون و کردوونی بە زمان و، تەرجومان و، ڕاڤەکاری بوونەوەران و شتان و، پێشەوایانی عیبادەت و، ڕاسترەوی و، ئیخلاص و، ڕابەرانی ڕێگای گەیشتن بە خانەی ئاخیرەت. ئەم سروشتە باڵایانە، هەریەکە و لە ڕۆژگاری خۆیدا، بە مەیدانی فەرمانبەرێتیی خۆیاندا گەڕاون و، بانگی خەڵکیان بۆ لای حەق کردووە و، داواکارییەکانی ئەویان گەیاندووە بەهەموو کەسێك و، ڕابەرایەتی هەموو ئەو کەسانەیان کردووە کە کەوتوونەتە سنووری بەرپرسیارێتیی ئەوانەوە.

هەموو پێغەمبەران -هەرچەندە لەنێو خۆیاندا پلەیان جیاوازە- نموونەی ئەخلاقی بەرز و، ئاوێنەی سروشتی پاك و، سەرمەشقی نامووس و داوێنپاکی و، مەردی مەیدانی ئەمانەت و، پاڵەوانی ڕاستگۆیی بوون. ئەم جۆرە کەسانە بە کەسایەتییە بەرز و، هەڵسوکەوتە جددی و، ڕاستگۆییە نەگۆڕ و، ئەو ڕاسترەوییەیان کە هەرگیز لادانی بەخۆوە نەبینیوە و، ئەو وەفایەیان کە لە ئاستی وەفای فریشتەکاندا بووە و، ئەو دامەزراوییەیان کە چەشنی چیاکان ڕەگداکوتاو بووە و، ئەو هەستی بەندایەتییە هەرە قووڵەیان، هەمیشە نموونەگەلێکی وابوون کە بە پەنجە

ئاماژەیان بۆ کراوە. لەهەمان کاتدا ئەم مرۆڤانە بە ڕوخسار و سیما بێ کەموکوڕییەکەیان و، هەڵسوکەوتیان کە خوای بیری خەڵك دەهێنایەوە و، سەرگوزەشتەی ژیانیان کە هەموو کاتێك کراوەبووە بەڕووی شتانی دەراسادا و، توانا و لێهاتنە مەزنەکەیان لە چارەسەرکردنی هەر کێشەیەکی کەسی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سیاسی و کلتووری کە دەهاتە ڕێیان و، کاریگەریی نائاساییان لەسەر چواردەورەکەیان و، بەهرەی گوفتار و ڕەوانبێژییە سەرسوورهێنەرەکەیان و، پێوەرە هاوسەنگ و گونجاوەکانیان دەربارەی ڕاستییەکانی مرۆڤ و گەردوون و خوایەتی و، بەهرە سەروو مرۆییەکانیان کە بەهۆیەوە دەیانتوانی سەرجەم لایەنەکانی دڵ و ڕۆح و زیهن و فیکر و هەستی مرۆڤەکان تێربکەن و، بە هەڵسوکەوتە خاوەن بەسیرەت و هاوسەنگەکانیان -کە لە جیهانبینیی ناوازەی ئەوانەوە سەرچاوەی گرتبوو بەرامبەر بە دیوی دەرەوە و ناوەوەی شتان و بوونەوەران- کاتێك مامەڵەیان لەگەڵ هاوسەنگیی گشتیدا دەکرد... بەڵێ، ئەم مرۆڤە ناوازانە بەم تایبەتمەندییانەیان بوون بە وتەبێژی جیهانی پەروەردگارێتی و، وەك ئاوێنەی تیشکدەرەوەی نهێنی و فەرمانە خواییەکان وابوون.

بەڵێ، هەموو پێغەمبەرێك ڕابەرێکی ئەمینی ئەو ڕێگایانەیە کە مرۆڤ دەگەیەنن بە بەختەوەریی دونیا و قیامەت، ئامۆژگاریکەرێکی گۆیایە بۆ بێدارکردنەوەی دڵەکان بەڕووی جوانییە خواییەکاندا، مورشیدێکە خاڵی لە هەموو کەموکورتییەك لە چوونە ناو ڕۆحی قسەبۆکراوەکانیدا، زێڕەنگەرێکی خاوەن ئەزموون و بەهرەیە لە داتاشینی بیر و هەستەکانی کەسانی بەرامبەر و گرێدانیان بە ئامانجی

بەدیهاتنیانەوە، پەروەردەکارێکی کامڵە لەبواری ڕیشەکێش کردنی خووە خراپ و، عادەتە چەوت و، سروشتە شێواوەکاندا و، دانانی بەها مرۆییە بەرزەکان لەجێیاندا.. ئیمانیان بەهێزە و، ئەوپەڕی متمانەیان بە خوا هەیە و، دڵنیان لە حەققانییەتی ئەو پەیامانەی پێشکەشی خەڵکی دەکەن و، هەمیشە بێ دوودڵی قسەدەکەن و، لەبەرامبەر ڕووداوە هەرە سەخت و ترسناکەکانیشدا بێپەروا و بێباك -بەڵام لەهەمان کاتدا- بەوپەڕی خۆڕاگری و فەتانەتەوە هەڵسوکەوت دەکەن و، تابڵێی جددی و جێگیر و دامەزراون. بەجۆرێك ئەوان نە شوێنکەوتووەکانیان فریوداوە و سەریان لێشێواندوون، نە شوێنکەوتووەکانیشیان لە گوێڕایەڵی و دواکەوتنی ئەواندا هەستیان بە پەشیمانی کردووە. بەڵێ ئەمە هەر وایە، چونکە ئەوان -شتانێکمان پێشکەشدەکەن کە زۆر لەسەروو بەرهەمەکانی هەست و، بیرکردنەوە و، لۆجیك و داوەریی ژیریمانەوەیە- دەوڵەمەندترین خەزنەداری ڕاسترین و، ڕوونترین و بێگەردترین زانیارییە لاهوتییەکانن و، ئەمینترین پێشەوای ڕێگای ئیمان و، مەعریفەت و، خۆشەویستی و، عەشق و شەوق و، زەوقی ڕۆحانین و، باوەڕپێکراوترین ڕێنیشاندەرن بۆ گەیاندنی خەڵکی بە خوا. ئەو کەسانەی بە زایەڵەی ئەوان بێداربوونەتەوە، چاویان بەڕووی حەقدا کراوەتەوە و، بە ئاوی کەوسەری ئەوان ئەو زمانانە هاتوونە گۆ کە بە وتنی مەعریفەت پشکوتوون و، ئەوانەش کە بەدوای ڕەزامەندیی خوای گەورەدا گەڕاون، لە کەشوهەوای ئەواندا مرازی دڵیان دیوەتەوە و، ئەوانەش کە مەراقی نهێنییەکانی کتێبی گەردوونیان کردووە، بەیارمەتیی ئەو دەستوورانەی ئەوان پێشکەشیان کردووە، توانیویانە ئەم کتێبە پڕ لە ڕاز و نیازە بە ڕاستی بخوێننەوە.

پێغەمبەران مامۆستای هەموو پێشکەوتنە ماددی و مەعنەوییەکانن و، پێشڕەوانی ڕێگای کەمالاتی عەقڵی و ڕۆحین و، ئەندازیار و پێکهێنەری سەرجەم یاسا و ڕێسا دینی و دونیاییەکانن. تەنها لەسایەی ئەواندا مرۆڤایەتی لەئاستی ژیانی بایۆلۆجیی سادەوە بەرزبووەتەوە بۆ ئەو (أحسن التقويم)ەی کە ناونیشانێکی دیکەی "مرۆڤی ڕاستەقینە"یە. بەیارمەتیی ئەوان خۆی دۆزیوەتەوە و، لەپێگەی خۆی لەنێو بوونەوەراندا تێگەیشتووە و، بەهۆی ڕابەرایەتیی ئەوانیشەوە تامی ئەو ژیانە فراوانەی ئەولیا و، ئەصفیا و، پیاوچاکان و نزیکخراوەکان (المقربين)ی کردووە.. وە تەنها بەهۆی فێرکردن و، ڕێنمونیکردن و ڕووناکییەکانی ئەوانەوە بووە کە ڕووی ڕاستەقینەی دونیای بینیوە و، وەکو تاقیگەیەك و، دەرمانخانەیەك و، کۆشکێکی نایاب و، پێشانگایەکی سەرسووڕهێنەر هەڵیسەنگاندووە و سوودی لێبینیوە. بەڵێ، هەروەك بەدیعوززەمان ئاماژەی بۆ دەکات، کاتێك خوای گەورە فەرمانی شوێنکەوتنی پێغەمبەران بۆ مرۆڤەکان دەردەکات، لەپاڵ ئەوەدا کە شەرەفمەندیان دەکات بە ناسینی قووڵیی مەعنەویی ئەوان و سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی بێگەرد و بەخوڕی ئەوان، بەهەمان جۆر لە موعجیزەکانیشدا کە وەك نیشانە و ئاماژەی پێغەمبەران وان، ڕێگاکانی پێشکەوتنی ماددی پیشانی مرۆڤایەتی دەدات و، بەلایەنی کەمەوە هەندێك تیشکی خستووەتە سەر ئەم بابەتانە و، سیستەمی وەرگرتنی ڕۆحە هەستیار و چاوتیژەکانی بزواندووە و، لە خەیاڵیاندا دەرگای لەسەر پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان والاکردووە و، لەناویاندا زەمینەی بۆ زریانی فیکری ئامادەکردووە.

بەڵێ، هەموو موعجیزەیەك ئاماژەیەك و، ڕوونكردنەوەیەك و، بیرخستنەوەیەك و، یادهێنانەوەیەکە لەسەر فەرمانە تەکوینییەکان و، بانگهێشتێکە بۆ لێکۆڵینەوە لە تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکانی ئەم مرۆڤە ناوازانە و سوودوەرگرتن لێیان. وەکو کەشتییە موعجیزەئاساکەی حەزرەتی نووح کە لە دارتاشخانەی پێغەمبەرایەتیدا دروستیکرد.. کراسەکەی حەزرەتی ئیبراهیم کە لە کارگەی (حسبي اللّه) چنرابوو کە ماددەی (ئامیەنت)[١]مان بیردەخاتەوە و، بگرە لەو زیاتریش بەرگەی پلە بەرزەکانی گەرمای دەگرت.. سەعاتەکەی حەزرەتی یوسف کە ماهییەتەکەی نادیارە و، خوای گەورە بە لوتفی خۆی و بەشێوەیەکی موعجیزەئاسا پێشکەشیکرد کاتێك بەدوای خشتەی کاتەکاندا دەگەڕا و تا ڕادەی ناچاری پێویستی پێی بوو.. عەصا دەراساکەی حەزرەتی موسا کە لە پەمپ و، ترومپا و بیرە مۆدێرنەکانی دەرهێنانی ئاو دەچێت.. موعجیزەی نەرمکردنی ئاسن و، تواندنەوەی لە قاڵبی تردا و، پاشان پێدانی شکڵ و شێوەی جیاواز پێی لە لای حەزرەتی داود کە پیشەسازیی ئاسنمان یاددەخاتەوە.. گواستنەوەی عەرشی بەلْقیس بە شکڵ و وێنە و دەنگ -لەوانەشە بەگشت جوانکاری و وردەکارییەکانیشیەوە- لە لایەن حەزرەتی سلێمانەوە، کە تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت و شتانی لەمانەش پێشکەوتووتر بیری خەیاڵەکان دەخاتەوە.. هەروەها گەشتە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەم پێغەمبەرە مەزنە کە ماوەی دوو مانگەڕێی لە ڕۆژێکدا دەبڕی. ئەمەش تەکنەلۆجیای فڕۆکەی ئەم سەردەمەمان دەهێنێتەوە یاد.. هەروەها ڕووداوی ڕامکردنی جنۆکە و

١. بریتییە لەو ماددەیەی کە ناسووتێت و پۆشاکی پیاوانی ئاگرکوژێنەوە و هەندێك کەلوپەلی تری لێ دروستدەکرێت.

عیفریت و شەیتانەکان هەر لە لایەن ئەم پێغەمبەرەوە کە نیشانەی دەست وەردانیەتی لە جیهانەکانی میتافیزیك و دەرگا دەخاتە سەرپشت لەسەر دواین سنووری ئەو چالاکییانەی کە لەم ڕۆژگارەدا لەبواری ڕۆحەکاندا دەکرێن.. هەروەها ڕووداوی (منطق الحيوانات)ی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە کە تەکنیکی فێربوونی زمانی باڵندە و مێروولە و زیندەوەرامی تر یان کۆدی تێگەیشتن لێیان نیشان دەدات، بگرە لەم ڕووەوە هانیشمان دەدات.. موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا دەستەیەك چارەسەری نایابی وا پێشکەش دەکەن کە زۆر لەسەروو ئاستی زانستی پزیشکی و زانستی جیناتی ئەم ڕۆژگارەوەیە، وەك گیانکردن بە بەری شتانی بێگیاندا و، چاککردنەوەی کوێری و گولیی زگماك و، زیندووکردنەوەی مردووان.. وە سەدان موعجیزەی شانازیی مرۆڤایەتی "حەزرەتی موحەممەد" کە بەقەدەر موعجیزاتی هەموو پێغەمبەران دەبێت.

پێغەمبەرایەتی بریتییە لە توانا و لێهاتن و بەهرەیەکی بەرزی ڕەببانی بۆ وەرگرتنی ئەو زانستە پێویستانەی کە لای خواوە دێن و، تێگەیشتن لێیان و، پاشان گەیاندنیان بە کەسانی تر بێئەوەی هیچ شتێکی تریان تێوە بچێت کە دژی مانا و ناوەرۆکیان بێت. کرداری ژیان و وەچەخستنەوە بەیارمەتیی پاڵنانی خوایی (السَّوْق الإلهي) لەناو خەڵکانی ئاسایی و بوونەوەرانی تردا چەند گرنگ و پێویستە -هەرچەندە ئەمە چوواندنێکی کەمێك نزمە- فەرمانبەری و لێپرسراوێتیی ئەو ڕۆحانەش کە بە پێغەمبەرایەتی سەرفرازبوون -بە ڕەچاوکردنی گرنگیی موشاهەدە و موراقەبەکانیان و، ئەو ڕاستییەی کە پێغەمبەران بە میکانیزمی ویژدان شتان دەبینن و هەڵدەسەنگێنن کە بریتییە لە تێکەڵەیەك لە

لوتیفەی ڕەببانی و هەست و شعوور و تێگەیشتن و، هەر بەمەش ڕاستی و دروستیی شتان یەکلایی دەکەنەوە و چارەسەر بۆ کێشەکان دادەنێن و، لە کاتی پێویستدا ئیجتیهاد دەکەن- وەك بڵێی لەهەمان چوارچێوەدا بەرێوەدەچێت. بەڵێ، ئەوان وەك بەشێك لە سروشتیان هەست بەو پەیامانە دەکەن کە لە خواوە پێیان دەگات و، وەك پێداویستییەکی فیترەتیشیان دەیگەیەنن بەوانەی کە دەبێت پێیان بگات و، هەمیشە بێ پشوو و بێ ماندووبوون بەو جۆرە ڕەفتار دەکەن کە فەرمانیان پێکراوە. کاتێکیش هەڵسوکەوت دەکەن، وەك ئەوەی داخوازییەکی سروشتیی خۆیان بەجێهێنابێت، چاوەڕێی هیچ جۆرە دیاری و پاداشتێك ناکەن.

زۆرێك لە زانایان ڕایان وایە ئەو خزمەت و چالاکییەی -کە خاوەنی ئیقتیرانە لەگەڵ هەڵبژاردنی خوایی و، کارپێسپاردنی ڕەببانی و، توانا و لێهاتنی ناوەکییان- کە پێغەمبەران پێشکەشی دەکەن وەکو کۆمەڵێك هەڵمەت و هەڵسوکەوت وان لە جۆری کرداری پێویست سەبارەت بە ویژدانی پاك و بێگەردیان. پێغەمبەرایەتی، لەسەر بنەمای ئەم تەفسیرە، بریتییە لەو بەخشش و بەهرە خواییەی کە دەبەخشرێت بەو ڕۆحانەی لەپاڵ ئەوەدا کە خاوەنی ویژدانێکی وان بەهەموو لایەنەکانیەوە ڕووی لە ئامانجی بەدیهاتنی خۆی کردووە -دەتوانین بڵێین کە سەرجەم توانا و بەهرەکانی تەقیونەتەوە- دارای سروشتی ساغ و، فیترەتی ڕاسترەون و، لەڕووی ماهییەتیشەوە وەك دڵۆپی ئاو وان بۆ ڕەنگدانەوەی پێغەمبەرایەتی بەتەواوەتی و، پێغەمبەرانیش نمایندەی تایبەتی ئەم بەخشش و بەهرە پیرۆزەن. لەم ڕووەوە دەربارەی پێغەمبەرایەتی وتراوە کە بریتییە لە تێگەیشتن و پەیبردن بەو شتانەی کە توانای مرۆڤ دەرکیان

ناکات و، پاشان گەیاندنی بە قسەبۆکراوانی پلەدوو بەبێ هیچ جۆرە شکان و شکانەوەیەك. هەر لەم ڕووەوە ئەو بە خاڵی یەکگرتنی نێوان سەرەتا و کۆتا دانراوە. خوای گەورە ویستی لەسەر هەر کەسێك بوویێت، بەگوێرەی دەستووری ﴿يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾[1] "ئەوزاتە بەهەر کەس بیەوێت حیکمەت و دانایی پێ دەبەخشێت و هەر کەس حیکمەتی پێ ببەخشرێت، ئەوە بێگومان خێرێکی زۆری پێدراوە."، سەرفرازی کردووە بە کۆمەڵێك پلەوپایەی مەزن و، پاشان لەڕێگای ئەم کەسایەتییە ناوازانەوە "نهێنییەکانی ئولوهییەت" و "نهێنییەکانی ڕبووبییەت"ی گەیاندووە بە ویژدانەکانی تر و، ئەوانیشی ڕۆشن کردووەتەوە...

ناردنی ئەم کەسایەتییە بەرزانە کە بێگوناهن و لەژێر چاودێریی خوایەتیدان لە لایەن خواوە بۆ مرۆڤایەتی، سەبارەت بە ئێمەومانان کە لەوانەیە سەرسام ببین و لە ڕێگا جێبمێنین و بەهیلاکدا بچین، بەئەندازەی بەدیهاتن و نیعمەتی بوون، بگرە لەویش زیاتر، بەخششێکی جیاواز و گرنگە. بەڵێ، هاتنەبوون نیعمەتە، بەڵام ڕوونکردنەوەی هەموو گەردوون و ڕووداوەکان لە ڕێگای نوێنەرێکەوە و، ڕاڤەکردنی و، پاشان دەرهێنانی لایەنە ئاخیرەتی و ئیلاهییەکان لێیانەوە لوتف و کەرەمێکی تەواو جیاوازە. هەموو سروشتێکی پاك و لێڵنەبووی مرۆڤ و هەموو ویژدانێك کە کوێرنەبووبێتەوە -ئەگەرچی لە ئاستی جۆراوجۆریشدا بێت- دەتوانێت لەڕێگەی هەڵسەنگاندن و سوودوەرگرتن لەم ڕاڤە و ڕوونکردنەوانەوە بگات بە پایەیەکی بەرزی وا کە ڕۆحانییەکان ئیرەیی پێببەن. نمونەیەکی

---

١. سورەتی البقرة: ٢٦٩.

زۆریشمان لە ڕابردوودا لەسەر ئەمە هەیە. لەبەرامبەردا ئەوانەی لە داوی خۆبەگەورەزانی و، ستەم و، لادان و چاولێکەریی کوێرانەدا گیریان خواردووە، هەروەك هەست بە لوتفی هەبوون ناکەن، بەهەمان جۆر لە بابەتی ئیحسانی دووهەمیشدا -بەیارمەتیی ئیرادەیان وەك مەرجێکی لاوەکی- پێیان لە کوێری و، کەڕی و نابینایی دڵی خۆیان هەڵدەکەوێت و، بە وتنی ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴾[1] "دەبوایە فریشتەیەك بۆ لای دابەزیبایە!! تائەویش لەگەڵیدا خەڵکی بێداربکاتەوە و (لەسەرەنجامی سەرپێچی) بیانترسێنێت!!" یاخیبوونی خۆیان نیشاندەدەن و، ئاسۆی خۆیان بەجارێك تاریك دەکەن.

ناردنی پێغەمبەر و هەڵبژاردنی کەسێك بە پێغەمبەر بەندە لەسەر ویستی خوایی. لەم ڕووەوە پێویستە هەموو کاروبارێکی ئەو لەژێر ڕۆشنایی دەستووری " حیکمەت هەیە لە هەموو کارێکیدا، خوا کاری نابەجێ ناکات."دا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و، پاشان بەئەندازەی توانای تێگەیشتنی عەقڵیش هەوڵی دۆزینەوەی حیکمەتەکانی بدرێت. دەکرێت باس لە چەندەها دانایی و بەرژەوەندی گرنگ بکرێت لە هەڵبژێررانی پێغەمبەران لە مرۆڤەکانی ناو خۆمان و، هەستکردنیان بەو شتانەی لە ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیاندا ئێمە هەستیان پێدەکەین و، چێژوەرگرتنیان لەو شتانەی ئێمە حەزیان پێدەکەین و، هاوبەشیکردنیان لە سەرجەم خۆشی و ناخۆشییەکانماندا و، هەستکردنیان بە پێداویستی و داخوازییەکانمان لە ڕۆحیاندا و، لەکۆڵنانی ئەو بەرپرسیارێتییە کە بڕیار وایە بخرێتە سەر شانی قسەبۆکراوان و کۆمەڵگاکەیان و، گونجاوییان

---
١. سورەتی الفرقان: ٧.

بۆ چاولێکەری و پێهەڵگرتن لە لایەن شوێنکەوتووانیانەوە.. بەکورتی ئامانج لە هەڵبژاردنی پێغەمبەران لەناو مرۆڤەکان خۆیانەوە بریتییە لە نوێنەرایەتی کردنی پەیامە خواییە ئاسمانییەکان لەسەر زەویدا. بەڵام ئێمە دیسانیش دەڵێین ''خوای گەورە باشتر ناوەرۆکی ئەم بابەتە دەزانێت''[١] و، ملکەچیی خۆمان بۆ حەقیقەتی "فَلِلّهِ الحُجَّةُ البلِغَة"[٢] دووپات دەکەینەوە و، لەهەمبەر ئەو بەهەموو شت زانا و خاوەن حیکمەتەدا بێدەنگی بە دانایی ئەژماردەکەین.

بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو تایبەتمەندییانەیان، نابێت ئەوە لەبیربکرێت کە پێغەمبەران و نێرراوە بەڕێزەکان مرۆڤگەلێك بوون وەك ئێمە. بەڵێ، ئەوانیش وەك ئێمە مرۆڤ بوون.. مرۆڤانێك کە گرنگترین خەسڵەتیان بریتییە لە ئیمان و بەندایەتی، ئەرکەکەشیان -کە بووە بە بناغەی هەڵبژێررانیان لە لایەن خواوە- بریتییە لە گەیاندنی ئەم جیهانبینیی باوەڕ و پەرستشە بە کەسانی تر و، لابردنی سەرجەم ئەو لەمپەڕانەی دەبن بە بەربەست لەنێوان بەندەکان و خوادا. گۆڕینی شاخ و داخەکان بە ئاڵتون و، گۆڕینی ڕێڕەوی ڕوبارەکان و، کردنی بیابانە وشکەکان بە بەهەشتی سەوز و، شەقکردنی ڕووبارەکان و پەڕینەوە پێیاندا، فەرمانبەریی پێغەمبەران نین. هەرچەندە قورئان بۆ خۆی ئاماژە بۆ چەندەها موعجیزەی کەونیی لەم جۆرانە و هاوچەشنەکانیان دەکات کە پەیوەندیدارن بە پەیامی پێغەمبەرایەتیی ئەم زاتە پیرۆزانەوە. بەڵام هەموو ئەم شتە دەراسایانە کۆمەڵێك بەخششی خواییین و، تەنها لە ئیرادە

١. بڕوانە سورەتی آل عمران: ٣.

٢. سورەتی الأنعام: ١٤٩. واتە (هەر بۆ خوایە بەڵگە تیژرو تەواوەکان.)

و مەشیئەتی خواوە سەرچاوەیان گرتووە و، لە لایەك وەکو پاداشتێکی پێشینە و لوتفێکی تایبەتیی وایە بۆ بەندایەتیی پاك و بێگەرد و هەستی فەرمانبەریی ئەم زاتە پیرۆزانە و، لە لایەکی دیکەشەوە ئاوڕلێدانەوەی تایبەتی خوایین بۆ پتەوکردنی دڵنیایی لە سنگی شوێنکەوتووانیاندا.

هەریەك لە ڕووداوەکانی گۆڕانی خاك و خۆڵ بە ئاڵتون و، گۆڕانی خەڵوز بە ئەڵماس لەسەر دەستی پێغەمبەران و، زیندووبوونەوەی مردووان بە نەفەسی ئەوان -کە هیچ یەکێك لەم ڕووداوانە دانسقەتر نین لە گەیاندنی دەنگی ئیمان بە گوێی دڵە مونکیرەکان بەیارمەتیی چاودێریی خوایی و، نەرمکردنەوەی ئەو سروشتانەی کە بە کوفر پیس بوون و ئاگادارکردنەوەیان لە بوونی خوا و، ژیان کردنەوە بە بەری دڵە مردووەکاندا- کە چەشنی ئیقتیرانێك[1] هاودەم لەگەڵ پەیامی پێغەمبەرایەتیدا دەرکەوتوون، بریتین لە درەوشانەوەی لوتفی خۆی بۆ قبوڵکرانی پێغەمبەرایەتییەکەیان لە لایەن خەڵکەوە و، شنەبایەکی ئیحسانن بۆ گۆڕینی هیواکان بە یەقین. بە دەربڕینێکی تر ئەم ڕووداوە نائاساییانەی کە لە خواوە سەرچاوەیان گرتووە، بەتەواوەتی ڕوویان لە پشتگیری و دڵنەوایی پێغەمبەران و، تێگەیشتن و تەسلیمبوونی قسەبۆکراوەکانیانە و، بریتین لە کۆمەڵێك ڕووداوی پاشکۆ کە بە تەوەرەی سەرەکیی پێغەمبەرایەتی دانانرێن.

جارێکی تریش یادخستنەوە بەسوودە، ئەرکی سەرەکیی پێغەمبەران بریتییە لە: خاوێنکردنەوەی مرۆڤەکان لە خوو و ڕەوشتە خراپەکانی وەك خۆبەگەورەزانی و، ستەم و، لادان و، لاسایی کوێرانەی باووباپیران و،

---

١. ئیقتیران: بریتییە لە دەرکەوتنی دوو شت لە یەك کاتدا بەجۆرێك مرۆڤ وا گومان دەبات یەکێکیان هۆکاربێت و ئەوی تریان ئەنجام. بەڵام لەڕاستیدا هەردووکیان ئەنجامن و هۆکارەکەیشیان تەنها ویستی خوایە.

کەوتنە ژێر کاریگەریی نەفس و جەستەوە کە بەربەستن لەبەردەم گەیشتنی ئادەمیزاد بە خوا و هۆکاری دوورکەوتنەوەن لێی.. هاندانیان بەرەو خوو و ڕەوشتە جوانەکانی وەك خۆبەکەمزانی و، زانینی سنووری خود و، ڕاستڕەویی بیر و، لایەنگریی حەق و، ژیانی دڵ و ڕۆح.. بیرخستنەوەی پێگە و بەرپرسیارێتییان.. فێرکردنی چۆنێتیی ڕێزگرتن لە پەیوەندیی نێوان و خۆیان و خوا و بەزەییهاتنەوە بە بەدیهاتووندا.. ئاڕاستەکردنی چاوی دڵی مرۆڤ -کە بۆ هەتاهەتایی بەدیهێنراوە و جگە لەویش بە هیچی دیکە ڕازی نابێت- بەرەو جوانییەکانی ئەبەدییەت.. باسکردنی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە هەموو کەسێکەوە هەیە وەك ڕاست و هەڵە و، سوودبەخش و زیانبەخش و، جوان و ناشرین و، حەق و ناحەق و، فانی و باقی و هاوشێوەکانیان بەجۆرێك کە سەرجەم ئەو ژیرییانەی بڕیاری لەپێشینەیان نەداوە لێی تێبگەن و ویژدانە تێکنەچووەکانیش قبووڵی بکەن و، ڕێگریکردن لە بەهەڵەداچوونیان.. ڕوونکردنەوە و جێگیرکردنی هیدایەت و گومڕایی لەو چوارچێوەیەدا کە خوا خۆی بۆی داناوە و، گەیاندنی جوانییە ڕەهاکانی گەیشتن بە خوا و ناشرینییە ترسناکەکانی لادان لە ڕێگای ئەو بە ڕۆحەکان.. فێرکردنی بیروباوەڕێکی تەندروست لەمەڕ ئولوهییەت و ڕبووبییەت بەو جۆرەی خوا خۆی دەیەوێت نەك بەو شێوەیەی کە هەوا و هەوەس دیاریدەکەن.. بەستنەوەی هەموو شتێك بە ڕەزامەندیی خوای گەورەوە و، نیشاندانی ئەو ڕێگایانەی دەمانگەیەنن بەو ئاسۆیە و، هەواڵدان لەبارەی سزادانی بێباوەڕان و پاداشتکردنی باوەڕداران بە بەهەشتی هەمیشەیی..

چاوەڕێکردنی شتێك لە پێغەمبەران کە دەکەوێتە دەرەوەی مەیدانی فەرمانبەرییانەوە، هەم نەناسینی پێغەمبەرایەتییە و هەم بێڕێزیشە بەرامبەر بە پێغەمبەران. وەڵامی قورئان ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەو کەسانەی چاوەڕوانی و داوایەکی وایان لە پێغەمبەران هەیە کە لە سنووری فەرمانبەریی ئەواندا نییە:

﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ ﴾

(الأنعام: ٥٠)

"پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە، هەروەها لەنهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادارنیم و پێتان ناڵێم بەڕاستی من فریشتەم، بەڵکو تەنها شوێنی ئەوە دەکەوم کە بەوەحی و نیگا پێم دەگات."

بەڵێ، پێغەمبەران تەنها شوێنکەوتەی وەحیی خوایین و، بە هەموو هێزیان هەوڵ دەدەن بە باشترین شێوە گوزارشتی لێبکەن و، ڕاڤە و نوێنەرایەتی بکەن. هەرچی دەزانن و، دەیڵێن و، دەیکەن و، فەرمان بە کردنی دەکەن، بریتییە لە نوێنەرایەتیکردن و گەیاندنی ئەو پەیامانەی کە خوای بەهەموو شت زانا و دانا بە شێوازێکی تایبەتی بەگوێیدا داون. بە دەربڕینێکی دیکە، ئەوان لەبەرامبەر پەیامە خواییەکانەوە و لەسەر حەوزی سازگار و بەخوڕی وەحیدا وەك فەرمانبەری دابەشکار و بانگەوازکار وان. ئەگەر جاروبار ڕاڤە و ئیجتیهادێکیش بکەن کە لەگەڵ جێگیر (محکمات)ەکانی وەحیدا تەبایە، هێشتا هەوڵدەدەن هەموو شتێك

لە چوارچێوە و نەخشەی زانستی ڕەهای خوادا دەرببڕن و، لە سەرجەم هەڵسوکەوتێکیاندا ڕەچاوی ویست و مەزهەرییەتی خوایی دەکەن.

ئەوان هەمیشە لە سێبەری وەحیدا بەردەوامی بە ژیانیان دەدەن و، لە سەرجەم کاروبارەکانیاندا تەنها بەدوای ڕەزامەندیی خوادا وێڵن و، لەهەموو حاڵێکدا بەو ڕێگایەدا دەڕۆن کە ئەو بۆی دەستنیشان کردوون و، ئەنجامی جوڵە و چالاکییەکانیان حەواڵەی خوا دەکەن و بەروبوومەکەشی هەڵدەگرن بۆ ئەوسەری جیهانی غەیب. ئەوان و ئەو کەسانەش کە لەدڵەوە وابەستەیان بوون، هەرگیز دووچاری خۆشەویستیی دونیا و ئارەزووی پلەوپایە نابن و، هەموو جوڵە و هەڵسوکەوتێکیان دەبەستن بە هەستی تەقواوە و، بەسیرەتی شوێنکەوتنی وەحی بە خودی هیدایەت دەزانن و، بەهەموو تواناکانی عەقڵ و ڕۆح و دڵ و هەست ڕوو لەم شاڕێگا ڕووناکە دەکەن و، ڕۆیشتن بەم ڕێگایەدا بە تاکە بیمەی ڕزگاربوون و ڕزگارکردن دەبینن و، ژیانیان لەسەر بینین و زانینێکی لەم جۆرە بنیاتدەنێن.

لەبنەڕەتدا هەتا عەقڵی مرۆڤ و لۆجیك و داوەرییەکەی -دەتوانین هەموو ئەمانە بە یەك شت دابنێین- پێغەمبەرایەتی و بەربوومەکانی قبووڵ بکات و، سوودی تەواوەتی لەم سەرچاوە سازگارە وەربگرێت، لە لایەك دەچێتە سەر ڕێگای گەیشتن بە ئەوپەڕی سنووری بواری خۆی، لە لایەکی دیکەشەوە ڕزگاری دەبێت لە بوون بە هۆکاری فریودانی کەسانی تر. ڕەفتارێکی لەم جۆرە، پێش لە هەر شت، تەسلیمبوونە بەو توانستە ڕەها و زانستە دەوراندەرەی کە بەسەر هەموو بوون و شتاندا فەرمانڕەوایە. دەتوانین بەمە بڵێین کرداری تێپەڕاندنی

بەرهەمەکانی عەقڵ و لۆجیك و، پرۆژە جۆراوجۆرەکان کە لەڕێگەی عەقڵ و لۆجیکەوە بەدەستهاتوون و، ئەزموون و لێکۆڵینەوەکان لە بوارە جیاوازەکاندا بە پاڵێوگەی وەحیدا و پاڵفتەکردنی. ئەمەش لەپێناو بەئاسمانیکردنی هەموو ئەو شتانەی کە زەمینین و ڕەنگدانەوەی ڕۆحی جەوهەر تەنانەت لە شتە ڕووکەشییەکانیشدا. لەڕاستیدا هەر خوایە کە عەقڵی بەدیهێناوە و هەر ئەویشە کە ڕێگای فراوانبوونی بەهۆی وەحیەوە نیشانداوە...خوای گەورە بەهۆی عەقڵەوە چاوی مرۆڤەکانی کردووەتەوە و، بەیارمەتیی وەحیش بینینی ڕاست و بیرکردنەوەی دروستی بۆ عەقڵ دەستەبەرکردووە. لەئەنجامیشدا مەیدانێکی فراوانتری داوەریی ژیری بۆ ئەو سازکردووە و، پاشان بە گوفتارە پیرۆزەکەی کە دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە بەڵگەی بەستەرەوەی بۆ مرۆڤەکان هێناوەتەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، دامەزراوەی وەحی کە دەتوانێت بەجارێك هەموو "گشت" لەباوەش بگرێت، خوای گەورە کردوویەتی بە تاقیگەیەك بۆ کۆکردنەوەی سەرجەم ڕێگاکانی عەقڵ و داوەریی ژیری کە هەموو کاتێك پەشێون و لە دۆخێکی شپرزە و پچرپچرڕدا دەبینرێن و، پاشان هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی بەروبوومەکانیان لەم تاقیگەیەدا.

لەسەر ئەم بنەمایە، باوەڕمان وایە ئەگەر پەیڕەوی لە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانە نەکرێت کە هەریەکەیان ئەمینی ڕۆژگاری خۆی و، دارای ئەزموون بووە و سەرجەم تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێیەی ناسیوە کە پێیدا تێپەڕدەبێت، هەرگیز ناکرێت بە سەرکەوتوویی ئەم ڕێیە ببڕرێت و، ئەم ژیانە ئاڵۆزە بە بێ شکست بەسەرببرێت. بەهەمان شێوە لەو باوەڕەداین کە وەحی بریتییە لەو ئیکسیرەی کە عەقڵ لە چەندەها

وڕێنەی جۆراوجۆر دەپارێزێت و، پێغەمبەرانیش ئەو پزیشکە پسپۆڕانەن کە ئەم ئیکسیرە لە شوێنی گونجاوی خۆیدا بەکاردەهێنن. بەڵێ، ئەم مرۆڤە هەڵبژاردانە عەقڵی مرۆڤ لە چەندین خاڵی لادانی جۆراوجۆر دەپارێزن و، کۆمەڵێك ڕێنیشاندەری ڕۆشنی وان کە دەرگای عەقڵ والآدەکەن لەسەر جۆرەها ئاسۆی بەرز و لاهوتی و سەروو جیهانی ماددە. ئەو عەقڵ و لۆجیك و داوەریی ژیرییانەی کە دەستیان خستووەتە ناو دەستی ئەوەوە، لەهەمان کاتدا بیمەی گەیشتنیان بە دوا سنووری تواناکانی خۆیان دەستەبەرکردووە. ئێمەی باوەڕدار بە پێغەمبەرایەتی و وەحی، لەپاڵ ئەوەدا کە عەقڵ و لۆجیك و بەروبوومەکانیان بەرزدەنرخێنێن، باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی هەرگیز ئەمانە ناتوانن بۆشایی وەحی پڕبکەنەوە و، لە توانایاندا نییە جێگای بانگەوازکارە کامڵ و ڕاستگۆکانی ئەو بگرنەوە.

# خوا، گەردوون، مرۆڤ.. و پێغەمبەرایەتی

خوێندنەوەیەکی باش بۆ بوون و ڕووداوەکان و، ڕاڤەکردنی دروست بۆیان و، پاراستنی هاوسەنگیی نێوان مرۆڤ و گەردوون و حەقیقەتی خوایەتی، یەکێکە لە گرنگترین و قووڵترین لایەنەکانی پێغەمبەران. هەستکردن و تێگەیشتن لە بوون وەك "گشت"ێك و، تەجەللی شتان -کە هەندێکیان وەك مۆدێل وان بۆ هەندێکی تریان- بەشێوەیەکی گشتی و، پەیبردنی تەواوەتی بە یاسا جیهانییەکانی یەکبوون لەسەر ئاستی هەموو بوونەوەران.. هەموو ئەمانە تەنها بۆ پێغەمبەران مەیسەر بوون. ئەمەش بووە بە دیارترین موعجیزەی ئەوان و، لەناویاندا بەتایبەتی هی حەزرەتی موحەممەد.

مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە سەرەڕای هەموو دۆزینەوە زانستی و پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان با هەر خەریکی حونجەکردنی حەقیقەتەکانی لەمەڕ مرۆڤ و گەردوون و ئەودیوی سروشت بێت، کەچی پێغەمبەران لەسایەی توانا و لێهاتنە دەراساکەیان و، پێگەی تایبەتیان لای خوا و، وەرگرتنی زانیاری لە جیهانی غەیبەوە، هەندێکیان بەشێوەیەکی کورت

و پوخت و، هەندێکی تریان بەشێوەیەکی دووردودرێژ، تەنانەت هەزاران ساڵ پێش ئێستا لەسەر ئەم بابەتانە بەجددی هەڵوێستەیان کردووە و، لە چوارچێوەی گەڕاندنەوەی هەموو شتێك بۆ خاوەنەکەی، هەموو ئەو شتانەیان بە ئوممەتەکانیان ڕاگەیاندووە کە پێویستە بوترێن.

پێغەمبەران بە ڕێگا زانستییەکانی لێکۆڵینەوە و میتۆدەکانی ئەزموونکردن -کە لەم سەردەمەدا زۆر باون- نەگەیشتوون بەم ڕاستییانە، بەڵکو ئەوان لەپاڵ کەماڵی عەقڵ و، هەست و، شعوور و، ئیدراکیاندا کە توانای تێگەیشتنی مرۆڤ دەبەزێنێت، بەیارمەتیی فراوانیی دڵیان و، پەیوەندیی تایبەتیان لەگەڵ خوای گەورەدا گەیشتوون بەم ئیمان و مەعریفەتە. گەیشتن و بینییان کە هەموو بوون لەژێر دەسەڵاتی توانستێکی ڕەهادایە.. تەماشای یەکێتیی زانست و ئیرادەیەکیان کرد کە لە هەموو جێگایەك و هەموو شتێکدا دەستبەکارە.. لە ڕوخساری هەموو شت و ڕووداوێکدا سەرجەم ئەو شایەت و نیشانە و ئاماژانەیان خوێندەوە کە پەنجە بۆ حەزرەتی تاك و تەنها ڕادەکێشن و، ڕاڤەیان کردن و، پاشان نیشانیاندا کە ئەمانە لەسەر ئاستی هەست و، بیر و باوەڕدا هەریەکەیان دەلالێکی تەوحیدن. ئەوەی ئەوان سەدان و هەزاران ساڵ پێش ئێستا دەربارەی مرۆڤ و گەردوون و حەقیقەتی خوایەتی خستوویانە ڕوو، هێشتا زانست نەیتوانیوە لەم ڕووەوە شتێك بڵێت و بڕیارێکی هەبێت. بەجۆرێك زانست لە زۆرێك لە بابەتەکاندا هێشتا لە دۆخی گڕوگاڵدایە و، ئەوەی ئەمڕۆ بە ڕاستی دادەنێت سبەی چاوی پێدا دەخشێنێتەوە و، هەوڵدەدات دیسان هەڵەکانیش بەکۆمەڵێك شت ڕاستبکاتەوە کە ئەوانیش گومانی هەڵەدەرچوونیان لێدەکرێت و، جگەلەوەش هەمیشە

ڕەخنە لەخۆی دەگرێت و، پارێزگاری لە ڕاستییە گوێڕەییەکانی خۆی بە چەندین بیردۆزی جۆراوجۆر دەکات و، هەرچەند دەکات ناتوانێت لە سنووری شیکردنەوەی شتانی هەندەکی دەربچێت. دەتوانین بڵێین کە زانست سەبارەت بەو بابەتانەی سەرەوە هیچ بڕیارێکی وای نەداوە کە ناچار بە گۆڕینی نەبوویێت و، هیچ کاتێکیش سەرکەوتوو نەبووە لە دەربڕینی ڕاستیی ڕەهادا. ئەو شتانەی ئەو دەیاندۆزێتەوە و دانیان پێدادەنێت، جگە لە تێشوو بۆ ڕێبوارانی ئەو ڕێیە و، قەرزێکی پێشینە بۆ لێکۆڵەرانی دوای خۆی، چی تر نییە.

پێویستە خێرا ئەوە بڵێم کە مەبەستمان لە وتنی ئەم شتانە هەرگیز نە بەسووك سەیرکردنی زانست و بەرهەمەکانی و، نە بەکەمزانینی توێژینەوە زانستییەکانە. بەپێچەوانەوە بەڕای ئێمە زانستیش و بەروبوومەکانیشی بریتین لە دەستەیەك بەهای وا کە زۆر گرنگن و پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت، هەربۆیە دەبێت هەمیشە بەرز بنرخێنرێن. ئامانجی ئێمە یادخستنەوەی ئەو سەرچاوەیەی زانستە -کە بەداخەوە لەم ڕۆژگارەماندا پشتگوێ خراوە- کە ڕاستترین و کامڵترین و گشتگیرترین و جوانترین گوزارشتی هەیە لەسەر مرۆڤ و بوون و حەقیقەتی بەدیهاتن. ئەمەش -جگە لەو کتێبانەی کە لە ڕابردوودا دەستکاریکراون- بریتییە لە سەرچاوەی بەپیت و هەمیشە لاوی پێغەمبەرایەتی. لەوانەیە زانستە مۆدێرنەکانی ئەمڕۆ هەندێك شتی گرنگیان لەبارەی یاسا و ڕێسا و هەماهەنگی و گونجانی نێوان بوون و ڕووداوەکان دۆزیبێتەوە و ئەمانەشیان بە کۆمەڵێك جیهانبینیی گشتگیر و هەڵسەنگاندنی گشتییەوە بەستبێتەوە. ئێمە هەموو ئەمانە بەرزدەنرخێنین، بەڵام ئەم زانست و تەفسیرانەی

کە بەیارمەتیی بەکارهێنانی پێشکەوتووترین تەکنەلۆجیاکانی سەردەم بەدەستهاتوون، هەندێك لە کەسە هەڵبژاردەکان، ئەگەرچی بەشێوەیەکی کورت و پوختیش بێت، لە سەردەمە هەرە کۆنەکاندا ئاماژەیان بۆ کردوون. جا ئەگەر هەندێك لە ناوەندەکانی زانست گوێیان بەمانە نەدابێت و، نرخشناسانە مامەڵەیان لەگەڵ نەکردبن، ئێمە ئەوکات -چوارچێوەی ئەدەبمان چەند ڕێگە بدات- دەنگمان لەڕووی ئەم جۆرە کەسانەدا بەرزدەکەینەوە و بێگومان هاوار بۆ ئەو شتانە دەکەین کە بەڕاستیان دەزانین.

بەڵێ، زۆر حەقیقەت هەن کە زانستی مۆدێرن لەمڕۆدا دۆزیونیەتەوە، بەڵام پێغەمبەران زۆر لەپێشتر -ئەگەرچی بەشێوەیەکی کورت و پوختیش بووبێت- بەشێوازی جۆراوجۆر و بە ڕوانینە گشتگیرەکەیان -ئەو ڕوانینەی کە لەسەر ئەو لەدونیاتە فراوانەی کە کراوەیە بەڕووی وەحیدا و، قووڵیی فەتانەتە بێهاوتاکەیان دامەزراوە- ئاماژەیان بۆ هەموو ئەمانە کردووە. تاقیگەکانی ئەم ڕۆژگارە و ئەو ناوەندانەی لێکۆڵینەوە کە پێشکەوتووترین تەکنەلۆجیایان تێدا بەکاردێت، لە هەر کوێیەکی ئەو حەقیقەتانەدا بن کە ئەوان پێشچاویان خستوون، هێشتا ئەمڕۆ ملیۆنان مرۆڤ هەموو شتێك لە چوارچێوەی پەیامەکانی ئەواندا هەڵدەسەنگێنن و، بەتایبەت لە بابەتەکانی مرۆڤ و گەردوون و خوادا بێ چەندوچۆن شوێنپێی ئەوانیان هەڵگرتووە. لەبەرامبەردا تازەترین ئەو بیردۆزانەی کە بە ناوی زانست و فەلسەفەوە دەخرێنە مەیدان، ڕۆژانە جێی خۆیان بۆ دەستەیەك بیردۆزی دیکە چۆڵدەکەن، واتە زانایانی ئەمڕۆ ڕەخنە لە هاوپیشەکانی دوێنێیان دەگرن و، بێگومان لەم نێوەندەشدا زۆرێك لەو

بۆچوون و بیردۆزانەی کە پتەو و بەهێز دەردەکەوتن بە هەندێك بیرۆکەی تر جێگایان لەق دەبێت و، بۆچوونە هەرە باوەڕپێکراوەکانی زانست کە سەردەمانێك تاجی سەر بوون، وەك چۆن یەك یەك هاتوون، بەهەمان جۆر یەك یەکیش ئاوابوون. بەڵام ئەو ڕاستییانەی کە پێغەمبەران هێناویانن -جگە لە تەفسیرە بەدبەختەکانی هەندێك لە شوێنکەوتووە بیرتەسکەکانیان- چەشنی کۆمەڵێك بناغە کە مرۆڤەکان هەمیشە وەك سەرچاوە بۆ لایان دەگەڕێنەوە، نرخ و بەهای دوێنێیان لەمڕۆشدا دووبارە دەکەنەوە. چونکە ئەو بناغانەی ئەوان دایانناون پاڵ بە پەیامەکانی زاتێکی مەزنی واوە دەدەن کە سەرتاسەری بوونی وەك پێشانگایەك ڕێکخستووە و، وەك پەڕاوێك نووسیوە و چەشنی کۆشکێکیش ڕازاندوویەتیەوە.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە پێویستە بابەتەکانی وەك ئەرکی هەواڵدان لەبارەی مرۆڤ و بوون و بەدیهێنەرەوە و، مافی قسەکردن، بەجێبهێڵرێت بۆ ئەو زاتانەی خاوەنی توانا و لێهاتنی تایبەتن و پەیوەندیی تایبەتیان هەیە لەگەڵ توانستی ڕەهادا و، تەنها ئەوان ڕوونکردنەوە لەسەر ئەمدیو و ئەودیوی پەردەی بوون و مانا و ماهییەتەکەی بدەن.

بێگومان یەکێك لە گرنگترین فەرمانەکانی ئەم زاتە تایبەتمەندانە بریتییە لە دەستنیشانکردنی پەیوەندی و گونجان و تەبایی نێوان گەردوون و ڕووداوەکان لە لایەك و ژیانی مرۆڤ و ڕەفتارەکانی لە لایەکی تر و، پاشان ناساندنی ئەو تاکە خوایەی کە ئەم تەبایی و گونجانە وابەستەی ئەون و، ئنجا دیاریکردنی بەرپرسیارێتیی مرۆڤەکان لەبەرامبەر ئەو خوایەدا. بەڵێ، تەنها ئەوان توانیویانە بەشێوەیەکی ڕاست و بە شێوازێکی

قەناعەتبەخش وەڵامی پرسیارەکانی وەك "مرۆڤ لە کوێوە هاتووە؟" و، "بۆ کوێ دەچێت؟" و، "بۆچی هاتووە؟" بدەنەوە.

لەم ڕوانگەیەوە ئێمە خۆمان بەناچاردەزانین کە تەنها و تەنها لە پەیامی پێغەمبەراندا بەدوای مەحکەمترین زانیاریدا بگەڕێین لەسەر بابەتەکانی وەك مەبەست و ئامانجی هاتنە دونیای مرۆڤ و، ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە پێویستە بەدرێژایی ڕێگا ئاگامان لێیان بێت و، ئەنجامی کۆتایی ئەم گەشتە. چەند لەم کارەدا سەرکەوتووبین، ئەوەندە بەباشی دەتوانین لە هەڵسوڕانی بازنەی فراوانی گەردوون و، لە ناوەرۆك و مانا و ڕاستیی ئەودیو پەردەی بوون و، لە ئامانج و مەبەستی ئەم هەموو جموجوڵە سەرسووڕهێنەرانەی سەرزەوی تێبگەین و، بەهەمان ئەندازەش دەگەین بە سەلامەتی و سەرفرازی و ئاسوودەیی لە هەست و بیردا. سەلامەتی و سەرفرازییەك کە بەندە لەسەر ناسین و هەڵسەنگاندنی ناوەوە و دەرەوە و، پێش و دوای بوون.. سەلامەتیی تێگەیشتن لە پێگەی خۆمان وەك پارچەیەکی گرنگی گەردوون و خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو هاوسەنگییە گشتییەی کە هەموو شت و ڕووداوێکی گرتووەتەوە.. سەلامەتیی گرێدانی پەیوەندی لەگەڵ ئەو زاتەدا کە هۆکار و زەمینەی بەختەوەری دونیا و ئاخیرەتمان ئامادە دەکات.. سەلامەتیی باوەڕبوونمان بەوەی کە ئارەزووی ئەبەدییەتمان دێتەدی و هەرگیز دووچاری نائومێدی نابین..

ڕێگاکانی زانین و هۆکارەکانی زانیاری کە وەك مرۆڤ بە ئێمە بەخشراون دیار و سنووردارن. ڕوون و ئاشکراشە ئەو زانستانەی کە بەم ئامرازە سنووردارانە بەدەستدێن خۆیشیان سنووردار دەبن. پێم وایە

بە زانیاری و مەعریفەتێکی لەم جۆرە نەك هەر ناتوانین لە ناوەرۆکی ئامانجی بەدیهاتنمان و، مەبەستی بوونمان لەسەر زەوی و، پەیوەندیمان بە گەردوونەوە تێبگەین، بەڵکو تەنانەت ناشتوانین لە ڕێسای گشتی سەر زەوی و ڕۆحی سیستەمی ژینگەیی تێبگەین. ئەمە لەکاتێکدا هەروەك مرۆڤ ناچارە ژیانی بەگوێرەی پێگەی خۆی لەنێو بوونەوەراندا ڕێکبخات، بەهەمان جۆر بەرپرسیارە لە ڕێکخستنی ژیانی بەگوێرەی هەندێك ئامانجی مەزن کە داخوازیی ئاستی بەدیهاتنی ئەون و لێپرسراوە بەرامبەر بەو "ڕێسا گشتی"یەش کە بەسەر هەموو جیهاندا فەرمانڕەوایە. ئەگەر ئەو لەم ڕێیەی ژیاندا و لەم گەشتە نەزانراوەدا کە پڕیەتی لە چەندەها هەوراز و نشێو و، بەرزی و نزمی، خۆی ڕادەستی ڕابەرێك نەکات کە دوێنێ و ئەمڕۆ و، پێش و پاشی ئەم ڕێگایە دەزانێت، ئەوا زۆربەی کات بەهەڵەدا دەچێت و، چەندین گرفتی جدی یەخەی دەگرن و، ڕەنگە هەرگیز نەتوانێت بگات بەو ئامانجەی کە بۆ بەدیهاتنی دانراوە.

بەڵێ، ئێمەومانان کە نە ئەم ڕێگایە دەناسین کە پێیدا دەڕۆین و نە پێشبینی ئەو شتە چاوەڕواننەکراوانە دەکەین کە بەدرێژایی ئەم گەشتە دێنە بەردەممان، ئەگەر گوێڕایەڵیی ڕابەر و نێرراوەکانی ئەو خوا میهرەبانە نەکەین کە مرۆڤەکانی لە غەیبەوە هێناوەتە ئێرە و لێرەشەوە دەیانگوازێتەوە بۆ نیشتمانێکی دیکە، ئەوا لە نیوەی ڕێ جێدەمێنین و، ڕزگارمان نابێت لە کەوتن و، ناتوانین پەڕاوی گەردوون بەڕاستی بخوێنینەوە و، سەرکەوتوو نابین لە تەماشاکردنی ئەم پێشانگایەی بوون بە ڕوانینێکی بەپیت و، لە مانا و ناوەرۆك و نهێنییەکانی کۆشکی

دونیا تێناگەین و، لەمەش خراپتر، شتان و ڕووداوەکان و دەرکەوتنە جۆراوجۆرەکانی ڕووداوەکان کە هەریەکەیان موعجیزەیەکی دەستی قودرەتن، دەگێڕینەوە بۆ هەندێك لە یاساکانی سروشت و، بەمەش سەرجەم ئەو شت و کارە دەراسایانە وەك شتانی ئاسایی و سادە دێنە پێش چاومان و، بەجارێك ئاسۆی خۆمان تاریك دەکەین.

ئەوە پێشەوایانی حەق و شوێنکەوتووە بەختەوەرەکانیان بوون کە هەموو کاتێك بوون و ڕووداوەکانیان بە دروستی خوێندووەتەوە و، تونکڵ و ڕواڵەتیان تێپەڕاندووە و هەمیشە بەرەو کاکڵەی هەموو شتێك ڕۆیشتوون و، بەیارمەتیی بینینی مانا لەناو ماددەدا و، دابەزینیان بۆ ناوەرۆکی هەموو شتێك، لەپاڵ دیوی دەرەوە و ڕووکەشی هەموو تەنێکدا موتاڵای دیوی ناوەوەشیان کردووە. بە واتایەکی تر ئەوان لە تەفسیرکردنی گەردووندا ناوەرۆکیان پێشخستووە و، لە هەموو سنعەتێکدا پەیامگەلێکیان لەشێوەی درەوشانەوەی جۆراوجۆری وادا پێگەیشتووە کە سنعەتکارەکەی نیشاندەدەن. جگەلەوە، لەبەرئەوەی ئەم سەفەری ڕۆح و گەشتی تێڕامانەیان لەسایەی بەدیهێنەری مەزندا بەڕێکردووە و، زانیارییە پارچە پارچە بەدەستهاتووەکانیان گۆڕیوە بە مەعریفەت، ئەوا بەگوێرەی پلەی ئەو ئاسۆی عیرفانەی کە تێیدان، پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەسەر ئاستی دڵ لەگەڵ "حەزرەتی مەعروف"دا بەستووە و، لەم کەشوهەوا بەهەشت ئاسایەدا گەیشتوون بە هاودەمییەکی وا کە بەشی هەموو شتێك دەکات و، هاودەم لەگەڵ هەیەجانی هەستکردن بە خۆشەویستییەکی قووڵ و هاژەی چێژی ڕۆحیاندا بەرەو ئەو هەنگاویان ناوە.

بەڵێ، ڕوانینی ئەم کەسە پیرۆزانە بۆ بوون و ئەودیو پەردەی بوون تەواو جیاوازە. ئەوان لە ڕۆشنایی بەسیرەتیاندا تەماشای هەموو شتێك دەکەن و، شتان و ڕووداوەکان لەو چوارچێوەیەدا هەڵدەسەنگێنن کە توانستی ڕەها کێشاویەتی و، لەڕووی خودی حەقیقەتی شتان(الحقائق الاشیاء)ەوە مامەڵە لەگەڵ هەموو شتێکدا دەکەن و، لە ڕاڤەکردنی "بەش" و "گشت"ی هەموو گەردووندا هاوسەنگی و گونجانی نێوان شتان و پەیوەندییان بە بەدیهێنەریانەوە ڕەچاودەکەن و، هەرگیز دووچاری دژیەکیی ناوەکی نابن. لەم ڕووەوە دەتوانرێت بوترێت کە لە دوێنێوە هەتا ئەمڕۆ، بینینی ڕاست و، بیرکردنەوەی ڕاست و دەربڕینی ڕاست دەربارەی مرۆڤ و گەردوون و حەقیقەتی خوایەتی تەنها بەنسیبی ئەوان بووە. تەنها ئەوان توانیویانە گوزارشت لە تەوحید بە سەرجەم پێویستی و داخوازییەکانییەوە بکەن و، تەنها ئەوانیش توانیویانە پتەوترین هاوسەنگی لەنێوان ناو و، سیفاتە پیرۆزەکان و، کاروبارە خواییەکان و، زاتی پیرۆزی خوادا بسازێنن.. بەڵێ، گوزارشت کردن لە خەسڵەتەکانی تایبەت بە بازنەکانی خوایەتی و پەروەردگارێتی وەك درەوشانەوە جیاوازەکانی هەمان سەرچاوە بە ڕاسترین شێوە، دیسان نیشانەیەکی تایبەت بە ئەوان بووە.

ئەگەر ئیرادەی خوایی لوتفێکی وەك ناردنی پێغەمبەرانی نەنواندایە، تەنانەت پڕبەرهەمترین ژیرییەکانیش -سەرەڕای هەموو هەوڵ و کۆششەکانیان بەدرێژایی چەندەها سەدەی دووروودرێژ- هەرگیز ئەنجامێکی لەم جۆرەیان بەدەست نەدەهێنا، هەروەك بەدەستیشیان نەهێناوە.. نازانم داخۆ لە ڕۆژانی داهاتوودا بەهۆی پێشکەوتنی زیاتری زانست و گەشەسەندنی هەندێك ڕوانگەی جیاواز، ڕاڤەی

ئێستای ئەوان دەگۆڕێت یان نا، بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە هیچ شتێك ناتوانێت لەسەر شێوازی ئەمڕۆی بەردەوام بێت. خۆزگە ئەو ئادەمیزادەی کە هەتا ئەمڕۆ تا ڕادەیەکی زۆر دووچاری سەرسامی هاتووە، لە بابەتەکانی وەك حەقیقەتی بوون و ئەودیوی بوون کە توانای تێگەیشتنی مرۆڤ تێدەپەڕێنن، کەمێك ڕووی لە پەیامە خواییەکان و ڕاڤەی پێغەمبەران بکردایە و، لە کەشوهەوای تەم و غوباری زانیارییە فریودەرەکان کە هەتا ئێستا لەناویدا پەلەقاژەیەتی ڕزگاری ببووایە و، بەرووی ئاسمانیبوونێکدا بکرایەتەوە کە شەماڵی ئیلهامی پێغەمبەران تێیدا هەڵدەکات!. لەوانەیە ئەوکات حەقیقەتی بوون و، ئەودیو پەردەی شتان و ڕووداوەکان و، پەیوەندیی نێوان شتان و، هەماهەنگی و هاوسەنگیی گشتی نێوان فەرمانە تەکوینییەکان ڕوونتر ببینێت و، باشتر تێبگات. لە ئەنجامی ئەم تێگەیشتنەشیدا لە لایەك سەرەتای پەیوەندییەکی نوێ لەگەڵ بەدیهێنەری خۆی گرێدەدات و، لە لایەکی دیکەشەوە پێچەوانەی ئەو ڕێسا گشتییە ناوەستێت کە سەرانسەری گەردوونی داگیرکردووە و، هەرگیز گرفتاری پێکدادان نابێت لەگەڵ بوونەوەراندا. بەڵام ئادەمیزاد، بەتایبەت هەندێك لە ڕۆحە یاخییەکانی ئەم ڕۆژگارە، نەیانتوانی ئەم ڕووتێکردنە گشتییە بهێننەدی و، زۆرکات لەپاڵ یاخیبوونیان لە خوای گەورە، بەرامبەر بە شتان و ڕووداوەکانیش دووچاری دژیەکی هاتن و، هەرچییەکیان کرد لە ئازار و ژان قوتاریان نەبوو. چونکە ئەو هۆکارانەی زانیاری کە پێیان بەخشراوە سنووردارن و، ئەو کەلوپەلەش کە هەیانە بەشی چارەسەرکردنی ئەو کێشانە ناکات کە بەرۆکیان دەگرێت. ئەوان بە کەلوپەل و ئامرازەکانی دەستیان کە

دەکرێت ناوی هۆکارەکانی زانستیشیان لێبنرێت تەنها دەیانتوانی پەردە لەسەر نهێنییەکانی بەشێکی زۆر کەمی بوون -ئەویش لە چوارچێوەی بەهەڵەداچوون و ڕاستکردنەوەیەکی هەمیشەییدا- لابدەن، کە هەر وایش دەرچوو.

ئەمە لەحاڵێکدا کە دەبوو مرۆڤ بەگوێرەی فراوانیی گەردوون و، تێکەڵی و ئاڵۆزیی ڕووداوەکان و، پاشان بەئەندازەی فراوانیی ویست و ئارەزوو و ئاواتەکانی خۆی، لەو گەردوونەی کە دەوری داوە و، لەو دونیایەی تێیدا دەژی و، لە سیستەمی ژینگەیی و، لە پەیوەندیی نێوان سەرجەمی شتان بڕوانێت، نەك لە چوارچێوەی زانیارییە هەمیشە گۆڕاوەکانی و، ئاسۆی تەسکی خۆی و، زانینە سنووردارەکەیدا مامەڵەیان لەگەڵ بکات. هەتا لە ژیاندا و، لەو ڕێگایەدا کە لەسەری دەڕوات و، لە کۆتا وێستگەی گەشتەکەشیدا هیوا و چاوەڕوانییەکانی تووشی نائومێدی نەبن. بەڵام بەداخەوە ئەو دووچاری چەندەها خەیاڵ شکان هات و، هەتا خەمسارد و بێباکیش بێت بەرامبەر بەو ڕێگایەی پێیدا دەڕوات و بەو چارەنووسەش کە پێیدەگات، ئەم شکستانە هەر بەردەوام دەبن.

بەڵێ، ئەم ئادەمیزادەی کە لە جیهانی غەیبەوە بەرەو دونیا و، لێرەشەوە بەرەو بەرزەخ و، لە بەرزەخیشەوە ڕووەو ئەبەدییەت ملدەنێت، تەواوکردنی ئەم گەشت و ڕێبوارییە دووورودرێژەی کە هەر بەشێکی خاوەنی تایبەتمەندییەکە بێ سەرسامبوون و، لەرزین و، شڵەژان و، ترس و ئەندێشە و، هەنگاونانی لە باوەشی ئارامی و سەلامەتیدا، ماریفەتێکی سەروو ئاستی مرۆیی، بەڵکو سەروو کات و شوێنی دەوێت.

ئەمە لەحاڵێکدا ئەو تەنانەت لەم دونیایەدا کە لافی باش ناسینی لێدەدات، دەستەوسانێکە لە گشت دەستەوسانەکان کۆڵەوارتر و، نازانێت دوو هەنگاو دواتر چی بەسەردێت.. وە بڕینی ئەم ڕێگا دووردرێژەی کە نەخشە و پلانی جددی دەخوازێت لە لایەن کەسێکی لەم جۆرەوە و گەیشتنی بە ئامانجێك بە کامی دڵی خۆی شتێکی مەحاڵە. بەڵێ، گەشتەکە تابڵێی دووررودرێژە و، مەنزڵەکانی سەر ڕێگا زۆر و زەبەندەن و، چەندین چیا و ڕووباریش لەسەر ڕێ هەن کە بڕینیان هەتابڵێی سەختە. شتێکی بەڵگەنەویستە بۆ بڕینی ڕێگایەك کە بەم ئەندازەیە پڕیەتی لە کێشە و گیروگرفت، کۆمەڵێك ڕابەر و پێشەوای وا پێویستن کە لە یاسا و ڕێسا و ئادابی ڕێگا شارەزان.

پێغەمبەران بەدرێژایی مێژوو و یەك لەدوای یەك بۆ ئەم ئەرکی ڕابەرایەتیکردنە هاتوون و، ڕێگای مرۆڤەکانیان ڕووناك کردووەتەوە و، پەردەیان لەسەر چاوی ڕێبواران هەڵماڵیوە و، ئاسۆی ئەوانەی دوا خۆیان لەمەڕ خوا و گەردوون و حەقیقەتی شتان ڕۆشن کردووەتەوە و، ئەوانیان لە خەم و پەژارەی تەنهایی و، هەروەها ئەندێشەی سەرەنجامی نادیار ڕزگارکردووە.

هەر لە یەکەم مرۆڤ و یەکەم پێغەمبەرەوە هەموو جوڵانەوەیەکی پێغەمبەرایەتی لە بابەتە بنەڕەتییەکاندا هاوبەش بوون و، هەمیشە گرنگییان بە بناغەکانی وەك تەوحید و، زیندووبوونەوە و، پێغەمبەرایەتی و، بەندایەتی و دادپەروەری داوە و، سەبارەت بە بابەتە لاوەکییەکانیش کۆمەڵێك ئاماژە و ڕێنموونی و ئاگادارکردنەوەیان پێشکەش کردووە کە لەگەڵ ڕۆژگار و، هەلومەرجە گشتییەکان و، ئاستی مرۆڤ

لەو سەردەمەدا بگونجێت و، هەمیشە ئامانجی بەرزیان نیشانی شوێنکەوتووانیان داوە. بەم جۆرە هەموو کاتێك لە بابەتە بنەڕەتییەکانی ژیانی ئایینیدا هەمان ڕێگا پەیڕەوکراوە و، هەرچی ئەو بابەتانەیشە کە بەراورد بەمانە بە لاوەکی ئەژماردەکرێن، هەندێك گۆڕان تیایاندا ڕوویداوە و، لەڕاستیدا بوونی ئەم گۆڕانەش بەم شێوەیە شتێکی پێویستە.

قورئان دواین پەیام و بانگەوازە بۆ ئەو مرۆڤایەتییەی کە کامڵ بووە و پێگەیشتووە. ئەم کۆتا پەیامە لەپاڵ بیرهێنانەوەی ئەو بناغە پتەوەنەگۆڕانەی کە لە سەرجەم ئایینەکاندا بوونیان هەیە، بە فەرمانەکانیشی -کە ڕەهەندی فراوانبوونیان هەیە- لە بوارە هەندەکی و لاوەکییەکاندا، هاوڕێ لەگەڵ پەیمانی هێنانەدی پێویستییەکانی گشت کات و شوێنەکان هاتووە و، کۆتا خاڵی لە جیهانبینیی ئایینیدا داناوە. ئیدی لەمەودوا مرۆڤایەتی لەژێر ڕۆشنایی ئەم کۆتا پەیامەدا لەسەر ڕێی خۆی بەردەوام دەبێت و، وزەی پێشکەوتن و گۆڕانی خۆی لەم ڕێسا نوێیەدا بەکاردەهێنێت و، هەوڵی گەیشتنیش بە حەقیقەتی ڕەها لە چوارچێوەی ئەودا بەگەڕدەخات.

بەڵێ، ئیدی چەرخەکانی لەمەودوا چەرخی قورئان و، دەورانەکانی لەمەبەدواش دەورانی "شانازیی مرۆڤایەتی" (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەبێت. گوێ بۆ بانگەوازەکەی ئەو هەڵدەخرێت و، ئەو مەشخەڵەش کە هەمیشە لەسەر ڕێگامان دەدرەوشێتەوە چرای ڕووناکی ئەو دەبێت. بەڵێ، هەنووکە فەرمان فەرمانی ئەو "مەزنترین یەکتاپەرست"ەیە کە هەموو شتێك بۆ تەوحیدی بێگەرد دەگێڕێتەوە...

## دواین هەواڵدەر لە غەیب

کۆتا وتە دەربارەی خوا و، گەردوون و مرۆڤ، حەزرەتی موحەممەد فەرموویەتی کە ناوکی درەختی بوون و، هۆکاری بەدیهاتنی کتێبی گەردوون و، بەهێزترین و زولاڵترین دەنگی بانگەوازکارە بۆ لای خوا. کۆتا هەواڵدەر لە "غەیب" و "غەیبی غەیب" ئەوە و، تەفسیرکاری فریونەدەری شتان و ڕووداوەکان ئەوە و، شیکەرەوە و ڕوونکەرەوەی پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و خوا -بەجۆرێك کە ڕێگە بەهیچ جۆرە تێکەڵبوونێك نادات- ئەوە و، هەر ئەویشە کە پێویستییەکانی پەیوەندییەکی لەم جۆرەی بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەیان کردووە. ئەو لە لایەك یەکەمە و نزیکترینە لە خواوە، لە لایەکی دیکەشەوە کۆتایە، بەڵام ڕابەرێکی ئەمینی نزیکبوونەوەیە لە خوا.

فریشتەکان چاوەڕێی ئەویان کرد و، پێغەمبەران مژدەیان لەبارەوە دا و، ئەولیاکانیش بریتین لەو میوە و بەروبوومانەی کە ڕووناکییان لەو وەرگرتووە. چرای پێغەمبەرایەتی سەرەتا بەدەستی ئەو گڕیگرتووە

و، مانا و ناوەرۆکەکەی ناویشی بە درەخشانترین شێوە لەگەڵ ئەودا دەرکەوتووە. یەکەم نوور نووری ئەو بووە و، کۆتا شەپۆلی ڕووناکیش دەرکەوتنی ئەو بووە لە جیهانی دەرەکیدا. لە دیدێکی ترەوە ئەو پێڕستی ئاسۆ و نەفسەکان و، پوختە و کاکڵەی بوون و، ڕووناکترین میوەی درەختی بەدیهاتووان و، سەرداری هەموو ئینس و جیننە بەناوی بەدیهێنەری مەزنەوە.

ئەو، لەڕووی ناوەرۆك و پێگەکەیەوە هەموو کاتێك لەسەروو وەسفکردنەوەیە و، لەسەر ئاستی زاتی پیرۆزی بێهاوتایە و، لە ڕوانگەی قووڵیی ئەو لە جیهانی غەیبدا ناوازەی کات و شوێنەکانە و، بە پەیامەکەی دەستیشیدا بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە. ناوبانگی هەتا پێش حەزرەتی ئادەمیش درێژدەبێتەوە و، نوورەکەی پێش هاتنی بووە بە داستانی سەر زاران و، هاتنەکەیشی میهرەبانیی خوایە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی. بوونی ئەو نایابترین مرواری نێو سەدەفی وجودە و، پەیامەکەیشی گشتگیرترین پەیامە. زانستی ئەو پوختەی هەموو زانیارییەکانە و، عیرفانەکەشی کانییەکی ڕەوانە و هەموو سیما ڕۆشنەکان لەدەوری کۆبوونەتەوە و، ئاسۆکەشی بریتییە لە ڕوانینگەیەك سەبارەت بەو ڕۆحە بێگەردانە کە خوازیاری تەماشاکردنی نەبەدییەتن. چاوەکان تەنها بەهۆی ئەو ڕووناکییەی کە ئەو بەهەموو لایەکدا پرژاندی، هەلی بینینی ڕووی ڕاستەقینەی شتانیان بۆ ڕەخسا و، گوێیەکان بەیارمەتیی زەمزەمەی وتەکانی ئەو، لە گەوهەرەکانی وشەوە بەستەگەلێکی لاهوتییان -کە تا ئەو کاتە نەبیسترابوو- بیست. ئای چەند شتی نهێنی لە کەشوهەوای ئەودا ڕوونبوونەتەوە و، چەند بیری لێڵیش گەیشتوون بە پاکژی و ڕوونی! ئەو

کەسانەی ئەویان دیوە و گوێیان لێی بووە، سەرجەم ژەنگەکانی ڕۆحیان تواوەتەوە و، تانە و لێڵیی سەر چاوەکان لاچوون و، بەو هەواڵانەش کە دەربارەی سەرەتای سەرەتاکان و کۆتایی کۆتاییەکان داویەتی، سەرجەم ئەو نەزانراوانە ڕووناکبوونەتەوە کە لەسەروو توانای تێگەیشتنی ئادەمیزادەوە بوون و، نادیارییەکان یەك بە یەك لەسەر زەمینەی مانا دانیشتوون و، سەرتاسەری بوون لەڕووی ئامانجی بەدیهاتنیەوە وەك هۆنراوەیەکی خوێنراوە و ڕاڤەکراو و، چەشنی بەستەیەکی لێهاتووە کە بە شان و باڵی جاویدانیدا هەڵدرابێت.

هەموو زانستەکان بەراورد بە دەریای زانستی ئەو دڵۆپێکن و، سەرجەم داناییەکانیش بریتین لە نمێکی بچوك لە ڕوباری مەعریفەتی ئەو. سەرلەبەری کات و زەمەن ناگەن بە چەند چرکەساتێکی کەمی ژیانی ئەو. ئەو گۆی زەوییەی کە بەراورد بە گەردوون وەك سەری نینۆکێك وایە، بەهۆی نهێنیی فەرمانبەریی ئەوەوە بووە بە هاوتای هەموو جیهان. لە نەخشە و پلانی دەستنیشانکراوی قەدەردا یەکەم ئەوە و، وتاربێژی کۆتا وتەی دەعوای پێغەمبەرایەتیی ئەوە و، شاعیری ڕاستەقینەی بینراو (الظاهر) ئەوە و، زمانی گۆیای نهێنییەکانی نەبینراو (الباطن) یش ئەوە. لەو ڕووەوە کە بەجۆرێك بەدیهێنراوە بتوانێت ڕاستییە زانستی و عەقڵییەکان لە ڕۆحی پیرۆز (الروح القدس) وەربگرێت و، شعوور و تێگەیشتنی فراوانە و، ئیدراکی بەرزە و، دڵیشی کراوەیە بەڕووی مەلەکوتدا و لەبارە بۆ تەماشاکردنی جیهانەکانی ئەودیو، سوڵتانی تەختی پێغەمبەران ئەوە و، وەکو وەرگرێکی نوورانیی کراوەیە بەڕووی جیهانی غەیبدا و، لەو ڕووەیشەوە کە بێ کەموکورتی ئەو شتانەی

وەریگرتوون دەیگەیەنێت بە ڕۆحەکان و ژیرییەکان، پاراوترین و گۆیاترین تەرجومانی جیهانی ڕیسالەتە.

ئەو لەو ڕووەوە کە پێغەمبەرە هەواڵ دەربارەی زات و سیفەت و ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە دەدات و، دەیناسێنێت و، هەستی بەرپرسیارێتیمان بەرامبەری دەوروژێنێت. لەم ڕووەوە ئەو ناسێنەرێك و مامۆستایەکی مەزنە کە نەناسراوەکان دەناسێنێت و نادیارەکانیش دەدات بەگوێی ڕۆحماندا. لەو ڕووەیشەوە کە تەبلیغی بڕیارە دینییەکان دەکات و، بەها مرۆییەکان فێردەکات و نوێنەرایەتیی بنەما ئەخلاقییەکان دەکات، ئەو ڕێنموونیکارێکی کارپێسپێرراو و، یاسادانەرێك و، زمانێکی ڕوونکەرەوەیە بۆ شیکردنەوەی حەقیقەتی حەقیقەتەکان.

پێغەمبەرایەتی و، ڕیسالەت و، پاشان ویلایەت کە لەژێر سێبەری ئەم دوانەدایە، هەروەك کراوەن بەڕووی دیوی دەرەوە(الظاهر)دا، بەهەمان جۆر کلیلی دەرگای ناوەوە(الباطن)شن. تەنانەت عەقڵی ئەوان بە ڕەنگی ئەم پلەوپایە خواییە ڕەنگداربووە و، عەقڵیان چەند هەنگاوێك لەدوای ئەم پلەیەوە دەوەستێت و، چاوەڕێی فەرمان و فەرمایشی خوا دەکات. عەقڵێك کە وەکو عەقڵی ئەوان سنووری خۆی بزانێت و چووبێتە ژێر سایەی پێغەمبەرایەتییەوە، بە نووری "ڕۆحی هەرەمەزن" ڕووناك دەبێتەوە و، دەبێت بە ڕەهەندێکی گرنگی حەقیقەتی مرۆڤ و، بەتێپەڕبوونی کات لەپاڵ بینراودا نەبینراو و، لەگەڵ سەرەتادا هەست بە کۆتاییش دەکات.

بوون هەم دیوی دەرەوەی هەیە هەم ناوەوە. دەرەوە بە چاو دەبینرێت و، بە ئەندامە هەستەوەرەکان هەستی پێدەکرێت و بە عەقڵ و داوەریی ژیریش هەڵدەسەنگێنرێت. بەڵام دیوی ناوەوە (الباطن) لە لایەن خواوە دەکرێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە توانا و لێهاتنێکی لەباریان پێبەخشراوە بۆ هەستکردن بەم دیوەی بوون و، ئیدی ئەم لایەنە دەبێت بە دەنگێك و، ڕەنگێك و، هەناسەیەك و نەخشێك لەودیوی شتە بینراوەکانەوە. پێغەمبەران بەدرێژایی تەمەنیان ئەم دەنگ و، ڕەنگ و، هەناسە و نەخشە دەبیستن و هەمیشە بەگوێرەی ئەمە ڕەفتاردەکەن.

حەزرەتی موحەممەد لە ڕوانگەی پێگە و توانا و لێهاتنە تایبەتەکەیەوە، نیشانە و دەنگی سەرکەوتنە لەم بوارەدا. ئەو بە ئیزنی خوا شتە نەبیستراوەکان دەبیستێت و، نەبینراوەکان دەبینێت و، گاهـ بە گۆڕانی ڕۆحی بۆ ماهییەتێك کە لەسەروو کات و شوێنەوەیە پێش ڕۆحانییەکان دەکەوێت و، ڕێزلێگیراوترین بەندەکانی خوا کە فریشتەکانە تێدەپەڕێنێت و، هەتا ئاسۆی (قاب قوسين أو أدنى) لە شەقەی باڵ دەدات. ئەو بەئەندازەی پلەوپایە بەرزەکەی لە لای خوا، متمانە و پێگەیەکی بەردەوام و جێگیری لای خەڵکیش هەیە. ئەو بەدرێژایی تەمەنی بەقەدەر موویەك لە ڕاستی دوورنەکەوتووەتەوە و، متمانەی بەسەر دۆست و دوژمندا بەخشیوەتەوە و، ئەو پەیامانەی لە خواوە وەریگرتوون هاودەم لەگەڵ سەرنجڕاکێشییە لاهوتییەکەیاندا پێشکەش بە خەڵکی کردوون و، هەردەم لەگەڵ بێگەردی و بێتاوانییەکەیدا یادکراوەتەوە و، بە فەتانەتە ورد و تیژەکەی کە کراوەیە بەڕووی فیزیك و مێتافیزیکدا و بە ڕۆحە ڕووناکەکەی، هەمیشە خوێندنەوەی ڕاست و دروستی بۆ

سروشت و ئەودیوی سروشت کردووە و، ڕاست و دروست ڕاڤەی کردووە و، لەئەنجامیشدا هەموو ویژدانە پاکەکان کە دارای بڕیاری لەپێشینە نەبوون بێ دوودڵی بەرەو ئەو ڕایان کردووە و، نەفسە هەرە یاخییەکان لەبەرامبەریدا هاتوونەتە سەر چۆك و، ژیرییە هەرە زیرەك و ناوازەکان لە پەیامەکانی ئەودا ئامانجی بەدیهاتنی عەقڵیان خوێندووەتەوە و خۆیان ڕادەستی ئەو کردووە. هەر لەسایەی ئەودایە کە ئادەمیزاد لە ئاژەڵی و جیسمانییەت دەرچووە و، ڕووی لە ئاسۆی پلە بەرزەکانی ژیانی دڵ و ڕۆح کردووە. ئەو -لەڕووی ئاسۆی بوون- کلیلی نهێنیی ئەو دەرگایەیە کە بەسەر بوونی دەرەکیدا دەکرێتەوە و، ئەو -لەڕووی هاتنەدی ئامانجی بوون- ڕابەری ئەو ڕێگا ڕاستەیە کە دەگات بە خوا و، شەفاعەتکاری بەختەوەریی هەمیشەییە.

هەموو پێغەمبەرانی پێش ئەو هەمان ئەو شتەیان وتووە کە ئەو فەرموویەتی و، ئەولیا و ئەصفیاکانیش -کە حاڵەتە دەراساکانیان شایەتە لەسەر دەعواکەیان- کە دوای ئەو هاتوون، ئەویان پشتڕاست کردووەتەوە و، دانیانناوە بەوەدا کە هەرچی مەزهەرییەتیان هەیە لەوەوە وەریانگرتووە.. بەڵێ، ئەگەر ئەو هەموو سەرنجەکانی بۆ لای تەوحید ڕاکێشابێت، ئەوا دەنگی سەرجەم پێغەمبەر و نێرراوەکان و، کەشف و شهودی سەرجەم ئەولیا و ئەصفیاکانیش لەم دەعوایەدا پشتی دەگرن.

ئەو نمونەیەکی باڵای ئیمان و ئەمانەت بوو. هەرچییەکی دەوت بەوردی لە ژیانیشیدا جێبەجێیدەکرد و، ڕەفتارەکانی هەمیشە بەگوێرەی جیهانی ئەودیو ڕێکدەخست و، بەجۆرێك ژیانی بەسەردەبرد وەك ئەوەی

خوا ببینێت و لە لایەن ئەوەوە ببینرێت و، لە هەموو کەسێکی دیکە هەستیارتر ڕەفتاری دەکرد و، هەموو حاڵەتێکی بەرپرسیارێتییەکی جددی پیشاندەدا و، هەمیشە هەوڵی بۆ عاقیبەتخێری دەدا و، بێئەوەی چرکەیەك چاو لە ئامانجەکەی بتروکێنێت، هەمیشە بەرەو ئەو خاڵە دەفڕی کە بۆی دیاریکرابوو و، چەندین مانای پەیوەندییە قووڵەکەی نێوان خۆی و خوای لە شێوەی نەخش و نیگاری جۆراوجۆردا پێشکەش بە هەموو کەسێك دەکرد.

ئەوبوو کە مانای بوونی ڕوونکردەوە و گێڕایەوە بۆ خاوەنە ڕاستەقینەکەی و، دانایی و بەرژەوەندیی ناو ناخی شتان و ڕووداوەکانی دەرهێنا. ئەوبوو بیریخستینەوە کە ئێمە لێرە بەتەنها نین، ئەو حەقیقەتەی بەگوێدا داین کە دەبینرێین و چاودێری دەکرێین و، بەمەش ئاسوودەیی بە دڵەکانمان نۆشی و، نامۆیی ئێمەی هەڵگرت و، بە نهێنیی هاودەمی شاباڵی بە ڕۆحەکانمان گرت و، هەستی ئاشنایی لەگەڵ هەموو بوونەوەراندا پێداین و لەگشت جێگایەکدا هەست دەکەین کە لە ماڵی خۆماندایین. ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ لەم لانە گەرم و نەرمەدا هەست بەکەین کە هەموو شتێك لە جێگای خۆیدا دانراوە و ڕێکخراوە، ئەگەر دڵەکانمان بە عەشقی حەقیقەت لێبدات، ئەگەر بتوانین لەسەر ئاستی ناسین و شیکردنەوەی بوون شتێك بکەین و پێشکەشی بکەین، تەنها بەهۆی ئەو چرایەوەیە کە ئەو لە مێشکماندا تاویداوە. بەڵێ، هەرچی بزانین دەربارەی مرۆڤ و، بوون و سەرجەمی گەردوون، بریتییە لە کرانەوە و فراوانبوونی ئەو پوختەیەی کە ئەو داویەتی بەگوێی ڕۆحماندا.

ئەو لە دوێنێ و، ئەمڕۆ و ئایندەدا سەرلەنوێ دامەزرێنەرەوەی مرۆڤایەتی بووە و دەبێت. هەروەك لە ڕۆژگاری خۆیدا لە چاوتروکاندنێکدا و بە یەك هەڵمەت تێگەیشتنە چەوتەکان و، هەڵسوکەوتە نامرۆییەکان و لادانەکانی فیترەتی گۆڕی کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ لە سروشتەکاندا ڕەگیان داکوتابوو، باوەڕی تەواومان هەیە دەنگی خۆی دەگەیەنێت بە حەشاماتەکانی ئەم سەردەمەش کە بەتەواوەتی لە شیرازە دەرچوون و، زوو یان درەنگ ڕێکوپێکی بە ئەوانیش دەبەخشێت و، هێزی پەیامی خۆییان پیشان دەدات. دەتوانرێت ئەمە ناوی "سەرلەنوێ خوێندنەوەیەك و ڕاڤەکردنێکی ڕاست و دروست بۆ مرۆڤ و گەردوون و حەقیقەتی خوایەتی و، هەڵوێست وەرگرتنی مرۆڤ بەرامبەر بە گەردوون بەجۆرێك کە گونجاوبێت لەگەڵ پێگەکەیدا"ی لێبنرێت.

حەزرەتی موحەممەد پەیامێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە پەیوەندیی بە هەموو شتێك و هەموو کەسێکەوە هەبوو و، لەڕووی فەرمانبەرییەکەیشیەوە خاوەنی قووڵی و سەرنجڕاکێشییەکی وابوو دڵ و چاوەکانی تێردەکرد. کامڵی لە سروشتیدا و، متمانە و قەناعەتبەخشی لە هەڵسوکەوتەکانیدا، هەموو کاتێك لاهوتێکی نمایان دەکرد کە جیسمانییەتی تێپەڕاندبوو. لەپشتی ئەم ڕووکارە جوان و سەرنجڕاکێشەوە، دارای ئاکارێکی هێندە بەرزبوو کە بۆ هیچ کەسێکی دی دەستی نەداوە و، قورئان بە "خلق عظیم" وەسفی دەکات، بەجۆرێك ئەگەر کەسێك خاوەنی بڕیاری لەپێشینە نەبێت و تەنها یەك جار ڕێی لە کەشوهەوای ئەو کەوتبێت، جارێکی دی نەیدەتوانی لەژێر کاریگەری دەربچێت. لەپاڵ ئەم جوانی و سەرکەوتنەدا، گوفتارێکی سیحرئامێزی وای هەبوو کاتێك

ئەو دەکەوتە ئاخاوتن کارامەترین زێڕەنگەرەکانی وشە زمانی خۆیان قووت دەدا و، موراقەبەی بێدەنگی دایدەپۆشین و، خۆیان ڕادەستی دەربڕینە ئەفسووناوییەکانی ئەو دەکرد.

ئەگەر پێتان خۆش بێت با هەندێکی تریش لەسەر ئەم لایەنە بوەستین: خوای گەورە فراوانییەکی وای لەڕووی پێکهاتەی دەرەکی و ناوەکییەوە بەو بەخشیبوو کە هەرچەندە تابڵێی خاکی و خۆبەکەمزان بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا گەلێك بەسام و ئەفسووناوی بوو. کاتێك ڕۆحە هەرە لەخۆبایی و خۆبەگەورەزانەکان دەچوونە خزمەتی، لەتاو شکۆی بەرزی ئەو هەڵدەلەرزین و، حاڵەتێکی پێچەوانەی بیر و نیەتی خۆیان وەردەگرت. نوێنەرە لەخۆباییەکانی کیسرا لەبەرامبەر ئەم نمونە باڵایەی سام و شکۆدا لەشوێنی خۆیان چەقین و، دەمیان لەگۆ کەوت. هاوڕێ لەگەڵ ئەم هەیبەت و جددییەتەدا، ئەوەندە نەرمونیان بوو کە هەموانی کێشدەکرد و دەیکردن بە ئەوینداری خۆی، بەجۆرێك هەرکەسێك لە نزیکەوە ئەوی بناسیایە، لە منداڵ و دایك و باوك و سەرجەم خۆشەویستانی زیاتر دەبەسترا پێیەوە و، وەك بڵێی ئالوودەی دەبوو و، هەرگیز نەیدەویست جارێکی دی لە حزووری ئەو داببڕێت. هەموو ڕەفتارەکانی ئەو متمانەیان لێدەچۆڕا و، وشە و هەڵسوکەوت و نیشانەکانی دەست و دەموچاوی ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە هەمیشە لە حزووری خوای خۆیدایەتی و، هەردەم ئاسایشی هەڵدەمژی و، چەپکەگوڵی متمانەی بەسەر هەموو کەسێکدا دابەش دەکرد. ئەو وەك ئەمینی ئەوەڵ و ئەخیر ناسرابوو، لە نیگاکانیدا ئەمنییەت نمایان بوو، وتەکانی بەدەوری ئەمنییەتدا دەهاتن و دەچوون و، هەمیشە بەستەی ئەمنییەت لە حەرەمی ئەودا دەبیسترا. لە هەڵسوکەوتە

گشتییەکانی ئەودا عەقڵ و، ڕۆح و، هەست و، لۆجیك هاوشانی یەکتر و یەکسان بوون. هەریەك لە زیرەکییە وردەکەی و، فیراستە بەهەڵەدا نەچووەکەی و، ئەو دامەزراوییەی کە داخرابوو بەڕووی هەر چەشنە دوودڵییەکدا و، پێداگری و ڕاستڕەوییەکەی و، ملنەدانی لە بەرامبەر ڕووداوە هەرە سەختەکاندا و، زەردەخەنەی بەڕووی موسیبەتەکاندا و، خوێندنەوە باشەکانی بۆ بەڵاکان و دەرهێنانی هەزاران پەند لێیان و، ئەوپەڕی خوێنساردی و ڕەفتاری هۆشیارانەی ئەو لەبەرامبەر کۆمەڵێك شت و ڕووداوی نابەجێی وا کە قین و توورەیی و نەفرەتی مرۆڤ دەبزوێنن.. هەموو ئەمانە تەنها چەند نمونەیەکن لەسەر کەسایەتیی سەروو مرۆیی ئەو و، پێگە تایبەتەکەی و هەڵسوکەوتەکانی بەگوێرەی ئەم پێگەیە. لەجێگایەکدا کە خەڵکی تووشی ترس و شڵەژان دەبوون، هەڵوێستێکی هێندە مەردانەی هەبوو کە لەسایەیدا دۆڕانەکان دەگۆڕران بە بردنەوە و، شکستەکان جێیان بۆ سەرکەوتنەکان چۆڵدەکرد و، لە ناوەندی تۆز و غوباری ژێرکەوتندا ستراتیژەکانی سەرکەوتن بەدیاردەکەوتن.

ئەو سەرۆکێکی بێهاوتابوو لەنێو تاکەکانی خێزانەکەیدا.. لەنێو هاوەڵەکانیدا، مامۆستا و فێرکارێکی کامڵ بوو و دەیزانی چۆن بە شێوازێکی برایانە و بە هەڵسوکەتە نەرمونیانەکانی بچێتە ناو دڵیانەوە.. ڕابەرێکی بێوێنەی وابوو کە هەرگیز شوێنکەوتووانی دووچاری سەرلێشێوان و نائومێدی نەدەکرد.. وتاربێژ و سوڵتانی وشە و، ڕەببانی و مەردێکی بواری دڵ و، مامۆستا و دادوەر لە داوەریی ژێریدا و، سەرۆك وڵاتێکی ناوازە و، فەرماندەیەکی وابوو لە جەنگدا کە لە خودی شکستەکانەوە سەرکەوتنی دەردەهێنا. هەموو ئەم لایەنە کامڵانە لەودا دەگەیشتن بە

لوتکە، بەڵام ئەو هەمیشە وەك کەسێکی ئاسایی هەڵسوکەوتی دەکرد و، خۆی بە مرۆڤێك لەنێو مرۆڤەکانی تردا دادەنا و، ئەوپەڕی بێزاری دەردەبڕی بەرامبەر بەو پلەوپایە بەرزانەی کە هەم شایانی بوو و هەم داخوازی پەروەردە و ڕێزی خەڵك بوو و، جاری وابوو لەسەر ئەم بابەتە هاوەڵە نایابەکانی کە زۆری خۆشدەویستن بەتوندی ئاگاداردەکردەوە.

لە پێگەی "هۆکار و مەبەست"ی بەدیهاتنی هەموو گەردووندا بوو، کەچی ئەو بەئەندازەی باڵە مێشێك گرنگیی بەمە نەدەدا و، هەرچەندە ئەوەندە مەزن بوو کە تەختی پادشایی بە سوڵتانەکان دەدا و تاجی دەکردنە سەر، کەچی ئەوپەڕی زاهیدانە دەژیا و وەك کەسێك کە نیەتی ڕۆژووی هێنابێت ژیانی لە زوهددا بەسەردەبرد. نەیدەخوارد، دەرخوادی کەسانی تری دەدا و، نەیدەپۆشی، دەیکردە بەری کەسانی دی و، لەهەمبەر دڵۆپێك نیعمەتدا سەد جار سوپاسی خوای دەکرد و هەمیشە لەگەڵ هەستی منەتباریدا هەڵدەستا و دادەنیشت. لەسەر ئاستی هەستەکانی وەك مەعریفەت و، خۆشەویستی و ترسان لەخوا هاوشانی فریشتەکان بوو، لە دونیادابوو بەڵام دونیایی نەبوو، لەسەر ڕێگای عوقبابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوێشدا پەیوەندییەکی پلەیەکی نەبوو، چونکە هەمیشە دڵی لای خوای خۆی بوو و، چاوی لە ئاسەوارەکانی ئەو ناوە پیرۆزانە بڕیبوو کە ڕەنگ و شێوە و نەخش بە ئاسەوارەکان دەبەخشن. وەك خانێکی سەر ڕێی عوقبا لەم دونیایەی دەڕوانی و، چەشنی مەزرایەك مامەڵەی لەگەڵ دەکرد و، دەیچاند و، دروێنەی دەکرد و، هەرچیشی چنگ دەکەوت هەڵیدەگرت بۆ پاشەڕۆژ. هەروەك ڕەشەباکان تۆوەکان بە ڕاست و چەپدا هەڵدەگرن و دەیانسپێرن بە دەستی نەشونما، بەهەمان

جۆر ئەویش تۆوی توانا و لێهاتنی مرۆڤەکانی بەملا و بەولادا دەپژاند و، چاودێری بێنەوایانی دەکرد و، برسییەکانی تێردەکرد و، زۆرکاتیش خۆی بە برسێتی دەنووست و هەڵدەستا. کاتێك وەك سەروەری هەردوو جیهان بەرەو خوای خۆی گەڕایەوە، نە کۆشك و تەلار و، نە سەروەت و سامان و، نە ماڵێکیشی بە میرات لێ بەجێما بۆ خێزان و منداڵەکانی. وەك خۆی ژیا و، وەك خۆی دونیای هەڵسەنگاند و سوودی لێبینی و، بەجۆرێکیش کۆچیکرد کە شایانی ئەوبوو. هەڵبەت ئەو وازی لە دونیا نەهێنابوو، بەڵام هەرگیز خوازیار و داواکاری دونیاش نەبوو. ئەو بەئەندازەی نرخ و بەهای هەریەکەیان گرنگیی بە دونیا و جیهانەکانی دیکەی پاش دونیا دەدا و، هەڵسوکەوتەکانیشی بەم ئاڕاستەیەدابوون.

سەرەڕای سام و شکۆ مەزن و سەرسووڕهێنەرەکەی کە لە خانەدانی و، نەجیبی و پەیوەندیی لەگەڵ خوادا سەرچاوەی گرتبوو -وەك ئەوەی دوو شتی دژ بەیەك لە خۆیدا کۆبکاتەوە- ئەوەندە خۆبەکەمزان بوو ئەگەر یەکێك ئەو بابەتانەی نەزانیایە کە کەمێك پێش ئێستا باسمان کرد، وای دەزانی کەسێکی سادە و ئاساییە. چاوی خۆی دەبوارد لە ڕێز و بەگەورەزانینی هاوەڵەکانی و، لە هەمان جێگای ئەوان دادەنیشت و، لە هەمان سفرەی ئەوان دەیخوارد و، جیاوازی و تایبەتمەندییەکانی وەك ناموسی خۆی دەشاردەوە و، جاروبار لەشێوەی پەند و وانە و قسەی نەستەق و خۆشدا و وەك شەپۆلێکی تەجەللی جەمالییانە ئەوانی هێور و ئارام دەکردەوە و لە قورسایی سام و شکۆ و مەزنیی ناو سروشتی خۆی دەیپاراستن. عیززەتی خۆی بە خۆبەکەمزانین دەڕازاندەوە و، سام و شکۆکەی بە شەفەقەت ڕێکدەکردەوە و، ڕەنگە ناسوتییەکەی خۆی زیاتر

دەخستە پێش چاو و، ئەوەندەی تر پێگە شیرینەکەی خۆی بەتامتر دەکرد.

ئەو هەمیشە هێمن و، لەسەرخۆ و هاوسەنگ بوو. تەنانەت لەو حاڵەتانەدا کە ڕق و قین و نەفرەت هێرشیان دێنا، ئەو تابلێی لەسەرخۆ ڕەفتاری دەکرد و، قوڵپی تووڕەیی و ڕقی خەڵکی هێوردەکردەوە و، بە تاقە یەك هەڵمەت دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی نەرم دەکرد و، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە دەویسترا بەرەو سەنگەری جەنگ ڕاپێچ بکرێت، ئەو دەیزانی چۆن بە یەك گوژم لەسەر تەختی دادوەری دابنیشێت. لە هەموو جێگایەکدا -بەمەرجێك مافێکی گشتی پێشێل نەکرایە و بێڕێزی بەرامبەر بە خوای گەورە نەکرایە- ئەو هەمیشە لێبووردە و چاوپۆش بوو. بەجۆرێك دەکرێت لە ژیانی پیرۆزیدا سەدان نمونەی لێبوردەیی ئەو ببینرێت و پیشان بدرێت.

لە وەفاداری بۆ بەڵێن و پەیماندا وێنە و هاوشێوەی نەبوو. هەرگیز نەبینراوە تەنها جارێك بەڵێنی خۆی نەبردبێتە سەر و لە قسەی خۆی پەشیمان بووبێتەوە. نە پێش پێغەمبەرایەتی و نە دوای سەرفرازبوونیشی پێی، هەرگیز لە قسەی خۆی پاشگەز نەبووەتەوە و، نەك وتەیەکی پێچەوانەی ڕاستی بە زاری پیرۆزیدا نەهاتووە، بەڵکو تەنانەت ئاماژەکانیشی هێمایان بۆ شتێکی لەم جۆرە نەکردووە. هەروەها دامەزراوییەکەشی بەرامبەر بە شکێنەرانی وادە و پەیمان شتێکی زانراو و ناسراوە.

ئەو سوڵتانی گوفتاربوو و گەوهەری وشە نرخی ڕاستەقینەی خۆی لای ئەو دەست کەوتبوو. نە ڕۆژێك لە ڕۆژان خامە و مرەکەبی بەدەستەوە گرتووە و، نە ئاشنایەتی لەگەڵ هیچ پەڕاوێکدا پەیداکردووە و، نە لەسەر

ڕەحلەی فێربوونی هیچ کەسێك دانیشتووە و، نە هەستی بە ناچاریی ئەوە کردووە کە بە هیچ کەسێك بڵێت "مامۆستا" و، هەرگیز نازناوی "مامۆستای گشتی"ی خۆی لەکەدار نەکردووە. ئەمەش مانای ئەوەبوو کە تەفسیرکردنی فەرمانە خواییەکان بە پێکهاتەی زیهنی و زانیاریی نامۆ لێڵ نەبێت و، ڕەنگ و قاڵبێکی جیاواز وەرنەگرێت. هەروەها بریتییە لە پاراستنی فەرمانە خواییەکان بە پلەی یەك و توانا سروشتییەکانی پێغەمبەرەکەی بە پلەی دووهەم لە هەر جۆرە کاریگەرییەکی دەرەکی.. ئەو ئا لەم ڕووەوە نەخوێندەواربوو -گیانمان فیدای ئەو نەخوێندەوارە بێت- بەڵام ئەو لە کاروبارە دونیایی و قیامەتییەکاندا و وەك مامۆستایەکی گشتی لە سەرجەم بوارەکاندا وتەی وای گوتووە و فەرمان و بڕیاری هێندە شایستە و بەجێی دەرکردووە کە هەر لە زانا هەرە زیرەکەکانەوە هەتا بلیمەتە دەراساکان، هەر لە دەماغە هەرە ورد و تیژەکانەوە هەتا ڕۆحە ڕووناکەکان، لەهەمبەر ئەو وشە و بڕیار و فەرمانانەدا دووچاری سەرسامی و سەرسوورمان هاتوون. مێژوو شایەتە لەسەر ئەوەی هیچ کەسێك نەیتوانیوە شتێك بڵێت لە ئاستی هێزی گوفتاری ئەودا بێت و، نەیوێراوە تانە لە هیچ یەکێك لە بڕیارەکانی بدات و ڕەخنە ئاڕاستەی هیچ یەکێك لە کاروبارەکانی بگرێت.

ئەو حەوزێك و گەنجینەیەکی پاك و بێگەردی زانیاریی وابوو کە نە لەو هەواڵانەیدا سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕابردووی تۆز لەسەرنیشتوو و، نە لە هەواڵەکانیشیدا دەربارەی دین و، مەزهەب و، کلتوور و، عادەت و دابونەریتی نەتەوە جیاوازەکان، دووچاری ڕەخنە و بەرهەڵستی نەبووەتەوە. هەر وایش دەبوو، چونکە ئەو نێرراوی خوابوو و، ئەو زانیاییە ڕاست

و ڕەوانەش کە دەڕژایە حەوزی زانستی ئەوەوە لە لایەن خوا خۆیەوە دەهات. ئەو لە دەربڕینەکانیدا پادشای گوفتار و، لە لۆجیکدا نمونەی باڵای داوەریی ژیری و، لە بیر و بۆچوونیشیدا زەریایەك بوو بەئەندازەی پانتایی فەرمانبەرییەکەی. گوتارەکانی هێندە زیرەکانە و لێزان و، دەربڕینەکانی ئەوەندە ڕوون و ئاشکرا و، شێوازەکەی هێندە دەوڵەمەند و ڕەنگین بوو کە گاهـ بە یەك دوو ڕستە دونیایەك حەقیقەتی پێشکەش بە گوێگرانی دەکرد و، گاهـ بابەتە هەرە فراوانەکانی -کە چەندەها کتێبیان بۆ ڕوونکردنەوە دەویست- لە چەند وشەیەکی کورتدا جێدەکردەوە و، جاری وایش بوو ئای چ گەوهەرگەلێکی وشەی دەسپارد بە مامۆستایانی تەفسیر و تەئویل! وتەی "من کۆی دانایی و حیکمەتەکانم پێدراوە." نیشانەیە لەسەر ئەم فراوانییەی ئەو.

هەموو کاتێك لە سەد سەنگەرەوە سەدان پرسیاری ئاڕاستەدەکرا. یەکسەر و بێ هیچ دوودڵییەك وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانی دەدایەوە.. لە وتەکانیدا شێوازێکی وای بەکاردەهێنا کە زۆرینەی خەڵك لێی تێبگەن.. هەروەك لە هەموو جۆرەکانی چەواشەکاری بەدووربوو، بەهەمان شێوە بە دەربڕینێکی کورت و پوخت و، ڕوون و ڕەوان و، بێنەوەی ببێت بە هۆکاری چەواشەبوون مەبەستەکانی خۆی ڕووندەکردەوە و، لەئاستێکدا دەدوا کە زانا و نەزان و، زیرەك و گەمژە و، کەمزان و پیشەمەند و، گەنج و پیر و، ژن و پیاو سوودی لێوەربگرن و، لە هەموو بارێکدا دڵنیایی لە دڵی بەرامبەرەکانیدا مسۆگەر دەکرد.

ئەو زۆری فەرمووە و، زۆر وتاری داوە و، لە گوتارەکانیدا چەندین باسی تاوتوێ کردووە و، بابەتی جۆراوجۆری شیکردووەتەوە، بەڵام

هەمیشە هاوشانی واقیع و ڕاستی بیریکردووەتەوە و دواوە. تەنانەت سێبەری شتێکی پێچەوانەی ڕاستی نەنیشتووە لە وتە و دەربڕینەکانی. بەجۆرێك تەنانەت ئەو دوژمنە هەرە سەرسەختانەشی کە هەمیشە چاویان لەسەری بوو و لە هەلێك دەگەڕان بۆ لێدانی، نەیانتوانیوە بە درۆ تاوانباری بکەن.

لەڕاستیدا کەسێك کە هەر لە منداڵییەوە هەتا گەنجێتی و، لەویشەوە هەتا چل ساڵی کە تێیدا شەرەفمەندی پێغەمبەرایەتی کرا، بەوپەڕی هەستیارییەوە و لە گشت هەڵسوکەوتەکانیدا زمانی خۆی پاراستبێت لە گوتارێکی پێچەوانەی ڕاستی، بانگەشەکردن بۆ ئەوەی گوایە ئەم مرۆڤەی کە دوو لەسەر سێی ژیانی ڕۆیشتووە، هەڵدەستێت و -حاشا!- بانگەشەی ناحەقی پێغەمبەرایەتی دەکات، نەك هەر گوناهە، بەڵکو کوفرێکی کۆنەپەرستانەیە و، بێڕێزییە بەرامبەر بە عەقڵ و لۆجیك. جگەلەوەش ئەو وتانەی ئەو فەرموویەتی هێندە فراوان بوون کە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێیان لەخۆگرتووە و ناوەڕۆکەکەشی هێندە جۆراوجۆر و فرەڕەنگ بوو کە سنووری مێشکی مرۆڤ تێدەپەڕێنن. ئەو لەبارەی بیروباوەڕەوە قسەدەکات و، بڕیار لەسەر عیبادەت دەدات و، دەربارەی بابەتە کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سەربازی و، ئیدارییەکان دەئاخفێت و، گوفتارەکانی دەکات بە کردار و، لە کردەوەکانیشی میوە و بەروبووم دەچنێتەوە و، ڕاستێتی ئەو بناغانەی هێناونی لای مێژوو تۆماردەکات و پاشان ڕادەستی ئەو ویژدانە بێگەردانەی دەکات کە بڕیاری لەپێشینەیان نییە. دوای ئەو هەزاران تەفسیرکار و، هەزاران بیرمەند و، سەدان فەیلەسووف و، سەدان هەزار هونەرمەند و پیشەوەر کە هەریەکەیان لە

هونەرێکی جیاوازدا پسپۆڕییان هەیە، "بەڵێ" لەسەر وتەکانی ئەو و، بناغە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی ئەو و، یاسا سەربازی و ئیدارییەکانی ئەو و، ڕێسا پەروەردەکارەکانی ئەو دەکەن و، مۆر و ئیمزای خۆیانی لەسەر دادەنێن. جگەلەمەش ملیۆنان ئەولیا و ئەصفیا پشتی هەموو گوفتار و بڕیارەکانی ئەو دەگرن و، هاواری ئەوە دەکەن کە تەنها لەسایەی ڕابەرایەتی ئەودابووە کە بەم پلەوپایانە گەیشتوون. لەم ڕوانگەیەوە ئەو کەسەی بەم زاتە دەڵێت "نەخێر!"، یان گەمژەیەکە و نازانێت دەڵێت چی، یاخود بەدبەختێکەوە و لەمێژە عەقڵی شۆراوەتەوە. چونکە نە دوێنێ و نە ئەمڕۆیش لەم هەموو بابەتە جۆراوجۆرانەدا هیچ کەسێك نەیتوانیوە نەك بەم ئەندازەیە بەڵکو تاکە وشەیەکیش بڵێت کە بە تەڕ و پاراوی بمێنێتەوە و، لەم ڕووەوە بڕیارێکی نەگۆڕ دەربکات. بەتایبەت لەو بابەتانەدا کە پێویستی بە پسپۆڕییە هەرگیز شتی وا ڕوونەداوە! پێش لە هەر شتێکی دی، وەك بەدیعوززەمان ئاماژەی بۆ دەکات، کەسێك توانا و لێهاتن و بەهەرەکانیشی هەرچەندە زۆر بەرزیش بن، هێشتا دەتوانێت تەنها لە چەند زانست و بوارێکی دیاریکراودا قسەی بەجێی و هاوسەنگ بکات. لەحاڵێکدا ئەم زاتە پیرۆزە، دەربارەی سەرجەم بوون و ڕووداوەکان و، هەموو کات و شوێنەکان شتی هێندە ورد باسدەکات و، وتەکانی هێندە حەکیمانە و لێزانانە هەڵدەڕێژێت و، ئەوەندە بە یەقین و دوور لە هەر جۆرە دوودڵییەك گوفتارەکانی دەردەبڕێت کە هەرکەسێك ببینێت و، بیناسێت و، خاڵی لە بڕیاری لەپێشینە گوێی بۆ گرێت، بەبێگومانی (آمنّا) دەکەوێتە سەر زاری.

***

# ئەو نمونەی باڵای ئیمان و بزاوتن بوو

ئەگەر کەسێك هەبێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە ئیمان و بزاوتنەکەی نەتوانرێت بەراوردبکرێت بە هیچ کەسێکی دی، بێگومان ئەوە حەزرەتی موحەممەدە. ئەو هەمیشە بە باوەڕێکی بەتینەوە وابەستەی خوا بوو و، سەرتاپای بوونی باوەڕی کردبوو بەوەی کە لە لایەن ئەوەوە نێرراوە و، بەتەواوەتی ملکەچی ئەو بوو و، هەردەم بە هەستێکی جددی بەرپرسیارێتییەوە مامەڵەی کرد و، نە لە ئیمانەکەیدا و، نە لە دەعواکەیدا و، نە لە ڕاستێتی ئەو ڕێگایەی لەسەریەتی و، نە لەوەی کە خوای گەورە سەری دەخات، بۆ ساتێکیش گرفتاری دوودڵی نەبوو و، هەموو کاتێك وەك پەیکەری متمانە و دڵنیایی بەپێوە بینراوە. لەم ڕووەوە هەرکەسێك گەیشتبێت بە بەختەوەری ناسینی ئەو، متمانەی پێکردووە و، پشتی پێبەستووە و، شوێنکەوتنی ئەوی بە چاکەیەکی خوایی زانیوە.

ئەم متمانە ئەفسووناوییەی کە هەموو کەسێك بەوی هەبوو، ئەو لاهوتییەت و توندوتۆڵییەش کە لەو بناغە گشتییانەدا هەبوو کە ئەو هێنابوونی، ئەو جددییەت و ڕاستڕەوییەی کە لە ژیانی پیرۆزیدا هەبوو.. بەڵێ، هەموو ئەوانە سەبارەت بە ئەو بیمەیەکی ئەوەندە بەرزبوو کە هەزاران و سەدان هەزار کەس لەوانەی کە خووە ڕەگداکوتاو و عادەت و دابونەریتەکان لە خوێنیاندا ڕۆچووبوو، بێ هیچ دوودڵییەك گشت زنجیرەکانیان دەپساند و بەرەو ئەو ڕایاندەکرد. ئەمە ڕووداوێکی زۆر گرنگی وابوو کە وێنەیەکی تری نییە لە مێژوودا و، نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو نێرراوی ڕاستەقینەی خوایە. لەم ڕۆژگارەدا ئەو پەروەردەکار

و دەروونناسانەی کە سەرباری هەلومەرج و ئامرازە بەهێزەکانی فێرکردن، هێشتا ناتوانن یەك دوو خووی بچوك لە سێ چوار منداڵدا ڕیشەکێش بکەن، پێویستە زۆر بەوردی لە بناغەکانی ئەو گۆڕانە مەزنە بکۆڵنەوە کە ئەم زاتە پیرۆزە بەرپای کرد و، دەبێت جارێکی دی چاو بە خەرمانی زانست و، بیر و بۆچوونیاندا بخشێننەوە...

ئەو لە زەمینەیەکدا دەرکەوت کە کراوەبوو بەڕووی دەستدرێژی و، ستەم و، کۆنەپەرستی و، خۆپەرستی و، چاوچنۆکی و بەدڕەوشتیدا و مرۆڤەکانی ناویشی دڵیان بە هەڵپەی پلەوپایە لێیدەدا و، هەمیشە لەگەڵ هەستی وەحشیگەریدا هەڵدەستان و دادەنیشتن و، تاڵان کردنیان بە هونەر دەزانی و، بەدوای ناوبانگدا ڕایان دەکرد و، خۆشگوزەرانی و پاڵدانەوەیان بە تاکە ئامانجی ژیان دەزانی. لەو ژینگەیەدا کە ئەو چاوی بە دونیا هەڵهێنا تەنها هات و هاواری ستەمکاران و،ناڵەی ستەملێکراوان و، نرکەی هەژاران و، گرمەگرمی زۆرەملێیی دەبیسترا. عاکیف دەڵێت:

"سەرتاسەری دونیای ئاوەدانی ئەوکات،
لە قەیران و گەرداوێکدابوو لەمرۆش خراپتر.
ئادەمی لە دڕەندەییدا پێش جانەوەریش کەوتبوو،
کەسێك ددانی نەبووایە براکانی دەیانخوارد.
هەموو ئاسۆکانی زەمین، پشێوی دایپۆشیبوو
بڵاوبوو ئەو دەردی دووبەرەکییەی ئەمڕۆ ڕۆژهەڵاتی ڕوخاندووە."

بەڵێ، لە هەموو کونج و گۆشەیەکدا دیمەنێکی لەم جۆرە و نمونەی کەسانی لەم شێوەیە نمایان بوو: کۆمەڵی بێشوماری ستەمکاران، کەسانێك کە بەدەم هەستی تۆڵەسەندنەوەوە لرفەیان دەهات، کەسانێك کە حەزی بەرێوەبردن وەك تایەك لێی دابوون، کەسانێك کە ژیانیان لەسایەی ژێردەستەیی ستەمکاردا بە ملکەچی و گوێڕایەڵیی دەزانی، لە لایەك کەسانێك کەنوێنەرە بێرێزەکانی هێز و چەوسانەوە و زۆرداری بوون و لە لایەکی دیکەشەوە حەشاماتە بێ هەست و شعوورەکان کە چەشنی شمەك بەکاردەهێنران، کەسانێکی سەرگەرم کە زەمینەیان بۆ بێرەوشتی دەسازاند و هەمیشە هەڕەشەیان لە فەزیلەت و بەها مرۆییە جیهانییەکان دەکرد، چەندەها ستەملێکراو و بێنەوای واش کە ناچارکرابوون لەو چوارچێوەیەدا بەندایەتی بۆ خوا بکەن کە بەندەکان دایاننناوە.. ئەو، لەم حەشاماتە بێسەروبەرانەی کە هەر پارچەیەکیان کراوەبوو بەڕووی بۆشاییەکی جیاوازدا، کامڵترین و، ناوازەترین و ئەفسووناویترین کۆمەڵگای لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پێکهێنا.

بە شارێیەکدا هەنگاوی دەنا کە کراوەبوو بەڕووی دونیا و ئاخیرەتدا و، ئەو بناغانەی دایمەزراندبوون هەتابڵێی لاهووتی و نزیك بوون لە خواوە و، بست بە بست گونجاو و تەبابوو لەگەڵ ڕێسا بنەڕەتییەکانی بووندا. ئادەمییەکان لە کەشوهەوای ئەفسووناویی ئەودا هەم دەستلەملانی یاسا سروشتییەکان دەبوون و، هەم بەیەکجار بابەتەکانی وەك دین و دینداری و مێتافیزیکیان هەڵدەمژی. هەروەك لە پەیامەکانیدا و لە جێبەجێکردنی ئەم پەیامانەشیدا هیچ جۆرە پێکدادانێك لەنێوان مرۆڤ لە لایەك و شتان

و ڕووداوەکانی گەردوون لە لایەکی تر نەدەبینرا، بەهەمان جۆر لایەنە جەستەیی و ڕۆحییەکانی مرۆڤ فەرامۆش نەدەکران و لەکارنەدەخران.

ئەو لە منداڵەکانی فەلسەفە و کلتوورە جۆراوجۆرەکانەوە کۆمەڵگایەکی هێندە پتەو و خاوەن ڕێسای بنیاتنا کە هاوشانی ئەوەی فریشتەکان بوو و، لە نێوەندی ئەم حەشاماتە سەیروسەمەرانەدا کە کراوەبوون بەڕووی هەموو جۆرە زیادەڕەوی و پەرگیرییەکدا و دەگونجا ببن بە هەر شتێك، هەم لووتی زیادەڕەوی دەشکێنێت و هەم کەمرەویش دەهێنێتە ڕیزەوە. بەجۆرێك کاتێك دەڵێت دونیا، ئاماژە بۆ عوقبا دەکات و، کاتێك جەستە نیشان دەدات، ڕۆحمان بیردەخاتەوە و، هەموو شتێکی لە جێگای خۆیدا بەکاردەهێنا و هەڵیدەسەنگاند.

پەیامەکانی ئەو هەر لە بیروباوەڕەوە هەتا عیبادەت، لە هەڵسوکەوت و کردەوەوە بۆ -بێگومان لە چوارچێوەی بنچینە بنەڕەتییەکاندا- ئابووری و، ئیداری و، یاسا و، پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و، یاساکانی جەنگ و ئاشتی و، بنەماکانی پەروەردە و فێرکردن و، بناغەکانی تەزکیەکردنی نەفس و پاکژکردنی ڕۆحی دەگرتەوە. ئەو، هەروەك ئەم بناغانەی کە پەیوەندیی بەم هەموو بابەتانەوە هەبوو بە شێوازێك دەردەبڕی کە زۆرینەی خەڵك تێبیگەن، بەهەمان جۆر نیشانی دەدا کە دەگونجێت هەموو ئەمانە بەوپەڕی ئاسانی جێبەجێبکرێن و، وێنەی ڕابەرێکی نمونەیی دەکێشا.

لەدوای خۆیشی، دەیان دەوڵەت دروستبوون کە بەتوندی دەستیان بەم بناغانەوە گرتبوو.. سەدان نەتەوەی جۆراوجۆر بەڕێوەبران.. ملیۆنان

ڕۆحی ڕووناك و، مێشکی بیرکەرەوە و، مەردی بواری بزاوتن و، فەقیهی دەراسا و، زانای مەزن کە مانگ و خۆری ئاسمانی مرۆڤایەتین پێگەیشتن، ئەمەش سەرەڕای قین و، نەفرەت و، ڕق و، دەستدرێژی و بیری کاولکاریی سەنگەری بەرامبەر.. بەڵێ، لەو ساتەوە کە ئەو بە پێغەمبەرایەتی شەرەفمەندبوو، هەر لە دوژمنە هەرە نزیکەکانەوە هەتا بازنەی دوژمنە هەرە دوورەکان خۆی لەهەمبەر سەنگەرێکی فراوان و دامەزراوی قین و نەفرەت و دوژمنایەتیدا دیتەوە. بەڵام نە لەرزەی پێکەوت و، نە دووچاری نائومێدی بوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت، لە لایەك ئەرکی فێرکردن و گەیاندنی بانگەوازەکەی بەجێدەهێنا و هەوڵی دامەزراندی کۆمەڵگایەکی عەمەلی دەدا و، لە لایەکی دیکەشەوە دەیزانی چۆن بەپێوە بوەستێت بەرامبەر بەو هەموو حەشاماتە بێ ئیمان و دڵ پڕلەقینەی کە هەرچەندە لەیەکتر جیاوازن بەڵام یەك سەنگەری هاوبەشی دوژمنایەتی کۆیکردوونەتەوە. هەروەك گرفتاری هیچ جۆرە ترس و، سام و، شڵەژان و، شپرزەیی و دوودڵییەك نەبوو، بەهەمان جۆر هەرگیز دووچاری حاڵەتەکانی وەك نووسین و کوژاندنەوە و، بەهەڵەداچوون و ڕاستکردنەوە و، دەست بردن بۆ ئامرازە نامەشروعەکان و هەلپەرستی نەبوو.

کاتێك سەرلەنوێ ڕاڤەی گەردوونی بۆ هەموو جیهانیان دەکرد و، کاتێك هاوڕێ لەگەڵ دەنگ و ئاوازێکی نوێدا -ڕۆحمان فیدای ئەو دەنگە بێت- بۆچوونەکانی لەمەڕ چەندەها سیستەمی دینی و نادینی بەیان دەکرد و، ڕەخنەی ئاڕاستەی بابەتە جددییەکانی وەك ئابووری و، سیاسی و، سەربازی و، کلتووری دەکرد و، کاتێکیش جاروبار نەشتەری

لەم بابەتانە دەدا، هەرگیز -تەنانەت بۆ تەنها ساتێکیش- ترس و ئەندێشەی ئەوە داینەگرت کە چ جۆرە بەرهەڵستییەکی ڕووبەڕوو دەبێتەوە. هەرگیز لەرزینی پێنەکەوت و، تووشی دوودڵی نەهات و، ئەوانەی دوای خۆیشی دووچاری دوودڵی نەکرد. هەمیشە قنج لە پشتی پەیامەکانی خۆیەوە وەستا.. زانی چۆن ببێت بە سەرچاوەی دڵنیایی و متمانە بۆ هەموو کەسێك. لە پەیمان و، مژدە و هەڕەشە دونیایی و ئاخیرەتییەکاندا هەردەم بەیەقینەوە دوا و، "چاوەڕوانیی چالاك"ی دا بەگوێی ئەوانەدا کە کەموکوڕییان لە ئارامگرتندا هەبوو لەسەر ئەو ئەنجام و پاشەڕۆژەی کە بە چاو دوور دیاربوو و، قارەمانگەلێکی لەبواری ئارامگرتندا پێگەیاند کە سەبر بووبوو بە بەشێك لە سروشتیان. بەم جۆرە سەرجەم ئەو ڕۆحە ئیفلیج و، سروشتە پەلەکار و، ئیرادە لەرزۆکانەی کە داخڵی هەرێمی ئەوبووبوون، هەریەکەیانی گۆڕی بە پاڵەوانێکی بواری هەوڵ و کۆشش و خەبات.

ئەو، نە لە سەردەمی ڕێنموونیی مەککەدا و نە لەو کاتەیشدا کە بەرەی دوژمن دەستیان بە فشار و، کوشتن و، بڕین و تۆقاندن کرد، هەرگیز لەبەرامبەر هەڕەشەکاندا چۆکی نەدا و، هەرگیز بەدوای ڕێگاکانی هەڵکردن لەگەڵیاندا نەگەڕا. کاتێك بە تەنها خۆی سەرلەبەری میراتی کۆن و، ڕێسا بۆگەنەکەی جاران و بەها درۆیینەکانی لە ڕەگەوە هەژاند و، تەختی زەوی کردن، بەرهەڵستییەکی ترسناکی لەڕوودا نوێنرا و، بە چەندەها شێوەی جۆراوجۆر هەڕەشەی لێکرا. هەروەك هەموو ئەوانە نەیانتوانی لە ڕێگاکەی پەشیمانی بکەنەوە، کاتێکیش بەنێو دەستەیەك بکوژی خوێناویدا کە دڵیان مۆری گومڕایی لێدرابوو تێپەڕی و، بەرەو

مەدینە بەرێکەوت، لە ئەشکەوتی "سەور"دا لە لایەن دوژمنەکانیەوە دەورەدرا و، چەندین جار لەو ڕێگا دوورودرێژەدا ڕێی پێگیرا و، لە "بەدر"دا ناچار بە جەنگ کرا و، لە "ئوحود"دا ڕووبەڕووی ئەوانە بووەوە کە بۆ خواردنەوەی خوێن هاتبوون و، لە "خەندەق"دا دووچاری ئابلووقەی بەسۆ کرا و، کاتێکیش لە "حونەین"دا سنگی خۆی دەخستە بەر تیری تیرهاوێژە سەرسەختەکان.. بەڵێ، لە سەرجەم ئەم حاڵەتانەدا هەمیشە مەردانە و لە دڵەوە ڕەفتاری کرد و، بوو بە نمونەی نەلەرزیو بۆ لەرزیوەکان و، بە ئیرادە سەرسووڕهێنەرەکەی باڵی بە سەرجەم ئیرادە لاوازەکان گرت.. ڕەشەبای ژێرکەوتنی گۆڕی بە شەماڵی سەرکەوتن و، لووتی هەموو ئەگەرە کوشندەکانی شکاند و، لاواندنەوەکانی دۆڕانی -کە لێرە و لەوێ لەشێوەی نرکە و ناڵەدا دەبیستران- گۆڕی بە سروودەکانی سەرکەوتن.

ئەو تابلۆیی ئازابوو، بەئەندازەی ئازاییەکەیشی وریایانە و هۆشیارانە مامەڵەی دەکرد. جاری وابوو ژیانی خۆی بەسووك سەیردەکرد و، جاری وایش هەبوو بەو ڕێوشوێن و ئامرازانەی دەیگرتنەبەر هەموانی سەرسام دەکرد. گرنگیی بە مردن نەدەدا، بگرە هەمیشە لە چاوەڕوانیدا بوو بەرامبەری. لەڕاستیدا "ژیان" لە جیهانبینیی ئەودا وەك بابەتێکی پاشکۆ و یەدەکێك بۆ خزمەتکردن تەماشادەکرا. ئەگەر تەمەن "بەرزڕاگرتنی وشەی خوا" و خزمەتکردنی حەقی تێدابێت شایانی ژیانە، ئەگەرنا هەرگیز نەدەگونجا بوترێت کە ژیان مانایەکی جددی هەیە. بەگوێرەی ئەو ژیانی ئێرە، پردێك بوو بۆ گەیشتن بە جیهانە هەمیشەییەکان و، دەبوو وەك گوزەرگایەکی قازانج کەڵکی لێوەربگیرێت و، بە سەلامەتی لێوەی تێپەڕببین.

بەڵێ، ئەو ژیانی لەسایەی ئەم تێبینییانەدا بەسەربرد و، هەمیشە هاوڕێ لەگەڵ هەستی ژیاندن و ژیاندنەوەدا هەستاوە و دانیشتووە و، تیشکی خۆشی و شادی کەسانی تر بۆ ئەو بەس بوون و، هەرچی دەستکەوتبێت بەخشیویەتیەوە و خەڵکانی تری دڵخۆش کردووە و، خۆیشی بە ژیانێکی سادە و ساکار قەناعەتی کردووە و، شتی سادەی خواردووە و، شتی سادەی خواردووەتەوە و، شتی سادەی پۆشیوە و، هەموو هەڵسوکەتەکانی بە ئاڕاستەیەکدابوون کە هەژاری و، لاوازی و پێویستیی ئەویان دەرخستووە و، هیچ یەکێك لەم خەسڵەتانەشی لە هیچ بەشێکی ژیانیدا نەگۆڕیوە. بەلای ئەوەوە ژیاندن زۆر لە خودی ژیان بەتامترە و، دەرخواردان زۆر لە خواردن چێژبەخشترە و، دڵخۆشکردنیش زۆر لە دڵخۆشبوون بەلەزەتتر و جیاوازترە. لەبەرئەوە، ئەو هەرشتێکی چنگدەکەوت، خێرا بەسەر موحتاجاندا دابەشی دەکرد و، کاتێکیش نەیبوو بە بەڵێن و پەیمانەکانی دڵی خۆش دەکردن.. بێگومان دەستی بۆ هەموو کەوتوویەك درێژدەکرد.. قەرزی قەرزارانی دەدایەوە.. هەمیشە دەیبەخشی و، ژەنگاویترین دڵەکانی خاوێن دەکردەوە و، بە پەیامەکەی هەریەك لەم قەفەسە تەسك و تاریکانەی گۆڕی بە "ماڵی هودا".

ئەم ناوازەیەی کات و شوێن (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، ژیانی خۆی بەپیت و بەرەکەتدارتر کرد لە ژیانی ملیۆنان کەسی تر، بەجۆرێك کاتێك بەرەو لای خوا گەڕایەوە قەڵغانە پیرۆزەکەی لە بەرامبەر سێ چوار قڕوشی نەفەقەی خێزانەکەی لای دونیاییەك ڕەهن بوو.

بەکورتی ئەگەر مرۆڤ بە ئینسافەوە تەماشای ئەو بکات و، بە بەسیرەتیش لێی بڕوانێت، لە ئیمان و، مەعریفەت و، سەبر و، حیلم و،

وەفا و، زوهد و، بوێری و، جوامێری و، ڕاستڕەوی و، خۆبەکەمزانی و، شان و شکۆ و، هەستان و دانیشتن و، ئاسۆی کەسی و، خێزانی و، کۆمەڵایەتی و، ئیداری و، ئابووری و، سەربازی و، پەروەردەیی ئەودا، وا هەست دەکات کە ڕووبەڕووی بوونەوەرێکی بەرزتر لە مرۆڤ بووەتەوە.

ئەمەش تابلێی ئاساییە، چونکە:

١. میراتگری تەواوی نێرراو و پێغەمبەرانی پێشین بوو. خوا پەیمانی لە سەرجەم پێغەمبەرانی پێش ئەو وەرگرتبوو کە دەبێت ئەو قبوولبکەن. بێگومان ئەم وەرگرتنی پەیمانەش زیاتر بەناوی ئوممەتەکانیانەوە بووە.

٢. بانگەوازەکەی وەکو پێغەمبەرانی دیکە بۆ نەتەوە و شوێنێکی دیاریکراو نەبوو، بەڵکو جیهانی و هەتاهەتایی بوو. لە کتێبەکاندا چەندین شایەتی ڕاستگۆ هەن لەسەر ئەم لایەنەی.

٣. ئەو بەخششێك و ڕەحمەتێکی بەرجەستەی خوایی بوو بۆ مرۆڤایەتی و کۆتا ڕابەری ئەو بوو. ئایەتەکانی قورئان بەڵگەبوون لەسەر ئەمە و، تەمەنی پیرۆزیشی بورهانێکی ڕوون و ئاشکرایە.

٤. ئەم ڕەحمەتە بەرجەستەیە (صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وەك قەڵغانێکی پارێزەر وابوو بۆ ئوممەتەکەی. ئەوانەی دوای خۆیشی وەك شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانی پێشین دووچاری لەناوچوونی بەکۆمەڵ نابنەوە.

٥. ئەم مرۆڤە ناوازە و بەشان و شکۆیە، لەناو پێغەمبەراندا خاوەنی تایبەتمەندی و جیاوازییەکی وابوو کە خوای گەورە سوێندی بە ناوی

ئەو خواردووە و، بە (لَعَمْرُكَ) پشتیوانیی خۆی بۆ دەربڕیوە و، تەمەنی ئەو ئاوێنەیەکی بەرزی موڕادی ئیلاهی بوو و، سوێندەکەش هەر بەمە خوراوە.

٦. یەکێك لە لایەنە جیاوازەکانی ئەو بریتییە لەوەی لەکاتێکدا خوای گەورە بە ناوی خۆیانەوە بانگی پێغەمبەرانی دیکەی کردووە، بەڵام ئەم پێغەمبەرە ئازیزە هەمیشە هاوڕێ لەگەڵ ناونیشانی پێغەمبەرایەتی و ڕیسالەتدا ناوی هێناوە. ئەمەش پەند و وانەی ئەدەبە بۆ ئیمانداران.

٧. پێشتر زۆرمان وت دەربارەی توانا ناوازەکەی لە بواری دەربڕین و گوتاردا و ناونیشانی (جوامع الكلم)ی تایبەت بە ئەو..

٨. ترس و لەرز خستنە دڵی دوژمنەکانیەوە لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا، ئاوڕلێدانەوەیەکی تایبەتی خوای گەورەبوو بۆ پێگەی گرنگی ئەو.

٩. هەروەك ئەو هۆکاری کرانەوەی دەرگای تەوبەیە بۆ گوناهەکانی ئوممەتەکەی بەهەمیشەیی، تاکە کەسیشە کە ڕێگاکانی تاوان ناتوانن توخنی بکەون.

١٠. ئەو کتێبەی هێناویەتی لەڕێگەی هەندێك هەلومەرجی تایبەتەوە خرابووە ژێر پارێزگاری و، هەتا قیامەت دووچاری ئەو دەستکاری و، شێواندن و چەواشەکارییە نەدەبوو کە کتێبەکانی پێشوو تووشی هاتوون.

١١. جگەلەوە، ئەو هەر لە دونیادا بە شەرەفی تەماشاکردنی هەموو قووڵاییەکانی جیهانەکانی غەیب شەرەفمەندکراوە و، ڕۆیشتنی بۆ میعراج کەرامەتی قووڵیی بەندایەتییەکەیەتی و، توانا و لێهاتنەکانی

لەو گەشتەیدا و، میوەکانی ڕیسالەتەکەی دیاری دەستی ئەوبوون لە گەڕانەوەیدا.

لەپاڵ هەموو ئەم تایبەتمەندییانەدا کە دڵۆپێکن لە دەریایەك، ئەوەندە پایەی بەرزی وەك موعجیزەی قورئان و کارە دەراسا گەردوونییەکانی پێبەخشراوە کە، وا هەستدەکەم تەنها ژماردنیان چەندەها کتێبی دەوێت.. لەڕاستیدا هەموو لایەنە قووڵەکانی ئەو لە فراوانی دیوی مەلەکووتیی ئەوەوە سەرچاوەیان گرتبوو، بەجۆرێك لەم ڕووەوە دارای ماهییەتێکە کە لەسەرووی گشت پێناسە و وەسفکردنێکەوەیە.. بەڵێ، ماهییەتی ئەو لە هی فریشتەکانیش بەرزترە و، دەستنیشانکردنیشی بە پێغەمبەر یەکەم و سەرەتای بوونە. ئەوەی کە بوونی ئەو یەکەم تۆو و نوورە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، خامەی پیرۆز لەگەڵ ئەودا یەکەم جوڵەی کرد و، نەخشەی مرۆیی لەگەڵ ئەودا هاتەدی و، ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا لە زنجیرەی پێغەمبەرایەتیدا. هەرئەوە یەکەم ئاوێنەی مەزنی ورشەداری خوای گەورە. ئەوە ڕوونترین و بێگەردترین تیشکۆی دەرکەوتنی سیفەتە خواییەکان. هەر ئەوە تەرجومانی گۆیای خوای گەورە بە کردار و گوفتار. ئەوە ڕەحمەتی بەرجەستەی خوا لە جیهاندا و هێمای تەواوکاریی لوتف و نیعمەتەکانیەتی لەسەرمان.

لەگەڵ ئەودا نهێنییەکانی خوایەتی بەوپەڕی ڕوونی دەرکەوتن و، جیهانەکان ڕووناکبوونەوە و، تۆز و غوبارە ڕواڵەتییەکانی سەر ڕوخساری بوونەوەران سڕانەوە و، حەقیقەتەکانی ئەودیوی گەردوون ئاشکرابوون و، هەرشتێك بە کورت و پوختی بە حەزرەتی ئادەم وترابێت، لەودا گەیشتووە بە وردەکاری و ڕوونبوونەوە.

بەڵێ، تاکە هۆکارێك کە بێ چەواشەکاریی ئێمە بگەیەنێت بە خوا ئەوە و، کلیلی گەنجینەی نهێنییە خواییەکان بەوە و، نهێنیی سەرەتا و ئەنجامی بوون سپاردەی ئەو کراوە.

ئەم زاتە بێوێنەیە قیبلەنومایەکە و خوای گەورە گوێڕایەڵیکردنی ئەوی وەك گوێڕایەڵیکردن بۆ خۆی ئەژمارکردووە و، بەو نوورەی ئەو پرژاندی گەردوون حاڵەتی کتێبێك و کۆشکێك و پێشانگایەکی وەرگرت و، ئەو نەزانراوە تاریك و مەزنە بەجارێ ڕۆشن بوویەوە. لەسایەی ئەودا تاریکییەکان بوون بە ڕووناکی و، لە ئاسۆی نوورەفشانی ئەودا بۆ دواین جار ئەرز و ئاسمان بەیەکگەیشتن.

ئەو.. پەیامەکەی قورئانە و، ئاسۆکەی عیرفانە و، گوفتارەکەی بورهانە و، هۆکاری بەختەوەریی هەردوو جیهانە. ئەو زاتەی کە خوای گەورە بە هەزاران نیشانەی دەراسا لوتفی لێناوە ئەوە و، هەر ئەویشە کە ناوی پیرۆزی -بە شایەتی و تەزکییەی قورئان- هەتا قیامەت وەك یادێکی جوان دەمێنێتەوە. ئەوە مایەی شانازی مرۆڤایەتی و، چەقی حەقیقەتی پێغەمبەرایەتی. سەرۆکی سوپای پێغەمبەران و ڕابەری فریونەخۆری ئینس و جان. گوفتاری ئەو (فوزولی) گوتەنی " میرلیوای لەشکری ئەنبیایە ئەو." کتێبەکەی ئەو گەورەترین بەخششە لە لایەن خواوە. گەر ئەو جێگای تەجەللی "الروح الاعظم" بێت -کە هیچ گومانێك لەوەدا نییە- کەواتە پەیامەکەی ناوی حەیاتی ڕۆحەکانمانە. بەهۆی ئەوەوە مرۆڤایەتی چاوی بە بەها مرۆییە ڕاستەقینەکان کراوەتەوە و لەگەڵ ئەودا ئەو ڕەنگەی گرتووە کە خوا دەیەوێت. دووربوون لە ئەو، حەسرەت و هیجرانە و، دابڕانیش لەو، گومڕایی و سەرشۆڕییەکی ڕوونە.

بەڵێ، چەقی ناوە پیرۆزەکان و سیفەتە خواییەکان ئەوە و، ئەستێرەی باکووری ئاسمانی پێغەمبەرایەتیش هەر ئەوە. یەکەم دەرکەوتن و ئیجمالی حەقیقەت لەگەڵ ئەودا گەشەی سەندووە و، کۆتا عینایەتی خوایی بەرجەستە بە ئەو گوزارشتی لێکراوە و، کلیلی ئەو شەفاعەتەش کە لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو دەرگاکان دەکاتەوە دراوەتە دەستی ئەو.

ئەو ئەرکەی خوا لەسەر شانی ئەوی داناوە لە هی هەموو پێغەمبەران جیاوازترە و، ڕووتێکردنەکانی خوا بۆ ئەو ڕەنگی ستایش و ڕێزلێنانی پێوەیە. خواوەندەکەی کاتێك لەگەڵ ئەو دەدوێت شێوازێکی تایبەت بەکاردەهێنێت و، بەم شێوازەی ڕێز لە ئەو دەنێت و، ئەدەبیش فێری ئێمە دەکات. خوای گەورە دەربارەی ئەو دەفەرموێت:

﴿ نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ۝١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ۝٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ۝٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴾ (القلم: ١-٤)

"نون. سوێند بە پێنووس و ئەوەی کە دەینوسن. تۆ بەهۆی ناز و نیعمەتی پەروەردگارتەوە دووریت لە شێتی یەوە. بێگومان پاداشتێکی نەبڕاوە بۆ تۆ ئامادەیە. بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت."

هەربۆیە ئەو قسەبۆکراوی تاقانەی ئاسۆی ستایش و ئاوڕلێدانەوەیە. مرەکەبی ئەو قەڵەمەیە کە بوونی نووسیوە و، ڕۆح و مانا و ناوەرۆکی دێڕەکانی بوونەوەرانە و، ڕەوانترین وەرگێڕە بۆ دەرخستنی نهێنییە خواییەکان و، گەنجینەی مەعریفەتی حەقیقەتە لاهوتییەکانە. ئەو ناوازەترین سیمای پایەی مەزنی ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ﴾[١] "بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من

١. سورەتی آل عمران: ٣١.

بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت."و، ڕووناکترین چەقی درەوشانەوەی ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ﴾[1] "بێگومان ئەوانەی پەیمان دەدەنە تۆ لەڕاستیدا هەر پەیمان بەخوا دەدەن." بەگوێرەی ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾[2] "لە ئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندە ناز و نیعمەتت پێدەبەخشێت کە زۆر پێی ڕازی و خۆشنوود دەبیت." یش مرۆڤی لوتکەیە لە پلەی ڕەزای خوادا و، نوێنەری نوورانیی ڕەزامەندیی ئەوە و، پێشەوا و ڕووناکیی ڕێبوارانی سەر ڕێیە. بەپێی ناوەرۆکی حەقیقەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٧)

"ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت
کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان."

ئەو کلیلی نهێنیی ئەم دونیا و ئەو دونیایە کە یەکەمیان بە مەعریفەت و ئیمان و، دووهەمیشیان بە بەهەشت و جوانیی خوا ڕازاونەتەوە و، لە حوکمی دەرگای ئەواندایە و، هۆکاری ڕووناکی سەرجەم مەزهەرییەتەکانی پشت ئەو دەرگایەیە و، تەفسیرکاری ئەو حەقیقەتە ئاڵۆزانەیە کە بە سروشت قابیلی تێگەیشتن نین و، موفتی تایبەتی جیهانی زات و، خۆرهەڵاتی ڕووناکی ئاسۆی سیفەتەکانە و، پێشەوای فریونەدەری ئەوانەیە کە شوێن خۆی خستوون و، ئیمامێکی قیبلەنوما ئاسایە بۆ ئەهلی تەوحید و، کانگای نوورێکی خواییە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو تەم و دووکەڵەی کە جیهانی هەستەکانی داپۆشیوە و، دۆستی

١. سورەتی الفتح: ١٠.
٢. سورەتی الضحی: ٥.

وەفادار و گیانی بەگیانی ئەوانەیە کە دڵیان بە خوا داوە و، دوژمنی ئەزەلیی شەیتان و سیفەتە شەیتانییەکانە و، لە دونیا و قیامەتدا قەڵغانی پارێزەری ئەوانەیە کە پشتیان پێبەستووە و شەفاعەتکاری تاوانبارانە.

ئەو بەرپرسیارێتییە قورسانەی دونیا کە وەخت بوو مرۆڤ نەتوانێت لەژێریان هەستێت، بەهۆی ئەوەوە ئەم باری شانە سووك بوو و، لەسایەی ئەودا خوا لە هەڵنووتین و، لەبیرچوون و هەڵەی ئوممەت خۆشبوو. لێخۆشبوون و سزا لە هەرێمی ئەودا ڕەنگیان گۆڕا و ئومێدی ڕزگاربوون و لێخۆشبوون لە هەموو سینەیەکدا چەکەرەی کرد.

ئەوبوو کە لە لایەن خواوە دەعوەتی تایبەتی کرا بۆ ئاسمان و، هەر ئەویش بوو کە گەیشت بەو "قاب قوسین"ەی کە هەموو کەسێك چاوی لێبڕیبوو. بوون بە میوانی "سدرة المنتهى" بەخششێك بوو و تەنها خەڵاتی ئەو کرابوو. بەگوێرەی ناوەرۆکی ﴿ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴾[1] "جا بینینی ئەو بەدیهێنراوانە لەو شەوەدا وەنەبێت چاوبەست لەپێغەمبەر کرابێت و چاوی لێ لادا بێت."ش ئەوبوو کە دامەزراوییەکی تایبەتی پێبەخشرا بۆ ئەوەی لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە دەیانبینێت سەری گێژنەخوات و ڕوانینەکانیشی تەڵخ نەبن. ئەو، تەماشای دەرکەوتنی "الآية الكبرى"ی -بە خەسڵەتە تایبەتەکانی خۆیەوە- کرد. بەڵام هەرگیز چاوەکانی بەر شەوارە نەکەوت و، لە لایەن دانیشتوانی ئاسمانەکانەوە بە پەنجە ئاماژەی بۆ کرا. جیبریل بۆ یەکەم جار لە گەشتێکی ئاسمانیدا کە عەقڵ پەی پێنابات، بوو بە هاوڕێ و خزمەتکاری ئادەمیزادێك... لەم گەشتەدا بە خێراییەك کە هی هەورەبروسکە تێدەپەڕێنێت جیهانەکانی فیزیك دەبڕێت و، دەپەڕێتەوە بۆ

١. سورەتی النجم: ١٧.

جیهانەکانی ئەودیو مادده و شتە نەبینراوەکان دەبینێت. "سدرة المنتهی" یەکەم قۆناغە و، "قاب قوسین أو أدنی"ش لوتکەیەکە عەقڵ دەستەوسانە لە ئاستیدا و، ڕووبەڕووبوونەوە و بینینی خوای گەورەش مەزهەرییەتێکە کە توانای تێگەیشتنی ئێمە کۆڵەوارە لە ئاستیدا.. پاڵەوانی هەموو ئەمانەش ئەو کەسەبوو کە "شێخ غالیب" گوتەنی "ئەوە سوڵتانی ڕەسول شاهی ئەمجەد، بۆ بێچارەکان دەوڵەتی سەرمەد، لە دیوانی خوادا سەرنامەد، ئەحمەد و مەحمود و موحەممەد." ئەو بینی، پاشان بۆ ئەوەی ئێمەش ئەو شتانە ببینین، گەڕایەوە بۆ ناومان. بیستی، پاشان هاتەوە و ئەوەی بیستبووی گەیاندی بە گوێی ڕۆحمان.. وە نهێنییەکانی یەکەمین (الأول) و، دواین (الآخر) و، دەرەوە(الظاهر) و، ناوەوە(الباطن) ی چپاند بە دڵی ویژدانماندا. گرنگترین هێمای یەکەمین (الأول) ئەوە و، ئاوێنەی نوورەفشانی دواین (الآخر) ئەوە و، بانگەوازکاری بڵندئاوازی ئەحەدییەتی زات و واحیدییەتی سیفات ئەوە و، مرۆڤی کامڵی ڕاستەقینە و، ئەمینترین سپاردەپارێزی زانستەکانی زات و سیفەت و ناوە پیرۆزەکان ئەوە... ئەو هەر لە یەکەم دەستنیشانکردنەوە (التعین الأول) بە ناونیشانی "ئەحمەد" کۆچەر و گەشتیارە لە ئاسۆی مرۆڤایەتیدا و، بەناوی "موحەممەد"ەوە میوانی شاری مەدینەیە لە مەککەوە و، لە بەرزەخیشدا بەناوی "مەحمود"ەوە میوانداری لیوای سوپاسگوزاران (لواء الحمد)ە و، بە هەموو ناوە پیرۆزەکانی تری پەردەی سەر بەهەشت و جوانیی خوایەتی(جمال الله) لادەدات و، سەرچاوەی فەیزی جیهانە ڕۆحانییەکان و، گەوهەری ئەسڵیی جیهانی جیسمانییەتیشە.

ئەی پوختە و تۆوی وجود و، میوەی درەختی بەدیهاتووان و، بەگوڕترین دەنگی حەقیقەتی تەوحید! ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئێمە و سەرتاپای گەردوون چ مانایەکمان دەبوو! ئێمە لەسایەی تۆدا توانیمان خۆمان بخوێنینەوە و، بەگوێرەی پێگەکەمان هەڵوێستێکی ڕاست و دروستمان وەرگرت. شتان و ڕووداوە نادیارەکان بە هاتنی تۆ ڕووناك بوونەوە. بە هاتنت ڕەنگی هەموو شتێك گۆڕا و هەموو تەنێك بوو بە زمانێکی ڕەوان لەسەر ئەودیو پەردەی بوون. سایەی تۆ نەکەوتە سەر زەوی، بەڵام لە سایەی تۆدا لە کەوتن و بەدبەختیی هەمیشەیی ڕزگارمانبوو. ئەرکی کردنەوەی مەتەڵی گەردوون و شیتەڵکردنی لە ئەزەلەوە بەخشرابوو بە تۆ. ئەوانەی پێش تۆ هاتوون، بەدرێژایی تەمەنیان تەنها حونجەی پوختەیەکی ئەم مەتەڵەیان کردووە. تۆبوویت کە ئەو مەتەڵەت شیکردەوە و پوختەکەشت بەدووردرێژی ڕوونکردەوە. کلیلی هەردوو جیهان بە دەستنیشانکردنی یەکەم جار (التقدیر الأول) و ڕادەستکردنی دواین جار (التسلیم الآخر) دراوە بە تۆ، تۆیت کە دەرگای دونیات کردووەتەوە و، هەر تۆیت کە ڕێگای عوقبات نیشان داوە. بە پەیامەکانت بوویت بە وتاربێژی حەقیقەتی تەوحید و، ڕزگارکەری ئینس و جینن.

پێش ئەوەی بە تەشریفت دونیا ڕۆشن بکەیتەوە، سەدان و هەزاران سیمای نوورانی دەعوای تەوحیدیان هێنایە سەر زار، بەڵام هیچ کەسێك نەگەیشت بەو داودییەتەی[1] تۆ. ئەوان پابەندی سنووری توانا و لێهاتنەکانی خۆیان بوون و، نەیاندەتوانی لێی دەربچن و، بگەن بە ئاسۆی تۆ. لەپێناو فەرمانبەرییەکەیاندا زۆر ماندووبوون، زۆر سەختی

١. حەزرەتی داود بە دەنگی خۆش ناوی دەرکردبوو.

و گیروگرفتیان تێپەڕاند.. یەکێك ڕێی لێگیرا و، یەکێکی دی سەری بڕرا.. هەندێك هەر لە سەرەتای ڕێگادا گەڕانەوە بۆ لای خوا، هەندێکی تر لە نیوەی ڕێ.. دەستەیەك ڕووبەڕووی ڕەقترین بەرهەڵستییەکان بوونەوە و، دەستەیەکی دی ڕوویان لە هەر جێگایەك بکردایە بەردباران دەکران.. هەموو کاتێك هاوڕێ لەگەڵ عەشق و شەوقدا ژیان و، هەمیشە لەژێر ئەرکی سەختیاندا دەمردن و زیندوودەبوونەوە. زۆرێك لەمانە ئەوەی دەیانویست دەستیان کەوت و بەهۆیانەوە سەدان و هەزاران ڕزگاریان بوو. بەڵام لەنێو هەموو ئەمانەدا تەنها تۆ بوویت کە دەنگی خۆت گەیاند بە کیشوەرە جۆراوجۆرەکان و دامەزراوانە و دوور لە هەژان بەپێوە وەستایت. جگە لە سێ چوار سەرگەردان، ئەوانەی شوێن خۆتت خستن کەسیان سەری لێنەشێوا و لە ڕێگا جێنەما. ئەو کارانەی پێویست بوو بکرێن گەلێك زۆربوون، بەڵام شوێنکەوتووانی تۆ تابڵێی چاپوك و ئازابوون و، هەموویان بێ وچان ڕادەپەڕین و، کەسیان ماندوو نەبوو و لە نیوەی ڕێ بەجێنەما.

تۆ شایانی ئەوان و ئەوانیش شایانی تۆ بوون. ئەوانت خۆشدەویست و ئەوانیش تۆیان خۆشدەویست. وەك بڵێی دەستی قودرەت ئەوانی بۆ هاوەڵێتی تۆ ئامادە کردبوو -خوای گەورە چێژی ئەو هاودەمی و پێکەوەبوونە بگەیەنێت بە دڵی ئێمەش- و، هاوڕێیەتی تۆیان لێدەهات و شایانی بوون. لەو ڕۆژانەدا کە خۆت بۆ "شەوی عەروس"[١] و کۆچی ماڵئاوایی ئامادەکردبوو، تەماشای سیما دەرخشانەکانی ئەوانت کرد

---

١. شەوی عەروس: یەکێکە لە هێما و دەستەواژەکانی تەریقەتە سۆفییەکان بەتایبەت تەریقەتی مەولەوی و، نیشانەی خۆشحاڵیی بەندەیە بە گەڕانەوە بۆ لای بەدیهێنەری خۆی، جەشنی خۆشحاڵیی شەوی هاوسەرگیری.

و گریایت.. میعراج پێش تۆ بەنسیبی هیچ پیرۆزێکی تر نەبووبوو. بەودیو پەردەی بووندا گەڕایت و هەتا "ئاسۆی بینین" بەرزبوویتەوە، بەڵام لەناو ئەو جوانییە سەرسووڕهێنەرانەدا کە چاوەکانی بەر شەوارە دەخست، تۆ بیرت لە هاوەڵەکانت و ئەوانەی دوای ئەوان کردەوە. لە دڵتدا هەمیشە حەز و ئارەزووی پیشاندانی ئەو شتانەی بینیوتن و بانگکردن بۆ ئەو شتانەی بیستووتن، تاوی سەندبوو. ڕۆیشتنەکەت و، گەڕانەوەکەت و، بەجێهێشتنی ئەو دەرگایەش بەکراوەیی لەدوای هاتنت، هەمووی جوان و دەراسابوو. وەك خۆت ڕۆیشتیت، وەك خۆت گەڕایتەوە، لەم گەشتە ئاسمانییەدا کە بە تاکە گەشتی مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێت، لوتفەکانی خواوەندی ئەزەلی بە هەناسەکانی تۆوە بەستران و، دانیشتووانی ئاسمانەکان و زەوی سڵاویان لێکردیت و، چاوەڕێی شتانی چاوەڕواننەکراویان لێدەکردیت. هەموو لایەك بریسکەی نووری لێدەهات و، ڕووناکی بە گشت لایەکدا پەخشدەبوو، تەنانەت بەجۆرێك کە گشت سەردەم و چاخەکانی لەباوەش دەگرت. ئێمە هەمیشە ئەو هیوایەمان لە سینەماندا پاراستووە کە چەند دڵۆپێك لەو دەریای نوورە بکەوێتە سەر سنگی ئەم ڕۆژگارە شەوەزەنگەی ئێمەش. تۆ بەوەفا بوویت، کاتێك لوتف و ئاوڕلێدانەوەت بە گشت لایەکدا دەبەخشییەوە، نەدەکرا عاشقانی ئەم سەردەمەی لێ بێبەش بکەیت، هەروەك نەشتکرد. ئەگەر هەنوکە کەسانێك لەناوماندا مابن کە بەرەو ڕووناکی هەنگاو بنێن، ئەمە تەنها لەسایەی ئەو نوورەیە کە تۆ هێناوتە. ئەگەر هێشتا بە جۆرێك لە جۆرەکان بەردەوام بین لە ژیان، ئەمە تەنها دەرەنجامی ئەو پەیوەندییەیە کە هەمانە بەتۆوە.

ئەی ئەو پێغەمبەرەی کە هەمیشە لە بەرزاییەکاندا دەفڕیت! (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆ ژیانی گیانەکانی ئێمە و، پەیامەکەیشت دەوای دەردە درێژخایەنەکانمانە. چی دەبێت جارێکی دیکەش وەرە و ئێمە بێگیان جێمەهێڵە! بۆ دواین جار قسەبکە، بەندەکانت بە ئازارەوە مەتلێنەوە! ڕێگاکانمان پڕن لە چەتە و، لێوانلێون لە ئاگری فیتنە و، تەم و دووکەڵ ئاسۆمانی تەنیوە. سەرەڕای هەموو شتێك بە سنگەخشێ هەوڵی ڕۆیشتن دەدەین. بە هاودەمیت هێما و نیشانەمان پێببەخشە لەم ڕێگایەماندا و، دڵنیایی و ڕابەرایەتیی خۆت بگەیەنە بە دڵەکانمان. هەتا ئێستا لەم ڕێگایانەدا سەدان هەزار کەس بەنێو درك و داڵدا تێپەڕین و، گوڵیان چنییەوە و، جاروبار ماندووبوون و، جاروباریش لەرزمیان پێکەوت، بەڵام دیسان وەك ئەو لێبڕاوانەی کە لە ڕێگای خودا شەو و ڕۆژیان ناوەتە سەر یەك خەڵات کران. لە سەرەتا و کۆتایی ئەم ڕێگایەدا کە لێوانلێوە لە شتی چاوەڕواننەکراو، تۆ هەیت. ئەگەر هەموو کاتێك چاوەکان نەتوانن بتبینن، هەر تۆیت کە لە دڵماندا بەنازەوە دانیشتوویت. ئەگەر ئێمە هێشتا نیشانەی ژیانمان پێوە مابێت، تەنها کاریگەریی ئەو ئیکسیرەیە کە تۆ دەرخواردی ڕۆحمانت داوە. ئەگەر هێشتا توانای ئەوەمان هەیە کە سینەمان بۆ تۆ بکەینەوە، ئەمە لە ئەفسوونی پەیامەکەی تۆوەیە. ئەگەر تۆ لە تەپۆڵکەکانی دڵەوە بانگ لە ئێمە نەکەیت و، ئێمەش لە ئاسۆی ڕۆحماندا هەست بە هەناسە ژیانبەخشەکانی تۆ نەکەین، وەك گەڵای خەزان وشك دەبین و زەرد هەڵدەگەڕێین و، دەبین بە هۆکاری شنەی غەمگین لە ئاسۆی پیرۆزی تۆدا. ئای چەند ئارەزوومان دەکرد پایزمان بەسەرنەیەت و نەبین بە مایەی خەم و پەژارە بۆ تۆ، بەڵام مەخابن کە مەخابن!..

تۆ بەمەبەستی ژیاندنەوەی دڵە مردووەکان هاتبوویت و بە باڵدانەوەیشت بە سەرچاوەی عینایەت لەم ئەرکەتدا سەرکەوتوو بوویت. لەو جێگایانە بڕوانە کە سەردەمانێك وەکو باخەکانی ئیرەم ژیان تێیدا شنەی دەهات و ئەمێستا تەرمە زیندووەکان بەناویدا گوزەردەکەن و، سیسرکەکان لە ڕقی بولبولەکان دەخوێنن و، گشت سووچ و قوژبنێك بە ئاهەنگی شەمشەکوێرەکان دەناڵێنێت. لە زۆرێك لەو جێگایانەدا کە جاران ناوی تۆ شاباڵی گرتبوو، هەنووکە شەیتانەکان یاری پاشایەتی دەکەن. دونیا لە تۆڕی نەبوونییەکاندا گیری خواردووە و حەسرەتی ڕۆح و مەعنا دەکێشێت. یەك جار دەرکەوتنت بۆ ڕۆحەکان هەموو نەخشە شەیتانییەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و، گیان دەکاتەوە بە بەری ئەوانەدا کە چەندەها سەدەیە دەنگ و نووزەیان لێبڕاوە. ئەمڕۆ چەندین سەرگەردان هەیە کە بە حسابی ڕێگا ملی توولەڕێکانی گرتووەتەبەر و، چەندەهای تریش کە بەتەواوەتی مەحرومن لە ڕێگایەك. لە هەموو لایەکدا ڕەشاباکانی دووڕوویی لوورەیان دێت. زستان و سەهۆڵبەندانی سەخت بەبەردەوامی دەستیان لە بینمان توندکردووە. منداڵەکانی "فاوست" کە لە جاران کاڵفام و گەمژەترن، هەردەم دەدۆڕێن بە "مێفیستۆ" کە لە پیشەوەرەکان پیشەگەرترە و یەك لەدوای یەکیش باجی هەڵەکانیان دەدەن. دەڵێی لە حاڵەتی بەخشینی سەرانەداین، لەو ڕۆژەوەی فامم کردووەتەوە ئێمە وەك هەتیو و بێنەوا لەژێر قاچی خەڵکداین و، هەر لە کەمەند و تەڵەی بیرە خیانەتکارەکاندا قەتیس ماوین. کاتێك تۆ هەیت ئیدی ئێمە چۆن هەتیو دەکەوین و، بڕیار لای تۆ بێت بێخاوەنی یانی چی؟! نەخێر، ئێمە نە هەتیوین و نە بێخاوەن، ئێمە وەك ئەو منداڵانە واین کە لانە

گەرموگوڕەکەی خۆیان جێهێشتووە و خۆیان لە کوچە و کۆڵانەکان هاویشتووە.. پێدەچێت هەتا ئەو کاتەی بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە و، بۆنی گوڵی ڕێحانەی تۆ دەکەین، لێرە و لەوێ بۆنی پیس و ناخۆش هەڵبمژین و، ڕزگارمان نابێت لە ستەمکردن لە خۆمان. لە هەموو سووچێکدا چەتە و ڕێگرەکان دێن و دەچن و، لە گشت لایەکدا هات و هاواری دز و بێخێر و شوومەکان دەبیسترێت. دزەکان قۆڵیان هەڵکرد و هەموو شتێکی ئێمەیان بە تالاّن برد. لەناو شتە دزراوەکاندا دڵی ئێمەیشی تێدایە. لە ئێستادا "عەقڵی مەعاد" دەست و پۆی شکاوە.. ویژدان لە سەرەمەرگدایە و ڕۆحیشمان لە لێواری وڕێنەکردندایە.. زاری پیرۆزت بکەوە، لە هەناسەتەوە بۆنێکی تازە و پاراو بنێرە و، بێدارمان بکەوە بۆ ئەوەی ببین بە خۆمان. فانییەت ناتوانێت ڕێگربێت لە بەردەم هێز و کاریگەریی ڕۆحی تۆدا و، کەسیش ناتوانێت ناوی تۆ لە دڵەکاندا بسڕێتەوە. تۆ بەخششێکی وەهای "ئەزەل"یت کە نرخ و بەهات لەسەر دیارینەکرێت و، تووتی و بولبولی "ئەبەد"یشییت.

دەستی ئێمە و دامەنی تۆ، چۆن لەگەڵ دۆستەکانت دوایت، ئاواش گوێ بەدووری ئێمە مەدە و لەگەڵمان قسەبکە! ئەگەر تۆ تەنها یەك جار دەمی پیرۆزت بکەیتەوە، ئەفسوونی هەموو سیحربازەکانی وتە پووچەڵ دەبێتەوە و ئەوانەی کە بەدرێژایی چەندین سەدە مەحکوم کراون بە زمان گیران -ئەگەر شایانیشی نەبن- گرێی زاریان دەکرێتەوە و، ئای چەند وتار و ستایش بە بالاّی ناوی تۆدا هەڵدەدرێت! بە هەناسەی تۆ -گیانمان قوربانی ئەو هەناسەیە بێت- تا ئێستا چەندین چاخی مردوو زیندووبووەتەوە. چەندەها جار ئیسرافیل چەند هەنگاوێك هاتووەتە

دواوە و گوێی بۆ هەناسەکانی تۆ ڕاگرتووە کە دەنگی "صور"یان لێدێت. چەندین جار بیابانە وشك و برینگەکان بە هەناسەکانی تۆ گۆڕان بە باخچەکانی بەهەشت. نازانم داخۆ وتەی "بۆ دواین جار" بە بێڕێزی حساب دەکەیت؟! ئەگەر ئەمە بێڕێزیش بێت، هێشتا لە تەنیشت نەبوونی تۆ لە دڵەکانماندا، هێندە گرنگ نییە. ئێمە تۆوێکی تاق و تەنها کە چاوەڕوانی سەوزبوونین و، تۆیش ئەو بایەیت کە ئەم ئەرکی چاندنە دەهێنیتەدی. ئێمە کۆمەڵێك تەرمی مردووین و چاوەڕوانی زیندووبوونەوەین، هەناسەکانی تۆیش ئاوی زیندەگییە بۆمان. هەڵبکە لەژوور سەرماندا و، ڕێگای زیندووبوونەوەمان پیشان بدە و، خوڕ خوڕ بڕژێ بەسەرماندا و، هاوڕێ لەگەڵ مژدەی بەهارێکی نوێدا بگرمێنە. سەرمان لەو جێگایەدا کە تۆ پێی لێدەنێیت و، چاومان لەو ڕۆژهەڵاتە بڕیوە کە پێشبینی هەڵهاتنی تۆی لێوە دەکەین و، چاوەڕوانی چاکە و لوتفە سەرسووڕهێنەر و چاوەڕوان نەکراوەکانین.

ئەم دونیایە دونیای تۆیە، وشە و دەنگی کەسانی تر لە دونیای تۆدا چ بایەخێکی هەیە؟! لەو ڕۆژەوەی سێبەری تۆ کەوتووەتە سەر زەوی سولەیمانی پێغەمبەر تەنها ناوی ماوەتەوە. مۆر بەتۆیە و سککە لای تۆ، سەنگەری بەرامبەر پێشەواکەیان ئەسکەندەریش بێت چ سوودێکی هەیە؟! کاتێك دەنگی داودیی تۆ وەك زایەڵەیەك لە هەموو کونجێکی دونیادا دەزرنگێتەوە، چ پێویست بە داود دەکات؟! کاتێك نۆرەی گوتار هی تۆیە، ئایا قسەکردنی کەسانی تر بێڕێزی نییە؟! جگە لە تۆ کەس ناتوانێت ئێمەی لەرزیو و کەوتوو بخاتەوە سەر پێ، پشتی چەماوەی مرۆڤایەتی بە قەمبوورە سەختەکان تەنها بە هیممەتی تۆ ڕاست دەبێتەوە.

تەنانەت کەوتنی سێبەری تۆ لە دووری دوورەوە لەسەر سەری ئێمە، بوو بە فوویەکی "ژیانەوەی پاش مەرگ" بۆ هیواکانمان. لەدایکبوونی ڕاستەقینەی تۆ سەرجەم مۆمە شەیتانییەکان دەکوژێنێتەوە و، ڕۆحە مەحکومکراوەکان بە تاریکیی چاویان بەڕووی کانگایەکی نوورانیدا دەکرێتەوە. خوا ڕووناکییەکی وای بە تۆ بەخشیوە کە جیهانیان ڕۆشن دەکاتەوە. دوگمەی ئەو سەرچاوەی نوورەی کە سەرتاسەری جیهان نوقمی بریسکە و تیشك دەکات لەژێر دەستی تۆدایە. تۆ بخوازیت، خوای گەورەش دەیەوێت، تۆ بفەرموویت، ئێمە هەمووومان بۆ گوێگرتن ڕادەوەستین. بخوازە تا مەشینەتی خوایی بێتە گۆ و، بفەرموو تا گوێیەکان وتەیەکی ڕاست ببیستن.

تۆ لای خوا و لای خەڵکیش لە هەموو جیهانیان بەنرختریت. ئێمە هەمووومان نازی تۆ هەڵدەگرین و تۆیش ئاوی ژیانی ئێمەیت. دەستی حەزرەتی مەسیح جەستە مردووەکانی زیندوودەکردەوە، بەڵام تۆ بەدرێژایی چەندین هەزار ساڵ بوویت بەو ئیسرافیلەی کە فوو دەکات بە بەری دڵ و ڕۆحە مردووەکاندا. ئێستا تەشریف بهێنە و جارێکی دی بەجۆرێك ناوبانگت بە هەموو دونیا بگەیەنە، تا گشت ئاگرەکانی دووڕوویی و، لێکترازان و فیتنە بکوژێنەوە، تا هەموو لایەك ڕەنگی گوندەکەی تۆ بگرێت.

وتەکانم پەرێشانیی من دەردەخەن، بەڵام ئاواتەکانم ئارەزووی هەموانە.. ئێمە هەمیشە تۆمان بە ڕەحمەتی ڕەحمان زانیوە و، خۆیشمان وەك سواڵکەرێکی بەردەم ئەو دەرگایە بینیوە.

"کەرەم کە سوڵتانم، مەبڕە کەرەمت لە بێنەوایان،
لە کەرەمکار ناوەشێتەوە دەرکردنی گەدایان.."

(موحەممەد لوتفی)

رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَداً وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا فَرَجاً وَمَخْرَجاً وَصَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ صَلاةً تَكُونُ لَكَ رِضَاءً وَلِحَقِّهِ أَدَاءً وَصَلِ وَسَلِّمْ أَيْضاً عَلَى جَمِيعِ إِخْوَانِهِ مِنَ النَبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ

آمِينَ يَا مُعِينْ

## ڕوانینێکی کورت لە ئیسلام

ئیسلام لە ماددەکانی ئاشتی و سەلامەتەوە دارێژراوە و، بە ماناکانی تەسلیمبوونی بەندە بۆ خوا و، ملکەچبوونی بۆ فەرمانەکانی و، چوونە سەر ڕێیەکی ئەمین و پارێزراو و، ڕۆیشتنی بە سەلامەتی و، بەخشینی متمانە و دڵنیایی بە هەموو کەسێك و هەموو شتێك و، ناڕەحەت نەبوونی هیچ کەسێك لە دەست و زمانی ئیماندار، دێت.

بناغە و سەرەتای ئیسلام ئیمان و تێگەیشتنە، کۆتایی و ئەنجامەکەیشی ئیحسان و ئیخلاسە. حەقیقەتی ئیسلام بەکورتی بریتییە لە باوەڕهێنان بە ڕاستیی خوایەتی بەجۆرێك کە باوەڕدار هیچ جۆرە ئەگەرێك بۆ دژەکەی دانەنێت و، دڵی وابەستەی خوا بکات و، بەرپرسیارێتییەکانی بەوپەڕی هەستیارییەوە جێبەجێ بکات وەك ئەوەی ئەو ببینێت و لە لایەن ئەوەوە ببینرێت و، هەرشتێکی کردووە و دەیکات لە چوارچێوەی ڕەزامەندیی ئەودا بێت.

کەسانێکیش ئیسلامیان بەم شێوەیە ناساندووە: بریتییە لە تەسلیمبوونی ئادەمیزاد بۆ خوا و، دەربڕینی وابەستەیی و قەرزاری بەرامبەر بە ئەو

لەڕێگەی سوپاسگوزارییەکانی گوتار و کردارەوە و، هەمیشە مانەوە لەنێوان ئومێد و ترسدا. یەکێك کە بەم شێوەیە ڕەفتار دەکات پێی دەوترێت ئیماندار یان موسڵمان (نەك ئیسلامچی)[1] و، هەروەها کەسێکی لەم جۆرە بە کاندیدی بەختەوەری هەمیشەیی دادەنرێت.

ئەو ئیسلامەی کە بناغەکانی پاڵیان بە پەیامەکانی خوای گەورەوە داوەتەوە و، لە لایەن پێغەمبەری خواوە تەبلیغ کراوە و، لە ژیانی ئەودا ڕەنگی داوەتەوە و، نمایندەیی کردووە دینێکی ئاسمانییە.. ئەو کەسەش کە باوەڕ بەم دینە دەهێنێت و، دەیکات بە گیانی ژیانی، ئیماندار و موسڵمانە. لە بنچینە و دیوی ناوەوە و نەبینراوی ئەودا ئیمان و تێگەیشتن و تەسلیمبوون هەیە، لە دیوە بینراوەکەی دەرەوەشیدا گوێڕایەڵی و ملکەچی و کرداری چاك هەیە. زانایانی پێشین ئەم دینەیان بەم جۆرە پێناسە کردووە "بریتییە لە کۆی ئەو یاسا و ڕێسا خواییانەی کە مرۆڤەکان هاوڕێ لەگەڵ ئیرادە و هەڵبژاردنی ئازادی خۆیاندا بەرەو خێر و چاکە ئاڕاستە دەکات." سیستەمێکی چالاکی لەم جۆرە چەند کرابێت بە گیانی ژیان، ئەوەندە دەتوانرێت باس لە میوە و بەروبوومە دونیایی و قیامەتییەکانی بکرێت. بەپێچەوانەیشەوە چەند لە ژیان دابڕابێت، وتنی شتێکی چاك و باش لەسەری زۆر سەختە.

---

١. پاشکرەکانی وەك (چی و جی) لە زمانی تورکیدا بەمەبەستی دەستنیشانکردنی پیشە دەچنە سەر ناو. لە زمانی کوردیشدا پاشکری (چی) بەکاردەهێنرێت وەك (کەبابچی و حەلواچی)، بەڵام پاشکری (جی)مان نییە. بەڵام لە تورکیدا وشەکانی وەك "ئیسلامچی" (Islamcı) و "دینچی" (Dinci) (کە لە زمانی کوردیدا هاوشێوەیان نییە)، کۆمەڵێك نازناوی ناشرین و زیاتر لە لایەن ئەو تەوژمانەوە خراونەتە ڕوو کە دژایەتی دین و دینداران دەکەن، چونکە ئەم وشانە کەسی دیندار و ئایینپەروەر -چەشنی هەر فرۆشیارێکی تری وەکو کەبابچی و حەلواچی- وەك فرۆشیاری دینەکەی وێنادەکەن.

ئەگەرچی لەڕووی زمانەوانییەوە جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئیمان و ئیسلامدا، بەڵام بڵاوترین بیر و بۆچوون ئەوەیە کە نە ئیسلام بێ ئیمان و نە ئیمانیش بێ ئیسلام دەبێت. ئیمان دیوێکی ناوەکی و نەبینراوە و، ئیسلامیش بریتییە لە گوزارشت کردن لەم ڕاستییە بە گوفتار و کردار و حاڵ.. ئەو ڕێسا خواییەش کە پێی دەڵێین "دینی حەق" کۆی هەموو ئەمانەیە.. بەڵێ، دین ناونیشانێکی خواییە بۆ ڕەنگدانەوەی سەرجەم لایەن و بەشەکانی ئیمان و ئیسلام لە ژیاندا و، قبووڵکردنی ئەم سیستەمە بەم شێوەیە و پیادەکردنی لە ژیاندا ڕەفتارێکی باوەڕدارانەیە و، ئەو کەسەش کە بەم جۆرە نوێنەرایەتی دەکات دیندارە نەك (دینچی). لەم ڕووەوە ئەو موسڵمانانەی کە دینیان وەك کلتوورێك وەرگرتووە و، بە هەموو بوونیان قبووڵیان نەکردووە و، ئەوانەش کە دین تەنها لە باوەڕدا دەبیننەوە، بە هەڵخەڵەتاو حسابن. ڕوونە کە هەردوو پێڕەکە لەو پاداشتە دونیایی و قیامەتییانەی کە خوای گەورە بۆ دین و دینداری دایناون بێبەش دەبن.

بەڵام بە پشتبەستن بەم تێبینی و جیهانبینییە ئەوەش شتێکی ڕاست نییە کە کردار بە بەشێك لە ئیمان نەژماربکرێت. ئەوانەی باوەڕیان بە فەرزبوونی کردار هەیە و بەڵام نەیانتوانیوە وەك خۆی و بێ کەموکوڕی جێبەجێی بکەن، ئەگەرچی گوناهباریش بن، هێشتا بە ئیماندار قبووڵ دەکرێن.. هەڵبەت تێگەیشتنێکی لەم جۆرەش هیچ پەیوەندییەکی بە بۆچوونی مورجییەکان (المرجئة)ەوە نییە. چونکە ئەو کەسەی بەدەم دەڵێت باوەڕدارم، بەڵام گوێ بە گوناهەکان نادات جیاوازە و، هەڵسەنگاندنی ئەم بابەتەش لە چوارچێوەی "خوا بیەوێت لێی خۆشدەبێت و بیەوێت سزای

دەدات."دا شتێكی جیاوازە. بەگوێرەی قورئان، ئیمان بریتییە لە بنچینە و بناغەیەكی سەرەكی و، ئیسلامیش تاكە ڕێگایە بۆ ڕەگداكوتینی ئەمە لە سروشتی مرۆڤدا. كرداری بێ ئیمان دووڕوویی و، نەبوونی كرداریش سەرەڕای هەبوونی ئیمان فیسق و گوناهبارییە. دووڕوویی لەبەرئەوەی كوفرێكی شاراوەیە شایانی لێخۆشبوون نییە، بەڵام فیسق و تاوانباری لە ڕێگەی تەوبە و داوای لێخۆشبوون و گەڕانەوە بۆ لای خوا هەمیشە ئەگەری لێبووردەیی خوایی لەبەردەمیدا والایە. لەم ڕووەوە پێویستە هەمیشە بۆچوونی باشمان هەبێت دەربارەی كەسێك -بەمەرجێك تاوانەكانی بە سووك و بچوك تەماشانەكات و بێباك نەبێت بەرامبەر بە گوناهەكانی- كە كردار بە ئیمانەكەی ناكات و خێرا بڕیار لەسەر كافربوونی نەدرێت. بەپێچەوانەوەشەوە، ئەگەر كەسێك سەرەڕای ئەوەی كە كرداری نییە لەسەر سیفەتی موسڵمانێتییان سووكایەتی و بێڕێزی بەرامبەر بە خەڵكی بكات، ئەوا ناكرێت هەمان بیركردنەوە بۆچوونی باشمان هەبێت لەسەری. پێویستە لێرەدا ئەم خاڵە یادی خۆمان بهێنینەوە: هەرچەندە بناغەی ئیمان و جێگای گەشەكردن و بڵاوبوونەوەكەی دڵ و ویژدانە، بەڵام یەكێك لەو بنچینانەش كە خوای گەورە لەپاڵ ئەم قبووڵكردنە ویژدانییەدا و لە ڕێگەی ئیسلامەوە داوای دەكات كردەوەی چاك و ڕەوشتی جوانە. لەم ڕووەوە مەرجە ئیماندار هەم لە بابەتە نەزەری و هەم لە بابەتە كردارییەكاندا خۆی بە خاوەنی ئەو شتانە بزانێت -بەشەرتێك هیچ جۆرە زۆرلێكردنێك لەئارادا نەبێت- كە باوەڕی پێهێناون و قبووڵی كردوون.

هەروەك دووركەوتنەوە لە هەموو جۆرەكانی شیرك و نەنگییەكانی مەرجە بۆ موسڵمان بوون، بەهەمان جۆر پەیوەستبوونی دڵسۆزانەی ڕۆح بە خواوە و، جێبەجێكردنی عیبادەتەكان وەك ئەوەی بەندە خوای خۆی ببینێت یان هەستبكات كە لە لایەن ئەوەوە دەبینرێت و، ڕێكخستنی هەڵسوكەوتە كۆمەڵایەتییەكان لە چوارچێوەی كردارە جوان و باشەكانی ئیسلامدا.. هەموو ئەمانە بریتین لە درەوشانەوەی ڕۆحی ئیسلام -لەشێوەی شەپۆلی جۆراوجۆردا- لە ژیانی مرۆڤدا. لەڕاستیدا هەموو ئەم تایبەتمەندییانەی سەرەوە -وەك لە فەرموودە بەناوبانگەكەی حەزرەتی جیبریلدا ئاماژەی پێكراوە- كە دەكرێت بیانگێڕینەوە بۆ ئیمان و ئیسلام و ئیحسان، دیوە جیاوازەكانی ناوەوە و دەرەوەی یەك حەقیقەتن و، پێویستی و داخوازی یەكترن و، ڕەهەند و قووڵاییە جۆراوجۆرەكانی یەك شتی -بەو مەرجەی كە ئیمان یەكەم بێت و ئەولەوییەت بۆ ئەو بێت- نەگۆڕن. دیوی ناوەوە (الباطن) داوای دیوی دەرەوە (الظاهر) دەكات و پێی گۆش دەبێت، دیوی دەرەوە (الظاهر)ش پاڵ بە دیوی ناوەوە (الباطن) دەدات و، لەسەر ئەو ڕادەوەستێت. شتە كردارییەكان هەمیشە ڕۆح و ناوەرۆكی شتە نەزەرییەكان دەهێننە سەر زمان.

ئەگەر ناوەرۆكی باسەكە بەم شێوەیە بێت، نیشاندانی دین تەنها وەك بابەتێكی ویژدانی، هەروەك بێڕێزییە بەرامبەر بە ڕۆحی ئەو، لەهەمان كاتدا نەزانینی سنووری خود و بەزاندنیەتی. ئەوانەی وا دەردەكەون كە دینیان قبووڵكردبێت و دەڵێن "دڵم پاكە." و، ئەوانەش كە تەنها بەمەوە ناوەستن و سەرقاڵبوون بە لایەنە كردارییەكانی دینەوە بە زیادەڕەوی و توندڕەوی دەزانن، بە خەیاڵاتی بۆش دڵی خۆیان دەدەنەوە و، بە دەمامكی

ئیمان فێڵ لە موسڵمانان دەکەن. ڕاڤەکردنی ئیمان و ئیسلام بەگوێرەی هەوا و ئارەزووی کەسەکان لەوە دەریدەکات کە دینێکی ئاسمانی بێت و، دەیکات بە سیستەمێکی مرۆیی. لەبنەڕەتدا ئیسلام ڕێسایەکی خواییە و بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤەکان لە هەوا و ئارەزووەکانیان و بەستنەوەیان بە خوا و هیدایەتی خواوە نێرراوە. بە واتایەکی تر، کۆی ئەو یاسا خواییانەیە کە بۆ دەرهێنانی مرۆڤەکان لە زیندانی ئاژەڵی و، تەسکی و تەنگەبەریی جەستە و، ئامادەکردنیان بۆ گەشتکردن بە ئاسۆی پان و بەرینی ڕۆحدا نێرراوە.. وە ڕۆحی ئەم ڕێسا بێوێنەیە ئیمان و، جەستەکەی ئیسلام و، شعوورەکەی ئیحسان و، ناونیشانە مەزنەکەیشی دینە.

دین، وەك لە سەرەتاشەوە ئاماژەی بۆ کرا،ئەوانە دەدوێنێت خاوەنەکانی عەقڵ و شعوورن، ئەوان هاوڕێ لەگەڵ ئیرادەی ئازاد و هەڵبژاردنی خۆیاندا بەرەو خێرە دونیایی و قیامەتییەکان ئاڕاستە دەکات و، بەڵێنی بەختەوەریی هەمیشەییش بەوانە دەدات کە وەڵامی بانگەوازەکەیان داوەتەوە. پێگەی لێپرسراوان لە بەرامبەر دیندا، پسانی ئەوان نییە لەژێر کۆمەڵێك بەرپرسیارێتیی سەختدا، بەڵکو بریتییە لە پەیوەندیگرتنی هەرچی چاك و، جوان و، خێر و، بەختەوەریی هەمیشەییە -بەیارمەتی زانست و ئیرادە و تەقدیری خوایی- بە ئیرادەی ئەوانەوە وەك مەرجێکی گوێرەیی، ئەمەش میهرەبانی و ئاوڕلێدانەوەیەکی مەشینەتی هەمەکیی خواییە بەرامبەر بەو توانا هەندەکییەی ئیختیار کە پێشتر وەك بەخششێك خەڵاتیان کراوە. لەم ڕووە ئیسلام زۆر جیاوازە لەو پێکهاتانەی کە لەشێوەی دیندان و، ڕەنگی ئولوهییەتی پێوەیە و، بۆنی بەندایەتیی لێدێت. پێش لە هەر شتێکی دی قسەبۆکراوەکانی ئەم دینە خاوەنی

ژیری و ئیرادەن و، هەوڵی پیادەکردن و نوێنەرایەتیکردنی ئەم ڕێسایە دەدەن کە خوا دایناوە. بۆیە دەتوانین بەو جۆرە ڕاڤەی دین بکەین کە بریتییە لە میهرەبانییەکی تایبەتی بۆ توانا و لێهاتنێکی تایبەتی. چونکە ئەوانەی بێبەشن لە ژیری و ئیرادە لە بەرامبەریەوە لێپرسراو نین و شتێك نییە بە ناوی ئاراستەکردنی ئەوان بەرەو خێر.

بەڵێ، ژیری و ئیرادە یەکەم مەرجی دینە و، گرنگترین پایەی ئیسلامە لەو ڕووەوە کە دەبێت بە گیانی ژیان. ئەمەش مانای ئەوەیە بەرپرسیارێتیی دینی کە پێویستی بە جیاکردنەوەی خێر و شەڕ هەیە لەو کەسانە داوانەکراوە کە دارای ژیری و ئیرادە نین. بەڵێ، سەبارەت بە کەسانی لەم جۆرە، نە بەرپرسن بەرامبەر بەو دینەی کە کۆی یاسا خواییەکانە و، ژیری و توانای هەڵبژاردنی کردووە بە یەکەم مەرجی خۆی، نە لێپرسراویشن لەو دیانەتەی کە بە بەدیهێنان(خلق)ی خوایی و دەستخستن(کسب)ی ئادەمیزاد دێتە مەیدان.

ئەم دینە -لەو ڕووەوە کە لە لایەن ئەو بەدیهێنەرەوە دانراوە کە زانایە بە بەدیهاتووەکانی- هەمیشە خێر نیشان دەدات و، بەرەو خێر ئاراستەدەکات و، بە پەیمانی عاقیبەتخێری پەڕ و باڵ بە دڵەکان دەردەکات و، بە ئەندازەیەکی کەمیش لە ترسی عاقیبەت شەڕی ئاگاداریان دەکاتەوە و، بەمەش بۆ وریایی و دامەزراوی هانیان دەدات. فەرمان و ئامۆژگارییەکانی ئەو لەم چوارچێوەیەدا هەمیشە نەگۆڕ و، تازە و نەمرن. چونکە ئەم فەرمان و ئامۆژگارییانە ڕەنگیان ئەزەل و بۆنیان ئەبەدە. لەبەرامبەر ئەوەدا کە سەرجەم ڕێسا و سیستەمەکانی تر

کۆن دەبن و ڕەنگیان دەپەڕێت، ئەمانە -لە دیدی ئەوانەدا کە بڕیاری لەپێشینەی خراپیان نییە- هەموو کاتێك نوێ و نیرەییبزوێنن.. بەجۆرێك بەرهەمی بیری مرۆیی چەند ئامراز یاخود ڕێگای بۆ خێر و، بەختەوەری و سەرفرازی هەبێت، هێشتا هەموویان کاتین و مەحکومن بە پیربوون. ئەم ئامراز و ڕێگایانە کۆمەڵێك سیستەمی گچکەی وان کە هەمیشە لە مەردوومێك بۆ مەردوومێکی دی و، لە کۆمەڵگایەك بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێن و، بەتێپەڕبوونی کات دووچاری تێکچوون دەبن و، هەمیشە بە پڕۆسە بەردەوامەکانی هەڵەکردن و ڕاستکردنەوە ماندوودەبن و، تەنها بەڵێنی خێری پارچەیی و گوزەیی و هەندەکی بە ئادەمییەکان دەدەن و، تەنانەت هەندێك جار هیچ بەڵێنێکیشیان پێ نییە و تەنها وا دەردەکەون کە دەیدەن و، هەرگیز چاوەڕوانییەکانی ئادەمیزادیان نەهێناوەتەدی.

بەڵام دینی حەق، هاوڕێ لەگەڵ کۆمەڵێك پەیامی مژدەبەخشی وا کە سەرجەم داخوازی و چاوەڕوانییەکانی ئەو ئادەمیزادە دەهێننەدی کە بۆ ئەبەد دروستکراوە و، بۆ ژیانێکی هەتاهەتایی دەپاڵێورێت و، بە ئارەزوو و خولیای بەختەوەریی هەمیشەییەوە هەڵدەستێت و دادەنیشێت. نە داوایەکی وای کردووە کە پێچەوانەی ماهییەت و ناوەڕۆکی مرۆڤ بێت و، نە هیچ یەکێك لە ئارەزوو و پێویستییەکانی ئەوی فەرامۆش کردووە. بەڵێ، بەپێی ژیری ساغ و بیرکردنەوەی ڕاستڕەو، هەروەك لەم دینەدا هیچ جۆرە بۆشایی و ناڕوونییەك نییە سەبارەت بە ئارەزوو و، ویست و چاوەڕوانییەکانی مرۆڤ، بەهەمان جۆر هیچ جۆرە پێکدادان و دژایەتییەکیش نییە لەنێوان فەرمانە تەکوینییەکان لە لایەك و ڕاڤە و تەفسیرەکانی ئەم دینە لە لایەکی تردا. جگەلەمە، ئەو سیستەمێکی

خوایی بێهاوتایە و، بەگوێرەی ماهییەت و، توانا و لێهاتن و، ئاوات و، مەیلەکانمان نەخشەی بۆ کێشراوە و، پەیمانی بەختەوەریی هەمیشەیی و، ڕەزامەندیی خوایی و بینینی بەدیهێنەرمان پێدەدات.

کەسێك کە ژیانی بەگوێرەی ئیسلام ڕێکدەخات، هەم سوود لە گشت نیعمەتە ڕێگەپێدراوەکانی دونیا دەبینێت، هەم لەگەڵ ئەوەدا کە لەو دونیا پاداشت و خەڵاتێکی پێدەدرێت کە تەسەور ناکرێت، هەردەم بەو ئومێد و هیوایەوە دەژی کە بێگومان، ئەگەر ڕۆژی خۆی هات، چاکەکارییەکانی خوا ئەویش دەگرێتەوە و، ئیدی تەمەنی وەك ئەوەی بەناو ئەو ڕێڕەوانەدا گوزەربکات کە ئەوسەریان دەگات بە بەهەشت، بەخۆشی و شادییەوە بەسەردەبات. بەتایبەت ئەگەر ژیانی بەبەردەوامی گرێبدات بە ڕەزامەندیی خواوە -کە لەڕاستیدا ئەمە بناغەیەکی سەرەکییە لە دینداریدا- ئەم کەسە هاوشانی فریشتەکان ئەسپی خۆی تاوەدات و، ئەم وتەیەش باوەڕناکەم هیچ جۆرە زیادەڕەوییەکی تێدابێت. لەبەرامبەردا ئەوانەی کە دینی حەقیان نەناسیوە و شوێن ڕابەرایەتی "عەقڵی مەعاشی" کەوتوون و، هەروەها لایەنگرانی جیهانبینییە جیاوازەکان کە لەسەر شێوەی دیندان، یاخود سیستەمە مرۆیی و دونیاییەکان (سیکۆلارەکان)، هیچ شتێکی قەناعەت بەخش و، دڵنیایی بەخشیان نە لەسەر ئەمڕۆ و نە دەربارەی سبەینێی ئادەمیزاد نەگوتووە. نایشتوانن بیڵێن، چونکە ئەم دینە یاسا و ڕێسای خوایە لەسەر زەوی. ئەو بەدیهێنەرە و بەدیهێنەریش زاناترینە بە هەموو شتێك. هەر جیهانبینی و، ڕێسا و سیستەمێکی مرۆیی لەبەرئەوەی بەرهەمی تێگەیشتنێکی سنووردارە، ئەوا زۆرکات بە ڕق و بەرژەوندییە شەخسی و، بنەماڵەی

و نەتەوەییەکان نەخۆش دەکەوێت و، لەبەر ئەم هۆیەش داخراون بەڕووی خێر و چاکەی ڕەهادا و هەرگیز ناتوانن بەڵێنی بەختەوەریی هەمیشەیی بدەن. بەڵێ، ئەو جیهانبینی و سیستەمە جۆراوجۆرانەی کە بە ڕقی شەخسی و، تێبینی ڕەگەزپەرستی و، بەرژەوەندیی چین و دەستەیەکی دیاریکراو ئاسۆیان تەسك بووە، چەندیش کامڵ و پێگەیو بن، مادەم لە چوارچێوەی تێگەیشتنی سنوورداری مرۆڤدان، هەرگیز ناگونجێت ئەمانە شتێك لەسەر ویست و ئارەزووە بێسنوورەکانی ئادەمیزاد بلێن. خۆی لەخۆیدا کەسانی لەم شێوەیە زیهنیان لێڵ و، عەقڵیان شپرزە و شێواو و، لۆجیکیان کوێر و، چاوی شعووریان کز و، ئاسۆی ویژدان و بەسیرەتیشیان هەمیشە تەم و غوباراوییە. ئەو شتەی کە پێویستە نایبینن و، ئەگەر بیشیبینن بە خوار و خێچی دەیبینن و، لە ئەنجامیشدا لە ڕاڤەکانیاندا هەمیشە دووچاری بەهەڵەداچوون دەبن.

دینی حەق تاکە ڕێسایە کە مرۆڤ فریونادات و، ئاسۆی نوێی دونیایی و ئاخیرەتی بەڕوویدا دەکاتەوە و، یاسایەکی فراوانی پان و بەرین و فراوانی خواییە. ڕەهەندەکانی سەر بە بیروباوەڕی ئەم سیستەمە لاهوتییە دینە و، لایەنە کردارییەکانی شەریعەتە و، لەڕووی ئەرك و فەرمانە کۆمەڵایەتییەکەیشیەوە بە میللەت ناودەبرێت و، کاتێك دەڵێین "میللەتی ئیسلام" مەبەستمان لەم مانایانەیە. لەڕاستیدا مرۆڤەکان چەند باوەڕیان بە شتێك کردبێت، ئەوەندە هەڵسوکەوت و چالاکییەکانیان گونجاو دەبێت لەگەڵ ڕۆحی ئەو بیروباوەڕەدا و، بنیاتی کۆمەڵایەتیش بەم ڕەفتار و هەڵسوکەوت و چالاکییانە شکڵ و شێوە وەردەگرێت. لەم ڕووەوە هەموو ئیماندارێك کە دارای ئیمانێکی پتەوە و، بە کردارە

چاکەکانیش ئەم ئیمانەی کردووە بە بەشێك و ڕەهەندێك لە سروشتی خۆی، عاشقی حەقیقەتە و، حەقپەرستە و، دادپەروەرە و، ڕاستگۆیە و، ئەمینە و، نمونەی ڕەوشتی جوانە و، ڕێبواری ڕێی زانست و مەعریفەتە و، بەتوندی بەستراوە بە هێزی ڕاکێشانی قودسیی دینەوە و، پێویستە هەموو کاتێك هاودەم لەگەڵ خولیای بوون بە لایەنێکی هاوسەنگیی نێودەوڵەتی هەڵبستێت و دابنیشێت و، هەرگیز بۆ ساتێکیش لەم فیکری باڵایە دانەبڕێت.

ئیماندارێك کە بیروباوەڕەکەی لە ئاستی یەقیندایە و، کردارەکانی بەتەواوەتی وابەستەی پێوەرە حەقەکانە و، دڵی هەمیشە لە پەیوەندیدایە لەگەڵ خوای خۆیدا و، ئەم پەیوەندییەش لە ڕەفتارەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، هەرگیز شوێن ئەم و ئەو ناکەوێت و نابێت بە پاشکۆی کەس. هەموو کاتێك هەست بەو شعوورە دەکات کە تاکێکی سەربەرزی میللەتێکی وایە کە لە چەقی قورساییدایە و، لە هەموو هەڵسوکەوتێکیدا هەوڵدەدات ئەم جیاوازییەی خۆی دەربخات. ئەو، لەبەر خاتری خوا، ڕێزێکی قووڵی هەیە بۆ هەموو کەسێك و هەموو شتێك، لە هەموو سادەیی و سووکییەك کە نەتوانێت لەگەڵ سیفەتی مرۆڤبووندا یەکبگرێتەوە خۆی دەپارێزێت. لەڕووی دین و، باوەڕ و، بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتەوە بەراورد بە کەسانی تر جۆرێك لە بەرزی نیشان دەدات، کاتێکیش هەموو ئەمانە دەکات هەرگیز خۆبەزلزانیی دەروونی بەسەریدا زاڵ نابێت و، هەرگیز سەپاندنی زۆرەملێیانەی تێگەیشتن و فەلسەفەی ژیانی خۆی بەسەر کەسانی دیکەدا بەخەیاڵیشیدا نایەت. دەزانێت ئەو سیستەمەی باوەڕی پێهێناوە هیچ کاتێك ڕێ بە زۆرلێکردن نادات، لەبەرئەوە هەموو کەسێك لە

پێگەی خۆیدا قبوولّدەکات و، لەبری ئەوەی زۆر لە ئەم و ئەو بکات و، هاودەم لەگەڵ خۆشەویستی بیروباوەڕەکەیدا دەژی و، نوێنەرایەتییەکی بێکەموکورتیی بیروباوەڕی خۆی دەکات و، ئەوپەڕی گرنگی دەدات بەوەی لەناو خەڵکیدا کەسێك بێت کە بەخیلی پێببرێت. کاتێکیش ئەمە دەکات سواڵی پەسەندکران و خۆشویستران لە کەس ناکات و، هەر شتێکی کردووە یان دەیکات بە داخوازیی ڕێی ڕەزامەندیی خوایی دەزانێت و، لە وتە و هەڵسوکەوتەکانیدا تەنها ڕەچاوی ڕازیبوونی ئەو دەکات و، خۆدەرخستن و ڕیاکاری بە ڤایرۆسێك دەبینێت کە دڵ دەکوژن و، بە هەموو هێزی دەست لە حەق گیردەکات و، پاشان بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتنی خۆی...

لەڕاستیدا ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتووە تا شوێنکەوتووانی، سیستەمی بیروباوەڕی خۆیان بەسەر ئەم و ئەودا بسەپێنن، بەڵکو بەپێچەوانەوە بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤەکان لەم چەشنە فشار و زۆرداریيانە هاتووە و، ژیری و لۆجیکیان دەدوێنێت و، بانگیان دەکات تا بە ئیرادەی ئازادی خۆیان هەڵبژاردنێکی نوێ ئەنجامبدەن. خۆی لەخۆیدا ئەو سەردەمانەی کە تێیدا دین بێ کەموکورتی و ناتەواوی پیادەکراوە، ئیدی هێزی ڕاکێشان و سەرنجڕاکێشیی مەعنەوی ئەو هیچ پێویستییەکی بۆ فێڵ و تەڵەکەی لۆجیکی و، جەربەزەیی و، فشار و پەستانی دیار و نادیار نەهێشتووەتەوە. زمانی حاڵ قسەی کردووە و، زار تیشکی خستووەتە سەر شتە نەزانراوەکان و، وەختێکیش کاتی ئاخاوتن هاتووەتە پێش، ڕووی قسە لە ویژدانەکان کراوە و، گوفتارەکان بە دانایی و ئامۆژگاریی جوان ڕازاونەتەوە و، ئەرکی مژدەدان و بێدارکردنەوەیان ڕاپەڕاندووە، بەڵام

هەرگیز پەنا بۆ هیچ جۆرە سەپاندنێکی گوفتاری و کرداری نەبراوە. چونکە هەروەك ئیسلام ئەو ئیمانە قبووڵ ناکات کە بەزۆر سەپێنرابێت، بەهەمان جۆر هەموو ئەو کارانەی کە بەیارمەتی بەکارهێنانی زەبر و زەنگ کراون پێچەوانەی ڕۆحی ئەون. بەم پێیە ئیمانێك کە لە دەرەنجامی فشار و زۆرکاری دروستبووبێت دووڕوویییە و کردارێکی لەم جۆرەش بە سەرجەم لایەنەکانیەوە ڕیاکارییە. لەم ڕووە ئیسلام هیچ کات ڕێگەی بە زۆرلێکردنی ئایینی نەداوە و نایدات.. قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ (البقرة: ٢٥٦)

"بەهیچ جۆرێك زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا."

ئەم فەرمایشتە زۆرکاری لە ڕەگەوە دەردەهێنێت، چونکە لە دیدی ئەودا ڕیا خودی دووڕوویییە و، دووڕوویییش کوفرێکی شاراوەیە. لەحاڵێکدا ئیسلام بۆ وشککردنی ڕیشەی کوفر و، سڕینەوەی شیرك لە هەست و بیرەکاندا و، داخستنی دەرگاکانی ڕیا و ناوبانگ هاتووە.

بەڵام نەبوونی سەپاندنێکی لەم جۆرە، ڕێگر نییە لەبەردەم فشاری ناوەکی ویژدان و، ئەو کاریگەری و مەیلەی -کە لە جۆرێك لە پەستان دەچێت- کە لە نرخشناسیی دڵەوە سەرچاوە دەگرێت کاتێك ڕووبەڕووی دەربڕینە گوفتاری و کردارییەکانی حەق دەبێتەوە. بێگومان هەلومەرجەکان چەند دەست بدەن، بە ئوسولبێکی قورئانی بانگ لە هەموو ویژدانەکان دەکرێت و، هەوڵی بێدارکردنەوەی سروشتە ساغەکان دەدرێت و، بە شێوازی تایبەتی خۆی دڵە لەبارەکان بەرەو خوا ئاڕاستەدەکرێن و، مرۆڤەکان لە شیرك و نەنگییەکانی شیرك ڕزگاردەکرێن و، بە سەرجەمی

خەڵکی ڕادەگەیەنرێت کە پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێنەرایەتیی پاك و بێگەردترین هیدایەت دەکات و، حەقیقەتی مرۆڤ و شتان و گەردوون لە قورئاندا ئاشکرا کراون و، نووری ئیمان و ئیسلام و، شعووری ئیمان و ئیخلاس لە گشت دڵەکاندا دەبووژێنێتەوە و، هەموان بانگهێشتی تەوحیدی ڕاستەقینە دەکات. ئەمەش داخوازی و پێویستیی موسڵمانێتیی ئێمە و بەدەمەوەچوونی بانگەوازی پێغەمبەرەکەمانە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

پێغەمبەری ئێمە دواین پێغەمبەرە و، ئەو پەیامەشی کە پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە تەواوترین و کامڵترینە و، باوەڕپێکراوترین هۆکارە بۆ گەیشتن بە خوا. هەرکاتێك ئەم دینە لە لایەن نوێنەرە ڕاستەقینەکانیەوە نمایش کرابێت، سێبەرێکی حەقی وا بووە کە هەموان پەنایان بۆ باوەشی بردووە و، خەڵکانی فێنك کردووەتەوە و، سیحری سەرجەم سیستەمە شەیتانییەکانی بەتاڵ کردووەتەوە و، لە خراپترین بارودۆخیشدا شوێنکەوتووەکانی بێ ڕووناکی جێنەهێشتووە. ئەگەر ئەو لەئێستادا نەتوانێت بەباشی گوزارشت لە خۆی بکات، پێویستە لە ڕق و، نەفرەت و، ستەم و، دەستدرێژی چەندین ساڵەی دوژمنەکانیدا و، لە نەزانی و، بێوەفایی و بێئاگایی لایەنگر و شوێنکەوتوانیدا بەدوای هۆکاری ئەمەدا بگەڕێین. ئەوەندە هەیە ئێمە هیچ ئەگەرێك بۆ ئەوە دانانێین کە ئەم حاڵەتە بۆ هەتاهەتایە بەردەوام بێت. کاتێك ڕۆژی خۆی هات، بەپێی دەستووری (الأسلام يعلو ولا يعلى عليه)[1]، لەسایەی ئەوانەدا کە لە ناخەوە دەبن بە خاوەنی و، ئەوانەی گرێدانی ژیانی خۆیان بەوەوە

١. البيهقي، السنن الكبرى ٦/٢٠٥.

و هەڵبژاردنی ڕێگای ئەو بە تاکە ئامانجی ژیانیان دەزانن، بێگومان دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسێت کە لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا خۆی نمایان بکات و، جارێکی دی بە دەنگی خۆی دەکەوێتەوە گۆ و، ڕەنگ و نەخشە تایبەتەکانی چاوانمان بەر شەوارە دەخەن و، هاوڕێ لەگەڵ زایەڵە ئاسمانییەکەیدا لە هەموو جێیەکدا کاریگەریی خۆی دەنوێنێت.

هەروەختێك ئەم ئوممەتە هەستی بەوە کرد کە کۆمەڵێکی هەڵبژێرراوە لە لایەن خواوە و، تێگەیشت لەوەی کە هەر لە لایەن ئەوەوە ناوی ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا ﴾[1] "ناوی ناون موسلمان و لەم قورئانەشدا بەموسڵمان ناوی بردوون." بۆ هەڵبژێرراوە، ئەوکات دەڵێت ﴿ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾[2] "خوا چەندە پشتیوانێکی چاك و یارمەتی دەرێکی چاکە." و، ڕووی لە بەدیهێنەری میهرەبانی خۆی دەکات و، ڕام دەبێت بۆ حیکمەتی ئەو و، لەئەنجامیشدا بێگومان بەرزدەبێتەوە بۆ ئەو پێگەیەی کە لە چوارچێوەی ڕەزامەندی و ویستی ئەودا گوزارشت لە خۆی بکات.

لەڕاستیدا دەکرێت هەموو کاتێك باس لە هەبوونی پێگەیەکی لەم شێوەیە لەسەر ئاستی دۆخی وزە و هێز بکرێت. چونکە ئیسلام کامڵترین و کۆتا دینە کە خوا بۆ مرۆڤەکانی هەڵبژاردووە و بەهۆیەوە شەرەفمەندی کردوون. لەو ڕووەوە کە کامڵترین و کۆتایە، لە حوکمی ڕوونکردنەوە و، فراوانبوون و، زمانی سەرجەم ئایینە ئاسمانییەکانی پێشوودایە بەگوێرەی پێداویستییەکانی ئەم سەردەمە. بەڵام ئەم سیستەمە کامڵە لەئێستادا

١. سورەتی الحج: ٧٨.
٢. سورەتی الأنفال: ٤٠.

مەحرروومە لە کەسانێك کە لە ئاستی شوێنکەوتووە یەکەمینەکانیدا بن و، بەوەی کە کەوتووەتە دەستی کۆمەڵێك بێوەفا، ڕۆژانی حەسرەت و بەدبەختیی خۆی دەکێشێت. لەم ڕووەوە ئەو سەرەڕای فراوانییە بێسنوورەکەی، لەمڕۆدا بە تەسکیی مەحکوومکراوە و، ناتوانێت بە زمانی خۆی گوزارشت لە خۆی بکات. ئەمە لەهەمان کاتدا بە مانای ئەوە دێت کە سەرجەم دینە ئاسمانییەکانی دیکەش ناتوانن گوزارشت لە خۆیان بکەن. پێش لە هەر شتێکی دی ئیسلام هەموو پێغەمبەرانی تری قبووڵکردووە و، بانگەوازێکی گشتییە و، دەعوای سەرجەم پێغەمبەرانی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە و، لە حوکمی دەنگ و ڕەنگی هەموویاندایە و، پەیامی ئەوان دەگەیەنێت بە مرۆڤەکانی -بە ڕەچاوکردنی ئاستی تێگەیشتنیان- ئەم ڕۆژگارە. بەتایبەت لەم چەرخەدا کە بیروبۆچوونە ماددەگەرا و سروشتگەراکان بەیەکجاری هاربوون و لغاویان فڕێداوە، بێدەنگبوونی ئەم بانگەوازە ئاسمانییە، بە مانای قبووڵکردنی دۆڕان و پووکانەوەی هەمیشەیی سەرجەم دینەکانی دیکەیش دێت لەبەرامبەر ئەم هەموو تەوژمە ڕەش و تاریکانەدا. ئیسلام هەروەك پارێزەری دینی حەقە، بەهەمان جۆر مادەم دەعوای بنەڕەتیی هەموو پێغەمبەران هاوبەشە، لە حوکمی شایەت و، خاڵی پشت پێبەستن و، خاڵی یارمەتی لێوەرگرتندایە بۆ سەرجەم سیستەمە ئاسمانییەکانی دیکەش. هەر بۆیە زیندووکردنەوەی ئەم دینە -لەو ڕووەوە کە ئەو لایەنانەیان چاکدەکاتەوە کە شایانی چاکسازین و، ئەگەر بەشێوەیەکی هەندەکیش بێت چاو بەو لایەنانەیاندا دەخشێنێتەوە کە پێویستی بە نوێکردنەوە و نۆژەنکردنەوە هەیە و، بە یاسا و ڕێسا دامەزراوەکانی ئاسۆی نوێ لەڕووی

شوێنکەوتووانیاندا دەکاتەوە- بەشێوەیەك لە شێوەکان بە زیندووکردنەوەی هەموو دینە ئاسمانییەکانی دیکەش دادەنرێت. بەندە لەو باوەڕەدام کە دەگونجێت هەموو ئەمانە بێنەدی و لەم ڕووەوە سەرچاوەی هاوبەش[1] بە گەورەترین قازانج و سوودی ئەم بابەتە دەزانم.

***

هەموو دینەکان لەسەر هەمان بناغە دامەزراون و پەنجەیان بۆ هەمان حەقیقەت درێژکردووە. هەموو پێغەمبەرێك کە خوا ناردوویەتی لەڕووی یاسا و ڕێسا بنەڕەتییەکانەوە -لە چوارچێوەی هەلومەرجەکانی ئەو ڕۆژگارە و گونجانی لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو سەردەمەدا- وەك بەردەوامیدەر و، تەواوکاری ئەوەی پێش خۆی هاتووە و، پەیامی ئەوانەی پێش خۆی دووپات کردووەتەوە و، بەگوێرەی هەلومەرج و ژینگە جۆراوجۆرەکان کاملی کردووە و، ئەو بابەتانەی پێویستیان بە ڕوونکردنەوەی زیاتر بێت شیکردوونەتەوە و، ئەو لایەنانەش کە نوێبوونەوەیان گەرەك بووە تازەی کردوونەتەوە و، هەمیشە لە دەوری چەند بابەتێکی هاوبەش کۆبوونەتەوە. تەوحید و، پێغەمبەرایەتی و، زیندووبوونەوە و عیبادەت، یەکەمین بابەتی هەموو پێغەمبەرێك بووە. بەڵێ، ئەم بناغانەی سەرەوە -بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازیی ئوسلوب و، شێواز و، میتۆد و، گوفتار و دەربڕینیان- ناوەڕۆکی پەیامی سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) و نێرراوەکانی پێکهێناوە و پێکدەهێنێت.

---

١. نووسەر لێرەدا ئاماژە بۆ سەرچاوەی هاوبەشی گشت ئاینە ئاسمانییەکان دەکات، کە خوای گەورەیە. دەنەر بە درێژایی ژیانی کرنگی بەم بابەتە داوە و هانی لێکتێگەیشتن و پێکەوە ژیان و نزیکبوونەوەی نێوان ئاینە ئاسمانییەکانی داوە.

جیاوازییەکان لە بواری جێبەجێکردندا و، جیاوازیی تاوتوێ کردنی بابەتەکان وەك کورتکردنەوەی هەندێك و درێژەپێدان (ڕوونکردنەوە) بە هەندێکی تر و، ڕەهاکردنی لایەنێك و سنووردارکردنی لایەنێکی دیکە و، ئاشکراکردنی مەسەلەیەك و باسکردنی دانەیەکی تر بەشێوەیەکی شاراوە و هاوشێوەکانیان، بەتەواوەتی پەیوەندی بە توانای تێگەیشتنی مرۆڤ و ئاستی پێشکەوتن و شارستانێتییەوە هەیە. خوای گەورە بەگوێرەی ئاستی زانست و تێگەیشتنی هەر نەتەوەیەك و، چۆنێتیی کێشەکانی و، جۆری پێداویستییەکانی، فەرمان و ئامۆژگاری دەربارەی بوارە لاوەکییەکان (التفرعات) بۆ دابەزاندووە و، یاسای تایبەتی بۆ داناوە و، سەرلەنوێ بەپێی توانای تێگەیشتنی قسەبۆکراوەکان فەرمانە تەکوینییەکان و تەشریعییەکانی ڕوونکردووەتەوە و، لە هەر سەردەمێکدا گوفتاری پیرۆزی خۆی لە شێوەی شەپۆلی تەجەللی جۆراوجۆردا بۆ کۆمەڵگا جیاوازەکان بەیان کردووە. بەم جۆرە، هەرچەندە یەکێتیی ناوەرۆك و ئامانج پارێزراوە، بەڵام لە بابەتەکانی وەك درێژەپێدانی کورتبڕییەکان و، ڕەهاکردنی سنوورداره‌کان و، گشتاندنی تایبەتەکان و، ئاشکراکردنی شاراوەکان و هاوچەشنەکانیاندا، جیاوازی و نوێبوونەوەکان هەر بەردەوام بوون. چونکە چەندین بابەتی وا هەن کە پوختەیەك لێی بەسە بۆ کۆمەڵگا سەرەتایی و دەشتەکییەکان، بەڵام درێژەپێدان و ڕوونکردنەوەی هەمان بابەت بۆ کۆمەڵگا پێشکەوتوو و شارستانییەکان شتێکی پێویستە.

لەبەر ئەم هۆیە هەمیشە لەسەر ئاستی بابەتە لاوەکییەکان تێبینی جۆرێك لە گۆڕان دەکرێت لەنێوان پەیامی هەر لە یەکەم پێغەمبەرەوە

هەتا دواین نێرراو. بەڵام هیچ یەکێك لەم گۆڕانانە توخنی ڕۆحی پەیامە سەرەکییەکە ناکەون و، چوارچێوەی شتانی لاوەکی (التفرعات) تێناپەڕێنن. هەرچی جیاوازی و، ناکۆکی و، دژایەتی و، بەربەرەکانێش هەیە لەنێوان شوێنکەوتووانی ئایینە ئاسمانیەکاندا، ئەوا لە ڕاڤەی هەڵە و، لادان و، هەوا و، ئارەزووی ئەو شوێنکەوتووە دواکەوتووانەی دینەکانەوە کە ڕاستگۆ نەبوون لەگەڵ پەیامە خواییەکاندا و، ئەوەی قین و، نەفرەت و، سوود و بەرژەوەندین سەرچاوە دەگرێت، نەك لە دین و دینداریەوە. لەم ڕووەوە بۆ ئەوەی ئەمڕۆش نەکەوینە ئەو داوی جیاوازی و دووبەرەکییە جۆراوجۆرانەوە کە دوێنێ پێوەی گیرۆدەبووین و، بێینەوە سەر خۆمان، پێویستە تەنها و تەنها ئیمان و ئیسلام لەو چوارچێوەیەدا قبووڵبکەین کە خوا خۆی دایناوە و، بیکەین بە بەشێکی دانەبڕاو لە سروشتمان. ئەوەندە هەیە بۆ ئەوەی هەموو کاتێك ئەم ئیمانە میوەبەخش بێت و، هێزی خۆی نمایانبکات، یاخود بە واتایەکی تر، بۆ ئەوەی بەبەردەوامی ژیان بکات بە بەری ویژدانەکاندا، پێویست بە کرداری چاك دەکات. ئیمان چەند بە کرداری چاك پشتگیری لێبکرێت و، ئیمانداریش چەند بە عیبادەت پەروەردەی بکات، بەهەمان ئەندازە دەتوانێت لە خوا نزیك ببێتەوە و، نزیکیی لە خواوە بپارێزێت و، ڕەزامەندیی ئەو بەدەستبهێنێت. بەپێچەوانەشەوە هەروەك ئەو ئیمانەی کە بە عیبادەت گۆشنەکراوە و پشتیوانی لێنەکراوە ناتوانێت بەتەواوەتی خۆی دەربخات، بەهەمان جۆر نەکەوتن و بەپێوەمانەوەی ئیماندارێکیش کە عیبادەتی نییە زۆر سەخت و ئەستەمە. لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز هەمیشە لەدوای ئیمان ناوی کرداری چاکیش دەهێنێت و، لەپاڵ تەسدیقی دڵدا کە پایەیەکی سەرەکی

دیوی ناوەوە(الباطن)ە، کردارە چاکەکانیشمان یاددەخاتەوە کە دیوی دەرەوە (الظاهر) پێکدەهێنن و، زوو زوو ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی پەیوەندییە ناوەکی و دەرەکییەکانمان پتەوبکەین. چونکە ئیمان سەبارەت بە کردار تاکە بناغەیەکی نەگۆڕە و، کرداریش سەبارەت ئیمان قەڵایەك و، قەڵغانێك و، شایەتێك و بیمەیەکە.

ئەو کردارە باشانەی کە لە ئیمانەوە سەرچاوە ناگرن زادەی چەند ڕێکەوتێکن و هەرگیز ناتوانن ببن بە کارێکی جێگیر و بەردەوام.. وە بێگومان بەڵێنی داهاتوویەکی گەشیش نادەن. ئیمانێکی بێ کرداریش تەواو بێ پشت و پەنایە و، ئەگەری لەرزین و ڕووخانی نزیکە و، کرانەوە و فراوانبوونی مەحاڵە و، بریتییە لە کۆمەڵێك بۆچوونی نەزەریی قبووڵکراو و چاولێکەرییەکی ساردوسڕە. بەڵام ئەو ئیسلامەی کە پێی دەوترێت دینی حەق، لەپاڵ باوەڕهێنانی تەواوەتی بە گشت لایەنە سەرەکی (أصل) و لاوەکی (فرع) یەکانی ئەم دوو حەقیقەتە[١]، بریتییە لە ناونیشانی مەزنی جێبەجێکردنی هەر بەرپرسیارێتییەك کە لەڕێی قورئانەوە دابەزیوە. لەم چوارچێوەیەدا ئیسلام تاکە سەرچاوەی بەختەوەریی دڵ و، ڕۆح و، ماددی و، مەعنەوی و، دونیایی و ئاخیرەتیی ئادەمیزادە. ئەوەندە هەیە سوودوەرگرتنی تەواوەتی لەم کانگایە، بەندە لەسەر بەکارهێنانی باشی ئەو توانا و لێهاتنە ناوەکی و دەرەکییانەی مرۆڤ کە هەر لە سەرەتای بەدیهاتنییەوە پێیبەخشراوە. ئەوانەی کە بەهرە سروشتی و یەکەمینەکانیان وەك بانگهێشتێك بەکاردەهێنن بۆ واریداتی دووهەم، تەمەنیان لە ئاسمانی شین و سامانی ئەو "بازنەی چاکەکارییەکان"ەدا بەسەردەبەن کە بە جوانی دەست پێدەکات و بە جوانی

---

١. مەبەست لێی حەقیقەتی ئیمان و ئیسلامە.

کۆتایی پێدێت و، دەتوانن لە چرکەساتە کورتەکانی تەمەنیاندا کارێکی وا ئەنجامبدەن کە بەهۆیەوە ئەبەدییەت دەستی خۆیان بخەن.

ئیسلام سەبارەت بەو شوێنکەوتووانەی کە لە دڵەوە باوەڕیان پێهێناوە و لە ژیانیاندا پیادەیان کردووە هەمیشە سەرچاوەی هێز بووە و، بەئەندازەی پابەندبوونیان پێیەوە ڕووسووری کردوون و، هەرگیز تاڵاوی دۆڕانێکی هەمیشەیی و بەردەوامی پێنەچەشتوون. لە سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکانەوە هەتا ئەمڕۆ و لە چەرخە جیاوازەکاندا، لەسایەی ئەودا چەندین چەرخی ئاڵتوونی بەسەربراون و چەندین شارستانێتیی جۆراوجۆر دامەزراون. بەپێچەوانەشەوە لەو کاتە شوومانەدا کە پشت لە دین کراوە و لە ژیان دابڕێنراوە، ڕووخان بەدوای ڕووخاندا هاتووە و، حەشاماتاکان هەمیشە لە نائومێدیدا تلاونەتەوە و، کۆمەڵگا بەهیچ شێوەیەك نەیتوانیوە پشتی چەماوەی خۆی ڕاستبکاتەوە. لەم کاتانەدا چەندین مرۆڤیش هەبوون کە باوەڕیان بە دین و هێزی ئەو هەبووە، بەڵام ئەمانیش هەموو کاتێك چاویان لە ئاسۆی ڕووداوە ناناسایییەکان بڕیوە و، بەدەم خولیای عینایەتی دەراساوە هەستاون و دانیشتوون و، عادەت و یاسا خوایییەکانیان پشتگوێ خستووە. هەرچەندە ئیمانداران پێویستە باوەڕیان هەبێت بە هەندێك لوتف و چاودێریی تایبەتی خوایی، وەلێ نابێت هەرگیز ئەوە لەیادبکەن کە هەوڵ و کۆشش لە حوکمی هۆکار و بانگەوازدان بۆ ڕاکێشانی ئەم عینایەتە. خوا لە قورئاندا دەفەرمووێت:

﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾ (العنكبوت: ٦٩)

"ئەوانەش لە پێناوی ئێمەداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە؛ هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان"

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەمان یاددەخاتەوە کە ئەو لوتف و چاکەکارییانەی خوای گەورە بەدییاندەهێنێت دیسان لە حاڵەتی ئیقتیراندان لەگەڵ هەوڵ و کۆشش و ئیرادەی ئادەمیزاددا و، لە هەمان ئەو کاتەدا کە ڕێ بە شیرك و هاوبەشێتی نادات، ئاماژەی بە گرنگیی هەوڵ و کۆشش کردووە وەك تەجەللییەکی ئاوڕلێدانەوە تایبەتییەکانی.

پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێین کە نابێت هەرگیز هەوڵی ئێمە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێسا خواییەی کە لە شتان و ڕووداوەکاندا دەستبەکارە و، کارکردنی ئەو ڕێسایە بەوپەڕی ڕێکوپێکی و دانایی و، نیشاندانی وەك ئەوەی پابەندی هەندێك هۆکار بێت... بەڵێ، پێویستە ئەم تەفسیرەی ئێمە وا نەزانرێت کە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان لە ڕوانگەیەکی "دەستنیشانکردنی لەپێشین"ەوە (Determinism)[1]. ئێمە تەنها ویستمان گرنگیی ئەو ئیرادە هەندەکی و هەمەکییانە لە کردارە مرۆییەکاندا یادبخەینەوە -وەك مەرج و هۆکارێکی گوێڕەیی- کە ئاوڕلێدانەوەیەکی ڕەنگاوڕەنگی مەشیئەتی خواییە.. خاڵێکی دیکەیش کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە: ئیرادە ئەگەر لە شێوەی مەیلێکدا بێت، یاخود دەستێوەردانێکی هەندەکی بێت لەم مەیلەدا، ئەوا لە

١. بریتییە لە ڕێبازێکی فەلسەفی کە پێی وایە هەموو ڕووداوەکان بە کردارە مرۆییەکانیشەوە ئەنجامی حەتمی کۆمەڵێك هۆکاری میکانیکیی لە پێشینەن.

هەموو حاڵ و بارێکدا پێویستە ئیماندار ئەم توانای هەڵبژاردنەی کە لە ویژدانیدا هەستی پێدەکات، بەئاراستەی ئەو شتانەدا بەکاربهێنێت کە خوا پێی خۆشە و داوای دەکات و، هەمیشە خەبات و دامەزراویی خۆی لەم ڕووەوە بپارێزێت.. بەڵێ، دەبێت ئەو هەموو کاتێك لەو شتانە بەدووربێت کە شەرع بە ناشرینیان دەزانێت و، بەدوای کاری چاکدا بگەڕێت و، هەموو ساتێك و بەشێوەیەکی جددی و دامەزراو بە هەڵسوکەوتەکانی نوێنەرایەتیی ئیسلام بکات. ئەم نوێنەرایەتییە پێویستە بەجۆرێك بێت کە هەموو دیمەنێکی ژیانی نمایشی لایەنێك لە لایەنەکانی ئیسلام بکات و، دەبێت چەشنی نمایندەیەکی ڕاستگۆی ئایین هەردەم ئەو پیشان بدات و، ئەو بهێنێتە سەر زمان و، ئەو نمایش بکات و، هەموو ئەو شتانەی کە خوا پێیبەخشیوە لە کردنی ئەو بە گیانی ژیان بەکاربهێنێت و، لە سەرجەم کاروبارەکانیدا ڕەچاوی ڕەزامەندیی خوا بکات. بەدیعوززەمان گوتەنی لەبەر خاتری خوا کاربکات و، لەبەر خوا دەست پێبکات و، لەبەر خوا لەگەڵ کەسانی تردا کۆببێتەوە و، لەبەر خاتری خوا بدوێت و، هەمیشە لە بازنەی بۆ خوا، لەبەر خوا، لەپێناو خوا هەڵسوکەوت بکات..[1] هەتا ڕۆژ و، خولەك و چرکەکانی ئەم تەمەنە فانییە ببن بە پارچەی کاتەکانی ڕێگای هەتاهەتایی و، ببن بە هۆکاری بەختەوەریی هەمیشەیی...

ئیماندار دەبێت هەموو کاتێك بە نیەت و تەسەورەکانی و، ئیرادە و نەخشەکانی لە خەمی پەروەردەکردنی ئیمانەکەیدا بێت و، مافی موسڵمانێتی بدات و، تەنانەت بۆ خولەکێك و بۆ چرکەیەکیش هەرگیز خۆی دووچاری

١. بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، بریسکەکان.

غەفڵەت و بۆنکردن نەکات. ئامێری جۆلآی شعوور و هەست و ئیرادەی لە ئیمانەوە بۆ بزاوتن و، لە بزاوتنەوە بۆ ئیمان بجولێنێت و، هەوڵبدات بەجۆرێك نەخش و، شکڵ و شێوەی قوماشی ژیانی بچنێت کە وەك بڵێی بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پێشکەشی حزووری خوای بکات.

بێ ئیمانی دۆزەخێکە لە دڵدا و، نەبوونی کرداری چاکیش غوربەت و، برسێتی و تەنهاییە. بێگومان بەتێپەڕبوونی کات لەم جۆرە کەسانەدا هەندێك حاڵەتی تێکچوونی کەسایەتی دەرکەوتوون و دەردەکەون. ئەمانە هەوڵ و کۆششیان تابڵێی خاو و خلیچك و، بیرکردنەومیان فشەڵ و، ئیرادەیشیان وەك بڵێی ئیفلیجە. دوعا و عیبادەت کە ئیرادە بەهێزدەکەن و، ڕووکردنە خوا و تەوبە و پەشیمانییە کە ڕەگی هەستە خراپ و خووە بەدەکان لە ڕیشەوە دەردەهێنێت. هیچ کەسێك لەوانەی لە چوارچێوەی پێوەرە ئیسلامییەکاندا ڕوویان لە خوا کردووە لە نیوەی ڕێ جێنەماون و، ئەگەر هەندێکیشیان بەهۆی لاوازی خۆیانەوە لەرزەیان پێکەوتبێت، هەرگیز نەبینراوە کە بەتەواوەتی بکەون بە لادا. بەتایبەت ئەگەر ژیانی خۆیان وابەستەی هەستی ژیاندن و ژیاندنەوە کردبێت...

ئیماندار چەند هەوڵ بۆ ژیان و ژیاندن بدات، ئەوەندە دەتوانێت بەپێوە بوەستێت و لە ڕووخان ڕزگاری ببێت. ئەمە هەمیشە بەم جۆرە بووە، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە بریتییە لە عادەتێکی خوایی و یەکێکە لە پێویستییەکانی مەشیئەتی هەمەکی خوایی و، کەسیش نەیتوانیوە و ناتوانێت گۆڕانکاری لەم یاسا خواییەدا بکات. ئەوەندە هەیە هەمیشە لەبەرامبەر ئەمانەدا کە ویستوویانە ژیانیان بەم ئاڕاستەیدا بەسەربەرن، کۆمەڵێك دوژمنی زۆر هەبوون کە ڕق و قینیان کوڵی سەندووە و،

ویستوویانە لەناویان بەرن و، هەر ڕۆژە و بە پیلان و هەڕەشەیەکی جیاواز سەری ڕێیان پێگرتوون. بەڵام هەمیشە ئیماندارانی ڕاستەقینە لەبەرامبەر ئەم گیروگرفتانەوە ئەوەندەی تر دەمەزەرد بوونەتەوە و، بەتەواوەتی بوون بە چەند بوونەوەرێکی ئاخیرەتی و، شێوەی ڕەببانییان وەرگرتووە. بە هەستی ڕازیبوونیان بە قەدەری خوا موسیبەتەکانیان گۆڕیوە بە ڕەحمەت و، لێزمەی بەڵاکانیان کردووە بە وێستگەی پاکبوونەوە و، هەردەم وەك خۆیان بیریانکردووەتەوە و وەك خۆیان ڕەفتاریان کردووە.

لەم ڕووەوە ئەو شتەی کە دەکەوێتە سەر شانی ئێمە وەك موسڵمانان ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ بەهاکانی خۆمان و، سووربین لەسەر ئەوەی کە وەك خۆمان بمێنینەوە و، چەند لە توانایشماندا بێت لە سەرچاوەکانی خۆمانەوە خۆمان پەروەردە بکەین. دینی ئیسلام سەرچاوەکەی قورئان و سوننەتە و لە سنگی ئەم دوانەوە هەڵقوڵاوە. هەتا ئەوکاتەی موسڵمانان لە دڵەوە وابەستەی ئەم ڕێسا خواییە بوون و، پیادەیان کردووە و، لە ژیانیاندا ڕەنگی داوەتەوە، پێگەی خۆیان وەك میللەتێکی ئیرەییپێبراو پاراستووە و هەمیشە نمونە بوون بۆ خەڵکی. بەپێچەوانەوە لەو کاتانەیشدا کە لە بەهاکانی خۆیان دوورکەوتوونەتەوە و، لاسایی خەڵکانی نامۆیان کردووەتەوە و، بوون بە دیلی هەوا و ئارەزووەکانیان، لەم چاڵی سەرشۆڕی کەوتوونەتە دانەیەکی تر و شەرمەزاترین حاڵەتیان بەخۆیانەوە دیوە.

لەم ڕووە پێویستە هیچ موسوڵمانێك لە هەر حاڵ و بارێکدا هەرگیز بەهاکانی خۆی فەرامۆش نەکات و، سوودەوەرگرتن لە سەرچاوەی بێگانە ببەستێت بە ڤیزەی یاسا و ڕێسا بنەڕەتییەکانی خۆیەوە و، هەموو شتێکی هاوردە بەم پاڵێوگەیەدا تێبپەڕێنێت. کەس بە هەڵە تێنەگات،

ئیسلام رێگریی موسڵمانان ناکات لە فێربوونی فیزیا و، کیمیا و، بیرکاری و، گەردوونناسی و، پزیشکی و، ئەندازیاری و، بەڕێوەبردن و کشتوکاڵ و زانستەکانی تری هاوشێوەیان... بەڵکو بەپێچەوانەوە هانیان دەدات تا لەم بوارانەدا پسپۆڕی بەدەستبهێنن و، ئامۆژگارییان دەکات کە لە هەرکەسێك و هەر سەرچاوەیەکەوە بێت وەربگیرێن و، هەڵبسەنگێنرێن و، سوودیان لێوەربگیرێت. ئەوەندە هەیە ئەو لە هیچ بوارێکدا پشتبەستنی بەردەوام بە کەسانی تر بە شتێکی جوان دانانێت و، هانی موسڵمانان دەدات کە هەرچییەکیان کردووە خۆیان پێداویستییەکانی خۆیان بەرهەم بهێنن و، کۆتایی بە سواڵکردن بهێنن و، هەروەك لە فەرمانە تەشریعییەکاندا سەربەخۆن، بەهەمان جۆر لە بوارە تەکوینییەکانیشدا دونیای تایبەتی خۆیان دابمەزرێنن.

باوباپیرانی ئێمە لە سەردەمە زێڕینەکانماندا ڕۆژانە چەندجارێك ئەوەیان بیردەکەوتەوە کە جێنشینی خواوەندن لەسەر زەوی و، لە هەموو کاروبارێکی دونیا و دوارۆژیاندا بەبەردەوامی بەدوای ویست و ڕەزامەندیی ئەودا دەگەڕان و، زوو زوو بارودۆخی خۆیان لە ڕوانگەی فەرمانە تەشریعییەکانەوە هەڵدەسەنگاند و، ئاستی پەیوەندیی خۆیان بە خواوە دەپێوا و، هاوڕێ لەگەڵ عەشقێکی جددی بۆ حەقیقەت و لێکۆڵینەوە سەرقاڵی بناغە تەکوینییەکان دەبوون و، تێدەکۆشان بوون و ڕووداوەکانی بەباشی بخوێننەوە و، هەموو ئەو شتانەی کە دەیانخوێندەوە و، فێردەبوون و، دەیانبیست و، تێیدەگەیشتن، بە ئاڕاستەی گونجان و تەبایی لەگەڵ خێزان و کۆمەڵگا و سەرجەمی گەردوون کەڵکیان لێوەردەگرت و، لە زانستەوە بۆ عیرفان دەڕۆشتن و، لە مەعریفەتەوە

بەرەو خۆشەویستی لە شەقەی باڵیان دەدا و، هەر تەن و، هەر ڕووداو و، هەر پەیامێك کە لای خواوە هاتبێت، بە ئامرازێکی بەرزکەرەوەیان دەزانی بۆ لای ئەو و، دەیانزانی چۆن لە کاروباری دونیا و دوارۆژیشدا لە پێشی پێشەوەبن.

ئەوان گەیشتن بە ئاسۆیەکی بەرزی لەم شێوەیە، چونکە ئیسلامیان وەك "گشت"ێك قبووڵکردبوو و، لە خۆیان و دەوروبەریاندا پیادەیان دەکرد و، لە دڵەوە خۆشیاندەویست و خۆشویستراویان دەکرد و، ژیانی موسڵمانانەیان بە ئامانجی ژیانیان دەزانی. کاتێك ڕۆحی بزاوتنێکی لەم جۆرە لە دڵیاندا جێگیربووە، ئیدی هاوسەنگیی نێوان دونیا و عوقبا بەشێوەیەکی سروشتی سازبووە و، ئەوانی کردووە بە کۆمەڵگایەکی هاوسەنگ. ئەم حاڵەتە دەرفەتی گوزارشت کردن لە خۆیانی لە هەموو جێگایەك و سەرجەم بوارەکانی ژیاندا بە ئەوان دابوو. لە سایەی ئەمەدا -لە چوارچێوەی پەیوەستیییاندا بە دینەمۆ خۆماڵییەکانەوە- نوێدەبوونەوە و، دەگۆڕان و، بەدوای گۆڕانکاریدا دەگەڕان و، هەمیشە قووڵدەبوونەوە و، بە ئیمان و بزاوتنیان لەسەر ئاستی جوگرافیایەکی پان و بەرین مامۆستای وانەی شارستانێتیی سەرجەم مرۆڤایەتی بوون. لە هەستان و دانیشتن و، ئاخاوتن و بێدەنگبوونی ئەواندا هەمیشە خوا نمایان بوو، چەشنی ئامێرێکی مۆسیقا لە هەموو حاڵەت و ڕەفتارێکیاندا ئەویان دەهێنایە سەر زار و، دەلالێتیی ئەویان دەکرد. بەم قووڵی و عیرفانەیان وەك بلێی کۆمەڵەی صەحابییەکان بوون و، وەك نوێنەرانی زۆرێك لەو خەسڵەتانە وابوون کە تایبەتمەندبوون بە بینین و هاوەڵێتیی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

ئەم مرۆڤە ڕووناکانە کاتێك جاروبار دەچوونە پەیوەندییەوە لەگەڵ خوادا یان بیریان لە عاقیبەتی خۆیان دەکردەوە، خۆیان لە دەریای قووڵی مەعریفەت دەهاویشت و، لە ترساندا هەڵدەلەرزین و، چاویان بە هەموو شتێکی خۆیاندا دەخشاندەوە و، دیسان تەرازووی دڵیان هاوسەنگ دەکرد و، هەمیشە وەك ئەوەی چیایەك لەسەر شانیان بێت هەستیان بە قورسایی بەرپرسیارێتییەکانیان دەکرد و، وەك بڵێی نەفس و جەستەیان بەجارێ دەتوایەوە و، سەرتاپا دەبوون بە بوونەوەرێکی ڕۆحانی. بەتایبەت ئەگەر سەدای قورئان و ڕاستییە قورئانییەکان بڕژایەتە دڵیانەوە، ئیدی لە هەریەکێك لەو دڵانەدا کە وەك "ماڵی خودا" وابوون، هیچ تێبینییەکی بێگانە نەدەما و، تەنها بیر لە ئەو دەکرایەوە و، ئەو دەبیسترا و، ڕۆژان لەگەڵ ئەودا هەڵدەهاتن و لەگەڵ ئەودا ئاوادەبوون.

لەڕاستیدا مەحاڵە دڵێکی ئیماندار لەیەك کاتدا ئیسلام و باوەڕ و جیهانبینییەکانی دیکەی تێدا جێ ببێتەوە. هەرکە ئیسلام چووە دڵێکەوە سەرجەم بۆچوونە هەڵە و قبووڵکراوەکان ڕیشەکەن دەکات و فڕێیان دەدات و، عیبادەت ڕەنگی خۆی لە گشت لایەکی دەدات و، شعووری ئیحسان وەك قەڵغانێك دەیخاتە ژێر پارێزگاریی خۆیەوە و، لەوێدا تەنها ئەو شنەبایانە دەمێننەوە کە لای ئەوەوە هاتوون.

لەسایەی پەیوەندییەکی لەم جۆرە -کە لەسەر ئیمان و ئیسلام ڕاگیربووە- لەگەڵ خوادا، لە بیر و ڕەفتارەکانی مرۆڤدا ڕاستڕەوییەکی بەهەڵەدانەچوو و، دڵسۆزییەکی بەردەوام و، هەستی هاریکارییەکی هەمیشەیی و، هەوڵی یارمەتیدانی یەکتر لە دڵەوە و، ڕەوشتێکی ئاخیرەتییانە بەدیاردەکەوێت. ئیمانێك کە تا ئەم ئەندازەیە ڕۆچووبێت

بە جیهانی ناوەوەی مرۆڤدا، لە هەموو حاڵەتێکی ئیماندارردا خۆی نمایان دەکات و، لە فەرمانبەری و، بازرگانی و، مامەڵەی بازاڕ و فرۆشتن و، لە گشت چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانیدا، هەڵسوکەوتەکانی دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و، شێوە و مەعنای خۆی لە ڕۆحی ئەودا هەڵدەکۆڵێت و، بەتێپەڕبوونی کات ئەم وێنەیە وەکو هۆنراوەیەکی مەعنەوی لێدێت کە لە ڕوخساری ڕەفتارەکانی ئەودا دەخوێنرێتەوە و، پێدەچێت ناوەرۆکی وتەی "کاتێك دەبینرێت، خوا دەخاتەوە یادی خەڵك." [1] لە ئیماندارێکی لەم جۆرەدا هاتبێتەدی...

بەڕای ئێمە مانای ڕاستەقینەی ئیمان و ئیسلام ئەمەیە و، "دین"یش ناونیشانی کۆی ئەو یاسا و ڕێسایانەیە کە خوا دایناوە و، دینداریش بریتییە لە ناوی ئەو حاڵەتەی کاتێك ئەم ڕاستییە مەزنە دەبێت بە گیانی ژیان. سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ جوانترین وتە کە "شایەتمان"ە و، ئەنجام و کۆتاییەکەشی هەتا بینینی خوای گەورە درێژدەبێتەوە. هەرکەسێك لەم چوارچێوەیەدا قبووڵی بکات و جێبەجێی بکات -خوا ئاگادارترە بە دڵیان- لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە بە ئیماندار و موسڵمان و دیندار دادەنرێت و، ناوبردنیان بە هەر ناونیشانێکی تر بێڕێزییە بەرامبەریان.

لە زانستی دەستەواژەناسیی (Terminology) ئیسلامیدا دەستەواژەکانی وەك "ئیسلام" و، "موسڵمان" و "دیندار" هەن، بەڵام دەستەواژەگەلێکی وەك "ئیسلامچی" یان "دینچی" بوونیان نییە کە بێگانەکان بە ئەنقەست ترنجاندوویانەتە نێو زمانمانەوە و نەزانەکانیش بەکاریدەهێنن. ئەگەر لە دین یان لە جیهانبینییەکانی دیکەدا کە لە شێوەی

---

١. بڕوانە: إبن ماجة، زهد ٤.

دیندان ئەم جۆرە دەربڕینانەش بوونیان هەبێت، هەرگیز هەتا ئەم ڕۆژگارە لە دینی ئێمەدا ڕێ لە بۆچوونی وا هەڵنەکەوتووە و لە داهاتوویشدا هەڵناکەوێت. بەگوێرەی دین، ئەو موسڵمانەی کە هەڵە یاخود تاوان دەکات گوناهبارە، بەڵام دیسانیش ئیماندارە. کەسێکی لەم شێوەیە ئەگەر هەندێك لە پایەکانی ئیسلامیش تەرك بکات -بەو مەرجەی ئینکاریی بوونی پایەکان نەکات- دیسان بە موسڵمان دادەنرێت. لەم ڕووەوە، هەروەك ناونانی کەسێك کە بیەوێت بەتەواوەتی و ڕێکوپێکی دینی خۆی بژی بە "ئیسلامچی" یان "دینچی" چەند نابەجێیە، بەهەمان جۆر ناونانی ئەو کەسانەش کە هەندێك لە فەرمانەکانی ئیسلام جێبەجێ ناکەن یاخود ناتوانن جێبەجێی بکەن بە "کافر" و "گومڕا" و "فاسق"، بەئەندازەی ئەوە بێڕێزییە. بەڕای من پێویستە هەموو کەسێك پاکوخاوێنی زمانی خۆی بپارێزێت و، وەك مرۆڤ بیربکاتەوە و، وەك مرۆڤ بدوێت و ڕێزی هەموو کەسێك بگرێت.

بەرەو

دونیاکەمان

محمد فەتحوڵڵا گولەن

لەبەرامبەر ئەوەدا کە کەسانێك بابەتەکانی وەك ماف و دادپەروەری و یەکسانییان وەك ئامرازێك بەکارهێناوە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێك ئامانجی دیاریکراو یان چەشنی هۆکارگەلێك لێیان ڕوانیوە بە ئامانجی بەدیهێنانی جیهانبینییەکی دیاریکراو، ئیسلام لە خاڵی یەکتربڕی نێوان بەختەوەریی خەڵك و ڕەزامەندیی خوای گەورەدا مامەڵەی لەگەڵ ئەم بەها جیهانییانە کردووە و، پێکەوە داواکارییەکانی بەدیهێنەر و بەدیهێنراوانی هێناوەتەدی. ئەو داوای هەمان ئەم تێگەیشتن و جیهانبینییەش لە موسڵمانان دەکات. لەم ڕووە ئەگەر موسڵمانانی ئەم ڕۆژگارە لە ئاستی هەستیاریی ئەم بابەتەدابن و، کاتێك بە زار "ماف" و "دادپەروەری" و "یەکسانی" دەڵێن، ئەم بەها باڵایانە نەکەن بە ئامرازێك بۆ داخوازییە جەستەیی و نەفسییەکانیان و، ڕەزامەندیی خوایی بکەن بە ئامانجیان، ئەوا ئەگەر ئەمڕۆش نەبێت بێگومان سبەی، دەگەن بە پێگەیەك کە هەموو کەسێك ئێرەییان پێببات.

9 649750 000659
Kendi Dünyamıza Doğru

نرخی ٣٠٠٠ دینارە

İRFAN